ﺑﻪﺧﺘﯿﺎﺭ ﻋﻪﻟﯽ



# لە دیارەوە بۆ نادیار

دەربارەی میتۆد ـ بونیاد ـ زمان

بەرگی دووەم

پرۆژەی کۆکردنەوەی کۆی بەرهەمە تیورییەکان

پرۆژەی کۆکردنەوەی کۆی بەرهەمە تیۆرییەکان
«بەرگی دووەم»

# لە دیارەوە بۆ نادیار
# دەربارەی میتۆد ـ بونیاد ـ زمان

بەختیار عەلی

2011

**ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

**ناو: لە دیارەوە بۆ نادیار / دەربارەی میتۆد ـ بونیاد ـ زمان**

**«پرۆژەی کۆکردنەوەی کۆی بەرهەمە تیۆرییەکان ـ بەرگی دووەم»**

**نوسەر: بەختیار عەلی**

**بەرگ: ئارام عەلی**

**چاپ : یەکەم**

**چاپخانەی : کارۆ**

**تیراژ : 2500**

**پەخش و بڵاوکردنەوە: کتێبخانەی ئەندێشە**

**ژمارەی سپاردن: 2010**

**نرخ: 7000**



*www.bachtyar-ali.com*

## 1. سەرەتا ـ گوناهەکانی تازەگەریی

تازەگەریی لەیەکەم جاردا هەمیشە وەکو وڕینە، وەکو جۆرێک لەلادان و خیانەت سەیردەکرێت. کۆنەکان بۆ خۆپاراستن لە جیلوە و درەوشەی بە بێمانا، ئالۆز، ناوەخت باسیدەکەن، هەندێ جاریش بە خواستراو و بەدخواستی تێدەگەن.

ئەگەر لەڕوانگەیەکەوە سەیربکەین، دەشێت هەموو ئەو سیفەتانە کەم و زۆر دروستبن. ئەگەر تازەگەریی دەرچوون بێت لەو مانایانەی ئەدیب و ڕێبازە ئەدەبییەکانی پێش ئێستا بونیادیان ناوە، ئەوا دەشێت لە هەڵسەنگاندنی ڕوکەشدا بێمانا بێت. هەموو دڵنیاین تازەکردنەوە ڕزگاربوونە لەمانای دێرینی دیاردەکان و تێگەیشتنی پێشووی دەرکەوتەکان، دەربازبوونە لەو سیستمانەی چەندەها ساڵە بە ئایدیۆلۆژیا، بە بەرهەمهێنانی سەروسیمای ئەکادیمیستە بەڕێزەکان، بەدروستکردنی عەشرەت و فاتیکانی ئەدەبی، بەبەرزکردنەوەی پایەی پەتریارک و حاخام و میهراجاکانی ئەدەب، پەرژینی بونیادی خۆی قایم دەکات. بێگومان مانایەک نابێت لە هەموو ئەو مانایانە بچێت کە لە سەر بەیاز و دەفتەری ئایدیۆلۆژیای ئەواندا هەیە.

سەلەفییەت چییە؟ جگە لەوەی جۆرێکە لە دیکتاتۆریەتی مانا، وە هەر مانایەک لە ڕکێفی لێکدانەوە و خوێندنەوەکانی ئەو بونیادە دەرچێت، دەبێتە جۆرێک لە بێمانایی. لێرەوە شکاندنی مانا و هەیبەتی مانا، لەڕاستیدا شکاندنی هەیبەتی قۆناغێکە بەهەموو پادشا ئەدەبییەکانیەوە، بەڵام بێگومان ئەو شکاندنە لەقازانجی مانادایە، چونکە کرانەوەی دەرگایە بۆ مانا، واتەڕزگاربوون لەمانا، ڕزگارکردنی مانایە.

جگە لەگوناهی بێمانایی، گوناهی ئالۆزیش گوناهێکی ڕاستەقینەیە. هەموو

تازەگەرەکان ئاڵۆزن. تازەگەریی سەرەتای جیهانبینییەکی نوێیە، لادانە لە مانا، بەڵام لەهەمان کاتدا تەقاندنەوەی بەردەوامی مانایە. تەنیا یەک بەلاوەنانی تاقانە و یەکجارانە نییە، بەڵکو زنجیرەیەک بەلاوەنانی بەردەوامە. تازەگەر لە خیانەتێکی بەردەوامدایە لە ماناکانی پێش خۆی و پێشووی خۆی بۆ مانای نوێ. یاخود ڕاستتر وایە بڵێین ڕیشەی ئاڵۆزی تازەگەریی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەقامگیرنەبوونە ئەبەدییەی تازەگەریی لە دونیای ماناکاندا.

دروشمی تازەگەریی ئەوەیە، نە ماناکانی کۆن، نە ماناکانی ئێستا، نە ماناکانی داهاتوو، بەڵکو گەڕانی هەتاهەتایی بۆ مانای دیکە، زمانی دیکە، پەیوەندی دیکە. بەرەو وێنەی نوێ، عەقڵانییەتی نوێ، خەیاڵی نوێ، ئەفسانەی نوێ... نوێ بەمانای نوقمبوونی نوسەر لە ئەزموونی داهێنەرانەی گەڕان و پشکنینی خۆیدا وە گواستنەوەی ئەو هەست و نیگا تازانە کە ئەو چرکەیە دەیبەخشێت، بەبێ گۆڕینی ئەو ئەزموونە بۆ ئەزموونێکی موتڵەق. واتە گرتنی ڕاستییەکی ساتەوەختانەیە لەڕێگای ئەزموونێکی تایبەتییەوە «کە هەرگیز دووبارەنابێتەوە» وەبەردانی.

لە ستراتیژی تازەگەرییدا ڕاستی موتڵەق بوونی نییە. بۆیە هەر ئەزموونێک کە ڕاستییەک، لەزەتێک، مانایەک دەبەخشێت، دواجار دەبێت دەستبەرداری ببین بۆ ڕاستی و لەزەت و مانای دی. پەرستنی ڕێژەداریی «نیسبیەت» مانا، پەرستنی ڕێژەداریی زمان، پەرستنی ڕێژەداریی حەقیقەت ئەوەیە وا لەتازەگەریی دەکات بە وڕینەکارێک بچێت کە لە ناو فەزای زمان و مانا و حەقیقەتدا وڕینەدەکات. بەڵام لکاندنی سیفەتی وڕینە بەو پرۆسێسەوە تەمەن کورتە، چونکە ئەو جۆرە وڕینەکردنە مافێکی ڕەوایە. «ڕۆلان بارت» دەڵێت «ئەدەب لە لوتریامۆنەوە مافی وڕینەکردنی بەدەستهێناوە» «رولاند بارت: النقد البنيوى للحكاية. وەرگێرانی: انطوان ابو زيد. منشورات عويدات. بيروت – پاریس. چاپی 1988. ل. 74». وە وڕێنەکانی تازەگەرییش بێگومان وڕینەی نەخۆشێک نییە لەسەر پێخەفی ئازار و نەخۆشی، بۆیە پاش ماوەیەک بەتەواوی

لەوە دەردەچێت ناوی وڕێنەی لێبنرێت، چونکە وەکو «بارت» دەڵێت «دەشێت وڕێنەکانی ئەمڕۆ، حەقیقەتەکانی سبەینێ بن». «هـ.س.پ. ل74».

شایانی باسە، بەدەستهێنانی ئەو مافە هێندە ئاسان نییە، تازەگەریی لە ستراتیژی پڕوپاگەندەی سەلەفییەتدا «وڕێنە»یە، لەبەرگری ئەکادیمیستە لە خۆبایی و بێخەیاڵ ق بێفیکرەکاندا لەخۆیان وڕینەیە... بەڵام بەوەدا کە تازەگەریی لە جەوهەریدا حاڵەتێکی گرنگتر و بایەخدارترە، بۆیە زۆرجار بەربەست لەپێشدەمیدا دادەنرێت و ڕێگا نادرێت بچێتە ئەودیو شورای کەلاوە مەعریفییەکان، بۆی نابێت لە لابۆری کیمیاگەرانی سەلەفییەتدا ئەسیدی خۆی بەسەر چڵ و چێوەکاندا بکات. بۆیە دەقێک کە تەنیا وڕینەیە ناتوانێت تازەگەر بێت، بەڵام ئەو حاڵە لە ئاڵۆزی تازەگەریی کارێکدەکات سوپایەک لە وڕینەکەران تەفرەبدات وڕینەی خۆیان لەناو تازەگەریدا و بە ناوی تازەگەرییەوە بنوسنەوە، بەڕادەیەک زۆرجار لەبری سەری تازەگەران، سەری وڕینەبازانیش دەشکێت، یان لە بری ستایشی تازەگەران ستایشی وڕینەبازانیش دەکرێت. بۆیە دەڵێین سەندنی مافی تازەگەریی لەعەقڵییەتی ئەدەبی پێشوو، عەقڵییەتی کۆنخواز و باڵادەستی ناو سیاسەت و مۆراڵ و کولتوور کارێکی سادە نییە، بەڵکو دەشێت زۆرجار ئەستەم بێت.

هەموو ساتێک لەمێژوودا ساتی سەرهەڵدانی نوێگەریی و پێشڕەوایەتی ئەدەبی نییە، بەڵکو دەرکەوتی بەریانە نوێخوازەکان مەرجی خۆی هەیە. «ڕۆلان بارت» دەربارەی ئەو مەرجانە دەڵێت «بۆئەوەی بزوتنەوەیەکی پێشڕەوانە هەبێت، دەبێت کۆمەڵگا دوو مەرجی مێژوویی ئامادەبکات: یەکەم هونەرێکی باڵادەست کە سروشتێکی موحافەزاتکارانەی هەبێت، دووەم سیستمێک بەبونیادێکی لیبرالیانەوە» «هـ.س.پ. ل. 74 – 75».

بارت پڕۆژەی پێشڕەوایەتی بەپڕۆژەیەک لەقەڵەمدەدات پابەند بەکۆمەڵێک

مەرجی دەرەکییەوە، کەواتە دەشێت لەهەموو ساتێکدا هەر بە حوکمی ئەو پەیوەستبوونە بە مەرجی دەرەکییەوە پێشبینی مردن و خەفەبوونی بکەین... بەڵام تێکشکاندنەکانی داهاتوو ئەو سیفەتەی تازەگەریی ناشارێتەوە کە لە چرکەی سەرهەڵدانیدا حاڵەتێکی کوتوپڕ و پەلامارێکی ناوەخت بووە، شتێکە چاوەڕوان نەکراو لە لایەن سیستمەوە.

سیفەتی «ناوەخت» سیفەتێکی ئەزەلی نوێخوازییە، جا لە هەر ساتێکی ئەبستمی و لە هەر وێستگەیەکی مەعریفیدا بێت، چونکە دابڕانە لەتەک قۆناغە ئەدەبی و بۆچوونە ئەدەبییەکانی دیکەدا، یان وەکو گووتمان تێکشکاندنی مانایەکە کە ئەکادیمیستە حوجرەنشینەکان و پیاو ماقووڵانی سەردەمانی ڕابووردو بونیادیان ناوە. «ناوەخت» دیاردەیەکە کە کۆی سیستەمی ئەدەبی و بونیادی عەقلانی ئەو ساتەوەختە، خۆیان بۆ ئامادەنەکردووە، نەوەک هەر ئەوەندە، بەڵکو هەرگیز ناتوانن خۆشیانی بۆ ئامادەبکەن. چونکە تازەگەریی لەدەرەوەی ئەو سیستم و بونیادە عەقلانییەتەوە ئیشدەکات و سەرقاڵی سیستم و بونیادی عەقلانییەتی خۆیەتی.

جارێکی دی دەڵێین هەموو ئەو گوناهانەی دەدرێنە پاڵ تازەگەریی و دەخرێنە ئەستۆی ڕۆحی تازەگەر لەڕوانگەیەکی تایبەتییەوە ڕاستە. تازەگەریی یاخود بوونی نابێت یاخود کە بوو ئەوا کۆی ئەو گوناهانە دەبێت کە دەدرێنە پاڵی. تازەگەرییەک نییە بێ گوناهی گەورە و گەورەییەکیش نییە بۆ تازەگەریی لە دەرەوەی گەورەیی گوناهەکانی. تازەگەریی تەنیا ئەو ساتە لە قەفەز دەچێتە دەرەوە کە هەموو گوناهەکانی خۆی بسەلمێنرێت. تازەگەریی خاوێن و بێگوناه بوونی نییە، بەڵکو تازەگەریی دەبێت هەمیشە جۆرێک بێت لە تاوان دەرهەق بەو مانا سست و ڕزیوانەی عەقڵییەتی سەلەفی ڕۆژانە بەرهەمیاندەهێنێت.

بەو پێیە لەنێوان پانتاییە حەرامەکانی ناو ئاکاری کۆمەڵایەتی و تازەگەرییدا پەیوەندیەکی پتەو هەیە، لەئاکاری کۆمەڵایەتیدا قەدەغە و

حەرام دوو ڕووبەری گەورەن کە نابێت بەرەفتار لێیان نزیکببینەوە، لە ژیانی ڕۆشنبیریماندا کۆمەڵێک پانتایی گەورە دەژین کە فڕێدراونەتە ئەودیو سنووری بیرکردنەوەوە. بەتاڵی کایە مەعریفییەکان کەلاوەیەکی ئەستیمی دروستکردووە، عەقڵی دۆگماپەرستی حوجرە ڕۆشنبیرییەکانمان، سەدەها ساڵە بە گوناهی زەندیقی لە چەندەها پانتایی گەورەی عەقڵ دایانبڕیوین و لەو شوێنانەدا کە فیکر دەبایە هەناسەبدات «حوجرەچییە» هاوچەرخەکان بە دروشمی پاراستنی کەلەپوور، بە گوناهی بۆرژوایی بوون، دیوارێکیان لەنێوان عەقڵیەتی ڕۆشنبیری ئێمە و مێژوو و فەلسەفە و بزوتنەوە فیکری و میتۆدە زانستییەکەدا بەرزکردۆتەوە. بۆیە بەحەسرەتەوە دەڵێم، ئەگەر چێوەکانی ڕۆشنبیریی ئێمە کەلاوەیەکی ئەبستیمی بێت، ئەوا ناوەوەی بازنەکە حوجرەیەکی جادانۆفییە. لەبەرئەوە نەدەتوانین لەناو ئەو خەراباتە مەعریفییە و نە لەناو حوجرە جادانۆفییەکە دا هەناسەبدەین. لێرەوە تازەگەریی ناچارە بچێتە ناو ئەو پانتاییانەوە کە تا ئێستا قەدەغەبوون. ستراتیژیەتی قەدەغەکردن ئەوەیە بیرکردنەوە لە هەندێک سنووردا ڕابگرێت، بەڵام ئێشی تازەگەریی ئەوەیە بچێتە ناو ئەو سنوورانەوە. لەم ناوەندەشەوە دەچێتە سەر ئەو پرسیارە گرنگە دەربارەی شوێنی تازەگەریی لەنێوان «دیار» و «نادیار»دا. «دیار» بەمانای هەموو ئەو پانتاییە دۆزراوانەی سەلەفییەت خۆی پێ شورابەنددەکات، «نادیار» یش بەمانای هەموو ئەو ڕووبەرە ونانەی کە پرۆژەی تازەگەرییە لەناویدا کاربکات.

## 2. دیار / نادیار «کۆمیدیای سەلەفییەت ـ تراژیدیای تازەگەریی»

«دیار» کۆی ئەو سیستمە ئاشکرا و پەیوەندییە دەستنیشانکراوانەیە کە لە پێشچاو لاناچن، وشکەهەڵاتنی زەمەنە لە زیندانی ساتەوەختە نەگۆڕەکانی خۆیدا، تیرۆری شتە ئاشکراکانە بۆ سەر شتە نادیارەکان، تیرۆری گووتراوەکانە بۆ سەر شتە نەگووتراوەکان، تیرۆری ئەوەیە

لەدایکبووە دژ بەوەی هێشتا نەهاتۆتە دونیاوە. ئەگەر بشێت مەجازێک لە «فرۆید» وەربگرین، دەشێت «دیار» بەو ڕووبەرەی هەست بشوبهێنین کە پەردە لەسەر پانتاییە گەورەکانی دیکەی دەروون «نەست» دادەداتەوە. بەکورتی «دیار» دەسەڵاتی هەموو ئەو شتانەیە کە زانراون دژ بە هەموو ئەو کایە ئەبستیمۆلۆژی و سنوورە زانستیانەی دەکەونە هەرێمی «نەزانراو»ـەوە، واتە زانراوێکە نەزانراوەکان لەبیردەکات و ئیخفالی عەقڵ دەکات. دونیای ئەبستمۆلۆژی «دیار» دونیایەکی هێمنە، نەفی توندوتیژیی تێدا نییە. سەرەڕای زۆر ژاوەژاوی دەستکرد و دروستکراو لەجەوهەریدا و لەقووڵایی گۆمەکەدا ئاشتییەکی سەرسوڕهێن لەنێوان دوژمنە ڕووکەشەکاندا هەیە، لەدواجاریشدا دەرەنجامی تێکدەری تێدا نییە بۆ کۆی بونیادەکە.

دیار جۆرێکە لە عەقڵییەت کە لە ڕێگایەوە وتراوەکان دەڵێن ئەوان تەنیا وتە و تەنیا شێوەی وتنن. «ئەزموونەکان» دەڵێن ڕێگای تەعبیرن لە جەوهەری ئەزموون و تەنیا زمانی ڕەنگدانەوەی تێڕامانی مرۆڤن و تەنیا شێوەی خۆبەیانکردنی سیفەتە راست و ئەزەلییەکانن. واتە ئەو پانتاییەیە کە مێژووی وتن تیایدا لەناو وتنی ئێستادا دەوەستێت و دەیەوێت تێپنەپەڕێنێت.

«دیار» لەبنەڕەتدا جەلادی دەقە، چونکە ئەگەر «دەق» پرۆژەی چەندەها وتن بێت، کۆکەرەوەی چەندەها ئەگەری مانا بێت، یاخود بە لۆژیکی بونیادگەرە فۆرمالیستەکان، بۆشاییەک بێت پێویستی بە پڕکردنەوە هەبێت، ئەوا «دیار» تەسلیمبوونێکی ڕەهایە بە یەک مانا و بە یەک گووتار و بە یەک شیمانەی وتراو.

بەو جۆرە لە هەرێمی «دیار»دا لەبری ئەوەی دەقەکان مانا دیاریبکەن، ماناکان دەق دیاریدەکەن، فیکرەکان پێش نوسین دەکەون، دەرەنجامەکان پێش ئەزموون دەکەون. لەم حاڵەتەدا ئێمە لەبەردەم ماتماتیکێکی هەڵگەڕاوەداین، دەرەنجام پێش شیکار و پێش پرسیاریش دەکەوێت،

سەلماندن تێیدا دەکەوێتە پێش بیردۆزەوە. کۆمیدیای «سەلەفییەت» ئەوەیە خوێندنەوەی دەق پێش نوسین دەکەوێت. بۆیە هەر دەقێک کە لە ناو پانتایی «دیار»دا بژی، لەهاوڵاتییەک دەچێت بەپێی مەرجەکانی یاسا و دەستوورەکانی ئەخلاق هەڵسوکەوتبکات. کۆمیدیای «سەلەفییەت» لەوەدایە کە سەلەفی هەر چۆنێک بجووڵێت شتی زانراو دەڵێت، هەرچییەک بکات لەپەیوەندی گووتار و گووتراوی خۆی دەربازنابێت. دەقی سەلەفی لکاوە بەپانتاییە دیارەکانەوە، دەقی سەلەفی باڵندەیەک نییە خرابێتە قەفەزێکەوە، تەنانەت باڵندەیەکیش نییە لەناو قەفەزەکەیدا لەدایکبووبێت، بەڵکو باڵندەیەکە لەگەڵ قەفەزەکەیدا هاتۆتە دنیاوە، میتاڵ و مەتریاڵی جەستەی لەهەمان میتاڵ و مەتریاڵی قەفەزەکەیەتی... باڵندەیەک نییە لەناو قەفەزەکەیدا بەجۆرێک بخوێنێ و لەدەرەوەی بەجۆرێکی دی، بەڵکو لەبەرئەوەی تەنیا لەناو «دیار»دا دەسوڕێتەوە، تا هەتاهەتایە یەک تۆن دەخوێنێت و دەخوێنێتەوە. لەبەرئەوە سەیر نییە لە ئێستادا زۆربەی خوێنەرانی کورد لەدەست ئەوە دەناڵێنن بەرهەمی نوێ ناخوێننەوە، سەلەفییەت و دیار دوو پانتایی هەمیشە تەبان. کاتێک «دیار» لەخۆ دووپاتکردنەوە هەمیشەیی و بەردەوامەکانی خۆیدا تێکستی وەک یەک و دووبارە بەرهەمدەهێنێت، کاتێکیش کۆی ئەو تێکستە هاوشێوانە بونیادێکی یەکگرتوویان دروستکرد و پەردەیەکی ئایدیۆلۆژییان دا بەسەر خۆیاندا و گەڕاشن بەدوای بەهانەی خۆپاراستن و ژیاندنەوەی بەردەوامدا، ئا لەو ساتەوە ناوی «سەلەفییەت» هەڵدەگرن و بە نەخشەی کۆنخوازان هەنگاودەنێن. لێرەدا هەستدەکەم مەترسی گەورەی «سەلەفییەت» تەنیا لەو بونیاد و شێواز و بەریانانەدا نییە کە رابووردوە، بەڵکو گەورەترین هەڵە ئەوەیە کە وا بزانین «سەلەفییەت» لە پشتمانەوەیە، یاخود وا تێبگەین «سەلەفییەت» هێزی خۆی تەنیا لە رابووردووەوە وەردەگرێت، بەڵکو یەکێکی تر لە گاڵتەجارییەکانی «سەلەفییەت» ئەوەیە کە هەردەم پێشمان لێدەگرێت. سەلەفییەتە بەسەرچووەکان دەمرن، چەند دەستەڵاتیان بەسەر ئەم ساتەوەختەدا تووندبێت، هەر دەمرن، بەڵام مەترسی لەهەڵگەڕانەوەی تازەگەریی ئەم

ساتەوەختەدایە بۆ «سەلەفییەت»، گەورەترین کارەساتی ئەدەبی لە ژیانی ئێمەدا وەکو میللەتێک لەو ساتەدایە کە بزووتنەوەی «ڕوانگە» لە پرۆژەیەکی تازەگەرییەوە بە تووندترین شێوە هەڵگەڕایەوە و بووە سیستمێکی سەلەفییانە، وە سالآنی ئەو کۆدیتایەش «هەشتاکان بە گشتی» بەدترین و تاریکترین سالآنی تەمەنی ئەدەبیمان بوو، کۆدیتایەک کە دەشێت لە وێستگەیەکدا چارەنوسی هەموو تازەگەریی و تازەگەرانێک بێت کە بەجۆرێکی حەتمی ڕووبەڕووی قەیرانی «وەستان» و «بەردەوامی» دەبنەوە.

ئەگەر هەندێک لەسیما سەرەکییەکانی «سەلەفییەت» ئەوەبێت کە:

1. «سەلەفییەت» لەناو سنوورێکی دەستنیشانکراودا دەسووڕێتەوە، کە سنووری زانراوەکانە. 2. نەدەستکاریکردنێکی ڕادیکاڵی بونیادەکانی لە خۆی گرتوە، نەهیچ نەفییەک «نەرێکردنێکی» مێژوویی گەورە ئەنجامدەدات. 3. سنووری هەموو کایە ئەبستیمی و ئەدەبییەکان بەتوندی شورابەنددەکات و دیواری نێوان بوارەکانی داهێنان ئەستووردەکات و لە پشت تیوری توخمە ئەدەبییە ئەبەدی و نەگۆڕەکانەوە سەنگەر دادەنێت، ئەم حاڵەتەش لەبواری ڕۆشنبیریی کوردیدا یەکێکە لە چەکە نهێنی و کوشندەکانی عەقڵییەتی سەلەفی کوردی تا ناهێڵێت پەرەسەندن و گۆڕانکارییەکانی نێو بوارێک ئاسان بۆ شوێنەکانی دیکە تەشەنەبکات. 4. هاوشانی ڕای گشتی و ئەو چەشنە ئەدەبییە دەڕوات کە دەستگا کۆمەڵایەتییەکان بەرقراریانکردووە. لێرەدا لەپشت «ئەخلاق ـ ئاین ـ سیاسەت»ـەوە پەلاماری «زانست و داهێنان» دەدات. ڕەنگە سەلەفییەتی عەرەبی یاخود هەموو بۆچوونە ئەنتی مۆدێرنیزمەکانی ڕۆژئاوا لەقووڵایی خۆیاندا، کە لەڕووی ئەخلاق و ئاین و سیاسەتەوە هێرشیان بردووە، فەلسەفەیەکی ئەخلاقی و فەلسەفەیەکی ئاینی و تیورییەکی سیاسی «فەلسەفی، سۆسیۆلۆژی، ئابوری»یان لە پشت بووبێت کە هەیبەتێکی زانستی بەخشیبێتە دوژمنانی تازەگەریی، بەڵام لە پشت ئەخلاقی سەلەفییانەی ئێمەوە فەلسەفەیەکی ئەخلاقی نییە،

هێندەی کە ئەخلاقێکی تیرۆریستی و پەترپارکی دەبینین. «ئاین» لە ساتەوەختی «مەحوی»یەوە ڕووی ڕۆحیانەی خۆی دۆڕاندوە و بۆتە پاشکۆی «ئەخلاق» و پێداویستییەکانی سیاسەت و ژیانی ماددی و سروشتێکی تەواو مادی و ناڕۆحانی وەرگرتووە. «سیاسەت»یش لە باشترین حاڵەتدا «ڕۆمانتیکییەتێکی نەتەوەگەرا» یاخود «ڕۆمانتیکییەتێکی ژادانۆڤی» بەرهەمهێناوە، کە لەڕاستیدا ڕەنگدانەوەی قەیرانی ئایدیۆلۆژیایە. 5. سەلەفییەت بەتووندی بەرهەمهێنان و پێکەوە ژیانی چەند بەریان و ڕێبازی ڕۆشنبیریی و ئەدەبی جیاواز و دژ بەیەک ڕەتدەکاتەوە و ڕوو لەخوڵقاندنی بەریان و ڕێبازی باڵادەست دەکات کە دواجار بۆچوونی ئەو بەریانانەش نزیک و تەبابێت لەگەڵ بۆچوونە کۆمەڵایەتییە باڵادەستەکاندا، بۆیە لەمێژووی ڕابووردوومان‌دا جەنگ و جەدەلی ڕۆشنبیریی گەورە نابینین کە نیشاندەرەوەی دوو جیهانبینی جیاواز بن. 6. ڕوو لەکۆتکردنی زمان و شورابەندکردنێکی تەواوی وشە دەکات، بەدیلکردنی وشە لەناو یەک مانا و واتای هەتاهەتایدا.

بێگومان «سەلەفییەت» گەلێ سیمای دیکەی هەیە، بەڵام لێرەدا تەنیا ئەو حاڵەتانە دەخەینە ڕوو کە لەبینینی تراژیدیای تازەگەرییدا یارمەتیمان دەدەن. ئەگەر «سەلەفییەت» شتە بینراوەکان ببینێ، ئەوا «تازەگەریی» دەبێت شتە نەبینراوەکان ببینێت. ئەگەر دونیا و سنوور و ڕووبەری شتە دیار و بینراوەکان ئاشکرابێت، ئەوا درامای ڕۆحی تازەگەر لەوەدایە کە ڕووبەڕووی ئەو دنیایەی پێدەخاتە ناوی بێسنوورە. بەرینی ئەو پانتاییەی لەبەردەمیدا دەوەستێت سامناکە، چونکە تازەگەر بۆئەوەی تێگەیشتنێکی نوێ و هەڵوێستێکی نوێ بێت لەجیهان، لەگۆڕینی هۆکار و کەرەستەکانی تێگەیشتنەوە دەستپێدەکات، لەزمانەوە دەیگۆڕێت، لە میتۆدەکانەوە دەیگۆڕێت، لەسەرەتا زانستییەکانەوە دەیگۆڕێت، تا دواجار سەیرکردنێکی نوێ بۆ هەموو شتەکان بەرهەمدێنێت. تازەگەریی سەر لە نوێ دەستکردنەوەیە بە ژیان، واتە دووبارە دزینەوەی هەمان ئاگری دێرینی پرۆمیسۆسە. لێرەوە قەدەری تازەگەریی ئەوەیە کە نەگاتە جێگا،

نەگاتە هیچ کۆتاییەک. بێگومان ئەوەی مەحکومبێت هەمیشە لەسەرەتادا بێت، مەحکوم بەوەی لە کۆتاییدا نەبێت، ئەوەی مەحکوم بێت هەمیشە نەمام یان تۆو بێت ناتوانێت لە شێوەی درەختێکی پیردا بژی و بمرێت. تازەگەر دووبارە هەموو شتەکان دەدۆزێتەوە، لێرەوە ناچار بەرۆح و دیدەی مرۆڤی سەرەتایی شارستانییەتی ساتەوەختی خۆی بژی، ناچارە هەمیشە بۆ دەرەوەی ئەوساتە هەنگاوبنێت، ناچارە هەمیشە بۆ دەرەوەی بونیادەکان بڕوات. بەدڵنیاییەوە دەڵێین کە گۆڕین و ئاوەژووکردنەوەی بونیادەکان لە کێشی ئەو ڕۆحە فەردانییەدا نییە کە تازەگەر پێویستێتی بۆ دارشتنی جیهانی نوێی خۆی. لێرەوە نەفیکردنی بونیادەکان تەنیا ڕووبەری پراکتیکی تازەگەرە، هەر ئەوەش قەیرانی گەورە و تراژیدیای گەورەیەتی. دەبێت تازەگەر لەهەموو بونیادەکان بچێتە دەرەوە کە پیلانی مێژوویەکی داخراو و نائایرۆسی و تۆقێنەر دروستیکردوون. دروشمی تازە گەر ئەوەیە کە بۆ دوور لە هەموو بونیادەکان بڕوات، بەڵام مەحکومەکە خۆیشی هیچ بونیادێک دروست نەکات، مەحکومە نیگای خۆشی لەناو هیچ دیمەنێکدا بۆ هەتاهەتایە نەدۆزێنێت، لەناو هیچ نموونەیەکدا نەمرێت، لە هیچ بەندەرێکدا نەوەستێت. تازەگەر مرۆڤێکە دونیایەک بەجێدەهێڵێت، ماڵاوایی لە جیهانێک دەکات بێئەوەی هیچ جیهانێکی دیکەی مسۆگەرکردبێت، بۆئەوەی هەموو جیهانەکان ببینێت، دەبێ هەموو جێ وەستانێک تەنها وەک وێستگە و بۆ کاتی دیاریکراو بەکاریانبهێنێت. «تازەگەر» کە سەرەتا بێت، هەموو ڕادیکاڵییەتی بوونی لەوەدا کۆدەبێتەوە کە بەرەو دەرەوەی ماڵە هەمیشەییەکان و وێستگە هەمیشەییەکان واتە بەرەو دەرەوەی بونیادە نەگۆڕ و جێگرەکان بڕوات. لەبەرئەوەی تازەگەرییش نابێت ببێتە سەلەفییەت و پێویستە پرۆسێسی کۆدیتایەکی هەمیشەیی و بەردەوام بێت، ناچارە لەهیچ ساتەوەختێکدا نەوەستێت، چونکە وەستان و مردن لە تازەگەریدا یەکێکە. «ڕوانگە»ش گەورەترین وانەیە لە دوامانەوە. «ڕوانگە» شۆڕشێک بوو کەوتەوە ئامێزی گەمەی سیاسەت و ئایدۆلۆژیاوە و لە جێگایەکدا وەزیفە ئەدەبییەکانی خۆی لە پێناوی وەزیفە سیاسییەکاندا جێهێشت، لە جێگایەکدا وەستا، لە

پرۆژەی نوێکردنەوەی فۆرمی شیعرەوە نەبووە پرۆژەی دەوڵەمەندکردن و نوێکردنەوە کەرەستەکان و بابەتە مەعریفییەکان، لە شۆڕشگێڕییەتی شاعیرەوە نەیگواستەوە بۆ شۆڕشگێڕێتی تیورە و تێڕامان، بووەوە بە بەشێک لە بونیاد، . بەڵام «تازەگەریی» ڕاستەقینە تراژیدیایەکە بە تراژیدیایی دەمێنێتەوە. واتە بەکورتی جیاوازیی هەرە گەورەی نێوان «سەلەفییەت» و «تازەگەریی» لەوەدایە سەلەف هەمیشە بەرەو ناو بونیادەکان هەنگاودەنێت و تازەگەر بۆ دەرەوەی هەمان ئەو بونیادانە، سەلەف پاسەوانی ڕاستەوخۆ و دڵسۆزی بونیادەکانە، تازەگەر ڕەفتارێکی ئانارشستی و نەهلستی هەیە دەرهەق بەو بونیادانە. کۆمیدیای سەلەف لەوەدایە کەزۆر دڵنیا و خاترجەم و ئاسوودە هەوای ئەو دنیایە هەڵدەمژێت کە لەناو وێرانە و خەراباتیدا دەژی. تراژیدیای تازەگەر ئەوەیە کە ڕێگای هەموو ئاوارەبوونەکان دەبینێت و هەموو نامۆبوونێک بە قووڵی و لەزەتەوە دەژی. بە کورتی ئەگەرچی هەموو غەریبێک تازەگەر نییە، بەڵام هەموو تازەگەرێک غەریبە، لە کۆتایشدا بە تەنهایی و غەریبی دەمێنێتەوە، با لە هەندێک وێستگەشدا هاودەم و هاوڕێی هەبێت.

جیاوازی نێوان مرۆڤی تازەگەر و مرۆڤی ئاسایی سەر شەقام ئەوەیە، مرۆڤی ئاسایی نامۆبوونی خۆی هەست پێ ناکات، یاخود کە هەستی پێکرد لەناو بونیادە ئاسنینەکان ناچێتە دەرەوە، ئەگەرچی دەرهەق بە هەندێک یاسای ناو ئەو بونیادە تورەبێت، بەڵام هێشتا زۆر لە مۆراڵ و ئاکاری ئەوی پێ قەبووڵە، هەوڵدەدات شوێنی خۆی لەبونیادەکاندا چاکتربکات، یان دەستکاری هەندێک بەشی بونیادەکان و هەندێک میکانیزمی ئیشکردنیان بکرێت. بەڵام مرۆڤی تازەگەر تێئاوەرەبوونی خۆی «واتە نامۆبوونی خۆی ـ اغتراب» لەناو بونیادەکاندا جێدەهێڵێت بۆ تێئاوەرەبوون لە بونیادەکان... ئەوەی خاڵی گرنگ و سەرەکییە و دەبێت هیچ کات لەیادی نەکەین، ئەوەیە هەردەم جیاوازی نێوان ئەو دوو شێوە تێئاوارەبوونەمان لەیادبێت: «تێئاوارەبوون لەناو بونیاددکان» و «تێئاوارەبوون لە بونیادەکان». لەناو بونیادەکاندا تێئاوارەبیت جیاوازە

لەوەی لە تەواوی سیستمێک ئاوارەبێت، لەوی دیکەدا کەم تا زۆر لە ئازادییەکی تراژیدیدا دەژیت. تراژیدیا هەرگیز لەتازەگەریی نابێتەوە، چونکە ئازادیی تازەگەر ئازادییەکی سەرتاسەر و کۆ نییە. لەبەرئەوە ئازادییەکی باوەڕپێکراو و دانپیانراو نییە، لێرەوە ئازادییەکەی ئازادییەکی نەفرەتلێکراوە. ئازادی دنیایەک نییە کە بۆ ئازادی هەنگاودەنێت، بەڵکو ئازادی مرۆڤێکە لەناو سیستمێکدا دەژی کە گەلێک سست بیر لەئازادی دەکاتەوە، تەنیا بوارێکی پراکتیککردنی ئەو ئازادییەش «زانست ـ داهێنان ـ زیندەگی تاکەکەس خۆیەتی». تراژیدیای تازەگەر ئەوەیە ئازادییەکەی نابێتە پرۆژەیەکی کۆمەڵایەتی، بەڵام دەشێت ببێتە یارمەتیدەری پرۆژە کۆمەڵایەتییەکان، ناکرێتە بەرنامە، بەڵام دەشێت بکرێتە ئایدیال. بێگومان ئەو گیانە سەرشارەی «ڕامبۆ» لەیەک یەک هاوڵاتیانی فەرەنسادا بەرجەستە ناکرێت، بەڵام ئازادیی ڕامبۆییانە، نموونەی ئازادییەکی بەدەستهێنراوی ئەوتۆمان نیشاندەدات، نمونەی جۆرە عەقڵ و هەستیارییەکمان نیشاندەدات کە کردنی بە بەرنامە بۆ مرۆڤانی دی ئەستەمە، بەڵام وەکو جۆرێک لە نمونەی ئازادی و ڕاچەنین بەڕووی تێئاوارەبوونی ناو بونیادەکان، وەکو هێزێکی گەورە و خەونێکی گەورە ون نابێت. هیچ پرۆژەیەک ناشێت داوابکات ژنانی ئێران هەموو ببنە «فەروغی فەروغزاد»، بەڵام نموونەی «فەروغ» وەکو ئایدیالێکی ئەستەمی ئازادی لەدەرەوەی بونیادەکاندا دەچەقێت و هەڕەشە لەهەموو جۆرە ئازادییە درۆزنەکان دەکات، ئەو حاڵەتەش لەیەک کاتدا کارەساتی شاعیر لەلایەک و کارەساتی کۆمەڵگا لەلایەکی دی نیشاندەداتەوە، لەوەدا کە ئازادیی شاعیر دەبێتە تراژیدیا و ئازادیی کۆمەڵگا دەبێتە خەون.

ئەگەر قووڵتر و وردتر بڕوانین، دەبینین تازەگەر تەنیا و ئازادیی زیندەگی خۆی لە ئازادیی و زیندەگییەکانی دیکە جیاناکاتەوە، بەڵکو ئازادیی و زیندەگی دەقەکانیش لە ئازادیی و زیندەگی جۆرە نوسینەکانی تر جیادەکاتەوە... لێرەدا ئازادیی نوسەر دەبێتە جۆرێک پراکتیکی تێکدەر لەناو دونیای دەق و فۆرم و ماناکان و جیهانبینیەکاندا، تازەگەر ڕزگاریی

خۆی لەناو ڕزگارکردنی شێوازەکانی تەعبیردا پراکتیک دەکات، بەلادانی یاسا دێرینەکانی نوسین، بەڕوخاندنی شورای نێوان توخمە ئەدەبی و هونەرییەکان، بەتێکەڵکردنی شیعر بەدونیا و دونیا بە شیعر... تێکەڵاوییەک کە دواجار دەستی شیعر ئازادبکات، دەستی وشە ئازادبکات و زمان ببێتە پنتی خوڵقاندنەوە. بۆیە ئەگەر لەسەرەتادا ئاماژەمان بۆ ئەوە کردبێت کە «سەلەفییەت» دیکتاتۆریەتی مانا بێت، لێرەدا پێویستە بڵێین «تازەگەریی» دیکتاتۆریەتی زمانە، ئازادی ڕەهای زمانە بەسەر مانا مردوەکاندا. بەبێ ڕاتەکاندنی زمان، بەبێ بازۆدانی بەرەو دەرەوەی ئەم بونیادەی ئێستا، خەیاڵ ئازاد نابێت... ئازادی تازەگەر بەئازادیی خەیاڵەوەیە، ئازادیی خەیاڵیش بەئازادبوونی زمان لە کۆتە ئەستوورەکانییەوە بەندە...

هەر عەقڵێک ڕوو لەو جەنگە بکات، بەر لەهەموو شتێک دەبێت پڕچەک بێت بەتیوریزەکردنی ئەو تخوبە فیکرییانەی لەناویدا دەکەوێتە شەڕ لەگەڵ سەلەفدا... ئەگەر هیوای تازەگەر زیندوو ڕاگرتنی هەمیشەیی دەق بێت بەدەربازکردنی لەیاسا و ڕێنمای سەرتاسەریی و ئەبەدیی، هاتنەدی ئەو هیوایە پابەندە بەتوانای تازەگەرەوە لەسەر بەگژداچوونی هورووژمە ترسناک و تاریک و خنکێنەرەکانی سەلەف، بەو مانایانەی کە ناومانبردن. ئازادیی تازەگەر لەوەدایە کە پێوانەکانی ئەخلاقی دابنێن، چونکە «تازەگەریی» تێکدانی ئەو ئەخلاقەیە، ڕۆحانییەتی تازەگەرییش، چ ڕۆحانییەتێکی میتافیزیکی بێت «وەکو لای سۆفییەکان دەیبینین، یاخود ڕۆحانییەتێکی حسی بێت «بۆ نمونە : وەکو لای شاعیرانی جۆری ڕامبۆ و ئانا ئەخماتۆڤا و فەروغ»، پێچەوانەی ڕۆحانییەتی دونیایی حوجرەنشینەکان و ئەکلیرۆسەکانە. لێرەدا بەگشتی تازەگەر لەچاوەڕوانی خاچدا «صلیب»دا دەژی، چونکە پێ خستنە ناو نادیارەوە پرۆسێسێکە بەرەو سەر خاچ دەڕوات.

کەواتە جیاوازی نێوان تخووبە مەزن و بێسنوورەکان لەگەڵ تخووبەکانی دیکەدا چییە؟ دۆزینەوەی نادیار و مەستبوون بەتاریکییەکانی ناوی، چ

چەکێکی دەوێت؟ جیاوازی نێوان «نادیار / نەدۆزراوە ـ نادیار / نائامادە» چییە؟ ئەمانە و گەلێک پرسیاری دیکە «کە بە ناچاری هەڵیاندەگرین بۆ بەشێکی دی ئەم نوسینە» کۆمەڵێک پرسیارن چارەنوسی تازەگەرییان لەسەر بەندە، کە دەشێت بەرەو خاچ بڕوات و بیگاتێ... یان دەشێت لەساتێکدا خاچەکان لێیهەڵبێن، یاخود ئەو بمرێت و لەخاچەکان هەڵبێت...؟!

# سەرەتا

وەک سەرەتای بەر لە هەر سەرەتایەک، دەبێت بڵێم کە بەکارهێنانی زاراوەی تازەگەریی لەم وتارەدا لە سەر بڕوایەک دروستبووە کە دەڵێت، تازەگەریی شوناسێکی یەکگرتووی نییە، مانایەک و نەخشەیەک و ناوەندێکی نەگۆڕیشی نییە، تا بۆ هەتاهەتایە بیکەینە نیشانەیەک بۆ ناسینەوەی هەموو تازەگەرییەکان. ئەمە لە بەڵگەنەویستەکانی کارکردنمە لەم وتارەدا، چونکە پێموایە تازەگەریی گەڕانێکی هەمیشەیی و نەبڕاوە و بێلەنگەرە بۆ شوناس وە بۆ جێهێشتنی شوناسیش، بۆ مانا، بۆ ئەو نەخشانەی لە گۆڕانێکی هەمیشەییدان، بۆ ئەو خاڵانەی دەچینە ناویان بۆئەوەی جێیان بهێڵین. پرۆژەیەکە، بەڵام کێ پێی هەڵدەستێت، بۆ چ مەبەستێک، بە چ ئاراستەیەک؟. هیچ یەکێک لەم شتانە ملکەچی بڕیارێکی پێشوەخت نیین، بڕیارێک زۆرجار لە دەرەوەی پرۆسەی گەڕان و پشکنینەوە دروستدەبێت.

لەڕاستیدا مۆدێرنزمی خۆرئاوایی، کە لەمێژە لەجەریاندایە و بەشێک لە ویستە سەرەکییەکانی خۆی بەئەنجام گەیاندوە، وەک نموونەیەکی تایبەتی تازەگەریی، بەردەوام هەڕەشە لە هەموو شێوەکانی دیکەی تازەگەریی لە دەرەوەی خۆرئاوا دەکات. لە هەر جێگایەکی دونیا ویسترابێت بیر لە تازەگەریی بکرێتەوە، نموونەی مودێرنیزمی خۆرئاوایی، وەکو نمونەیەکی باڵا و دەوڵەمەند لە پێشدەستدا بووە... بەڵام بەر لەوەی بپرسین: ئاخۆ پرۆژەی تازەگەریی ئێمە، ڕەچاو بە پرۆژەی تازەگەریی خۆرئاوا، چیدەکات و لە کوێدایە؟ خاڵەکانی یەکگرتنەوە و جیابوونەوەیان چییە؟ ئایا زەمەنی ئێمە دووبارەبوونەوەی زەمەنی خۆرئاوایە؟ ئاخۆ تازەگەریی ئێمە «ئەگەر

پرۆسەیەکی وەها لە ئێستادا بخرێتەگەڕ» تەنیا هەرسکردن و دووبارەکردنەوەی فیکری خۆرئاوایە؟ دەستپێکردنەوەیە لەهەمان ئەو خاڵەوە کە ئەوان پێیگەیشتوون، یاخود دابەزینە بۆ ناو هەمان پرۆژە و گۆێگرتنە لە هەمان مەبەست؟ ژەنینی هەمان میلۆدی و نمایشکردنەوەی هەمان تێکستی پێشوەخت نوسراوە، ئایا ئەگەری ئەوە هەیە تازەگەرییەک لەدایکبێت، دووبارەبوونەوەی تازەگەریی خۆرئاوایی نەبێت؟ ... ئەمانە و چەندەها پرسیاری دیکە کە لە بەردەم هەموو پرۆژەیەکدایە بیەوێت لە دەرەوەی خۆرئاوا، بیر لە تازەگەریی بکاتەوە... بەر لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە، ناچارین چەند خاڵێکی زۆر گشتی و بنەڕەتی ناو مۆدێرنیزمی خۆرئاوا دیاریبکەین... چونکە بەدڵنیایەوە ئەو خاڵانە دواتر دەبنە مایەی ڕوونکردنەوەی جیاوازییەکان و دەرخستنی جوداییەکان.

١- لە بۆدلێرەوە، سەیرکردنی تازەگەریی وەک دیوی کاتی و ڕاگوزەر و بەسەرچووی دیاردەکان، یەکێکە لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی تازەگەریی. لای بۆدلێر هونەر دوو چەمکی هەیە: چەمکێکیان کاتییە، لەناودەچێت، ڕێگا خۆشدەکات بۆ چەمکێکی تری کاتی و شێوەیەکی تری تێپەڕ جێگای بگرێتەوە. چەمکی دووەمیش نەمرە و ناگۆڕێت. تازەگەریی لای بۆدلێر دەرکەوتەی چەمکی یەکەمە، واتە پەیوەستە بە لە ناوچوون و گۆڕان و ئاوابوونەوە، لەم دیدەشەوە تازەگەریی دەرکەوتەیەکی کاتی و جیاواز و بەسەرچووی جەوهەرێکی نەگۆڕ و نەمرە. ( بڕوانە «ما الحداثة» - هنری لوفیڤر، وەرگێڕانی : کاظم جهاد، دار ابن رشد ل 18 ).

بۆدلێر « تازەگەریی » و« لەناوچوون و بەسەرچوون »، «تازەگەریی» و « مۆدە »ی بەیەکەوە گرێداوە، بەوپێیەی کە مۆدە هەمیشە نیشاندەرەوەی دیوی کاتی و بەسەرچووی ئارەزووەکانی مرۆڤە.

٢- سەیرکردنی « تازەگەریی» وەکو مەسەلەیەکی گرێدراو بە عەقڵانییەتی خۆرئاواوە، بەئەندازەیەک کە هەموو جیاکردنەوەیەکی تازەگەریی لەو عەقڵانییەتە دەبێتە مایەی مردن و لەناوچوونی. «ماکس فێبەر» یەکێکە

لەوانەی بەتووندی پێ لەسەر ئەو پەیوەندییەی نێوان «مۆدێرنیزم» و «عەقلانییەتی خۆرئاوا» دادەگرن، نەک هەر ئەمە، بەڵکو «پیشەسازیی» و «سەرمایەداریی» بە دوو بەرهەمی گرنگی عەقلانییەتی خۆرئاوا لەقەڵەمدەدات. «هابرماز» پێیوایە فێبەر بەدرێژایی هەموو ژیانی هەوڵیداوە ئەو کێشەیە چارەسەربکات کە «بۆچی گەشەی زانستی، هونەری، پۆلیتیکی، ئابووری» لە دەرەوەی ئەوروپا بەو ڕێگایەدا تێنەپەڕیوە «ڕێگای عەقلانییەت» کە تایبەتە بە خۆرئاوا ( بڕوانە «الخطاب الفلسفي في الحداثه» ـ یۆرگن هابرماز، وەرگێڕانی د. علی مقلد. العرب و الفكر العالمي ژمارە ٨و / زستانی 1990، ل ٥٩ـ٧٩ ). مارکۆزیش سەرنجی هەمان ئەو مەسەلەیە لای فێبەر دەدات، کاتێک دەنوسێت: «لای فیبەر جۆرێک لە عەقلانییەت هەیە کە تەنیا لە خۆرئاوادا دەرکەوتووە، سەرمایەداریی بەرهەمیهێناوە، یاخود لایەنی کەم بەشداریکردووە لە بەرهەمهێنانیدا و چارەنوسی ئێمەشی دیاریکردوە». یان کاتێک دەنوسێت «چەمکی عەقڵ، کە هەر بە عەقلانییەتی خۆرئاوا مەزەنەکراوە، ئەو چەمکەیە کە هەموو پێکهاتێکی لەسەر بەندە و بەسەر هەموو شتێکی تردا زاڵە». ( بڕوانە: «التصنيع و الراسمالية لدى ماكس فيبر» ـ هربرت ماركوز. وەرگێڕانی جورج طرابيشي. دراسات عربية. ژمارە 8، ساڵی 12 . حوزەیران / تەممووز 1976، ل110 ). لەڕاستیدا گرێدانەوەی تازەگەریی و پیشەسازی و سەرمایەداری بەعەقلانییەتی خۆرئاواوە، یەک مانای هەیە، ئەویش ئەوەیە کە مۆدێرنیزم لە هەلومەرجی دەرەوەی خۆرئاوادا دووبارەناکرێتەوە... ئەوەش ئاگادارکردنەوەیەکی گرنگ و پێشوەختە بۆ هەر تازەگەرییەک، لە دەرەوەی کەش و هەوای عەقلانییەتی خۆرئاوادا بیەوێت بژی و دەست پێبکات و هەناسەبدات.

٣ـ سەیرکردنی تازەگەریی وەک قۆناغێک کە لەناو خودی خۆیەوە سەرهەڵدەدات، واتە ڕوانین لێی وەکو سەردەمێک کە مانای خۆی لە ناو خۆیەوە هەڵدەقوڵێت، نەوەکو لە سەردەمەکانی ترەوە. سەردەمێک بەها و مانا و ڕەفتاری تایبەتە بە خۆی. «هیگڵ» پێشەنگی ئەوانە بوو کە

ئەو مەسەلەیەی خستەڕوو. هیگڵ گەرەنتی و زامنەکانی سەردەمی خۆی لە چوار خاڵدا کۆکردەوە:١ـ تاکخوازی «فەردانیەت» ٢ـ مافی ڕەخنەگرتن ٣ـ سەربەخۆیی لە کارکردندا ٤ـ فەلسەفەی ئایدیالیستی. (بڕوانە: «الخطاب الفلسفی في الحداثة» ل. 106). واتە تازەگەریی دەبێت لەتەک خۆیدا بەها و مانا و شێوە ڕەفتاری خۆی هەڵگرێت... خەسڵەتەکانی سەردەمی خۆی پێبێت، درێژکراوەی ڕۆژگارەکانی تر نەبێت، بەڵکو نیشانەی کاڵبوونەوە و لاوازبوونی ئەو سەردەمانەی دی بێت.

ئەم سێ خاڵە سەرەکییەی مۆدێرنیزمی خۆرئاوا، سێ خاڵی گرنگن، گرنگی ئەم سێ خاڵەش بۆ ئێمە لەم وتارەدا لەوەدا بەر جەستەدەبێت کە لایەنی کەم سێ ئاستن ناتوانن لە ساتەوەختی ئێمەدا دووبارەببنەوە و ببن بە خەسڵەتی پڕۆژەیەکی تازەگەر، پڕۆژەیەک کە ئێمە لای خۆمانەوە بیخەینە گەڕ. تازەگەریی ئێمە دەبێت، لەدەستکردی گەلان و کولتووری ئێمە بێت و لەسەر زەمینی ئێمەوە سەرچاوەی گرتبێت. لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١. چەمکی«تازە» لەجیهانێکی داخراوی وەکو جیهانی ئێمەدا خۆی بۆ خۆی تازەیە، پیادەبوونیشی لە سەر چارەنوس و داهاتووی کولتووری ئێمە بە ئەندازەیەک گرنگ و چارەنوسسازە کە لەڕووی ناچارییەوە دەبێت دەستێوەردانێکی جەوهەری بێت لە هەموو ئەو ڕووبەرانەی خۆیان وەکو پانتایی نەمر و نەگۆڕ دەخەنەڕوو. ئێمە لە کولتوورێکدا دەژین کە تائێستا دوورکەوتنەوەیەکی بەرچاوی لە سروشت بەخۆیەوە نەبینیوە، لەم دۆخەشدا جیاکردنەوەی «ڕاگوزەر و تێپەڕ» لە «هەمیشەیی و نەمر» کارێکی ئەستەمە. بەتایبەتی لای بۆدلێر، چەمکی ڕاگوزەر هەڵوێستێکی کاتی و پڕ لە خۆنواندنی «داندیانەیە» ( داندی بەکەسێک دەوترێت کە بەردەوام حەزی لە خۆ نواندن و دەرکەوتنە بە شێوەی سەیر، بەجۆرێ کە لەڕێگای ڕەفتار و جلوبەرگەوە خۆی لە خەڵکانی دیکە جیادەکاتەوە) بەپێی ئەم دیدە بۆدلێرییەش تازەگەریی هەڵوێستی یەکێکە، کە لەڕێگای خۆنواندن و خولقاندنی جیاوازییەوە خۆی لە شارستانیەتێکی دیاریکراو

جیادەکاتەوە. بەڵام لای ئێمە تازەگەریی ناتوانێت لە سنووری هەڵوێستی فەردێکدا بەرامبەر شارستانییەتێک بوەستێت. چونکە لەبنەڕەتەوە ئێمە دەمێک باس لە تازەگەری دەکەین، قسەمان لەسەر هەڵوێستی فەرهەنگ و کولتوورێکە بەرابەر بەجیهان و سەرجەمی کێشە و پرسیارە مەعریفیەکان، نەوەکو قسەمان لە هەڵوێستی کەسێک یان شاعیرێک یان گروپێک هونەرمەند بێت بەرامبەر ئەو جیهانە و کێشەکانی ... واتە بەکورتی دەرگا بۆدلێرییەکان «واتە دەرگای تازەگەرییە فەردییەکان» ئەگەر کراوەش بن نامانگەیەننە سەر جەوهەری ئەو تازەگەرێتییەی لەئێستادا بۆ ئێمە پرۆسەیەکی رۆشنبیریی چارەنوسسازە. بە کورتی لە جیهانی ئێمەدا «لقە تازەگەریی» یان تازەگەریی میکرۆسکۆبی و بچوک بچوک، ناکاتە پرۆژەیەکی گەورەی تازەگەریی. لە فەزای دونیای ئێمەدا کە هەندێک کایەی هونەری و ئەدەبی و زانستی بێکاریگەر و بچوک هەن، دەکرێت تازەگەریی سنووردار و فەردی و فەرعی هەبن، کە بە هیچ پرۆسەیەکی تازەگەریی سەرتاسەرییەوە نەبەستراون، ئەمانە تەنیا لە جێگایەکدا کاردەکەن و ئەو گۆڕانانەی دروستیدەکەن ناگوازرێنەوە بۆ جێگای دیکە.

٢. ئەگەر مۆدێرنیزمی خۆرئاوا پابەندی عەقڵانییەتی خۆرئاوا بێت، ئەوا بەدەر لە بۆچوونەکانی ماکس فیبەریش ، بونیادنانی مۆدێرنیزمێکی تر لەسەر هەمان ئەو بنەما و چەمکە عەقڵییانە کارێکی ئەستەمە. لێرەوە تەنیا دەرگایەک بۆ تازەگەریی، ئەو دەروازەیەیە کە تازەگەریی خۆرهەڵاتی و لەگەڵیشیدا تازەگەریی کوردی «وەک لقێک لە پرۆژەی تازەگەریی لە خۆرهەڵاتدا» بە کارکردنەوە گرێدەداتەوە بۆ خوڵقاندنی عەقڵانییەتێکی تایبەت بە کولتوور و نەتەوەکانی ناوچەکە. لەڕاستیدا ئەگەر لە خۆرئاوادا جیاکارییەک لەنێوان «مۆدێرنیزم» و «عەقڵانییەت»دا بکرێت ، لێرەدا ئەو جیاکارییە ئەستەمە، لەبەر ئەوەی ئیشکردن بۆ تازەگەریی لە ئیشکردن بۆ عەقڵانییەت جیانابێتەوە، عەقڵانییەتێکیش نایەتەگۆڕێ کە لە هەمان کاتدا هەڵگری هەموو کێشەکانی تازەگەریی نەبێت. لێرە تەنها دەرگایەک تازەگەریی بتوانێت پیایدا تێبپەڕێت، دەرگای دەسەڵاتی عەقڵە،

بەڵام ئەو جیهانەی ئێمە بەرابەری وەستاوین، جیهانێکە تەواو جیاوازە لەو جیهانەی عەقڵانییەتی خۆرئاوا ئەزموونیکردووە، بەڵکو عەقڵانییەتی خۆرئاوا و مۆدێرنیزمی خۆرئاواش دووبەشی پێکهێنن لەو جیهانەی کە ئێمە بەرامبەری وەستاوین، واتە فیکری خۆرئاواش چەندە دەتوانێت یاریدەدەربێت لە بەخشینی هەندێ لە کەرەستەکانی بیرکردنەوە، بەهەمان ئەندازەش خۆی دەبێتە بابەتی بیرکردنەوە بۆ ئێمە. واتە بۆ بونیادنانی تازەگەرییەک کە تازەگەری ئێرە بێت، ناچارین جۆرێک لە عەقڵانییەتمان هەبێت، بتوانێت بە چەمک و زاراوە و میتۆدی تایبەت عەقڵانییەتی خۆرئاوا بخوێنێتەوە. تازەگەریی ئەوەیە بتوانیت بەچاوی خۆت ببینیت، نەوەک بە چاوی ئەوانی تر. بە میتۆدی خۆت ئەوانی تر بخوێنیتەوە، نەوەک تەنیا بە میتۆدی ئەوانی تر خۆت بخوێنیتەوە. تازەگەریی ئێمە، ناتوانێت لە عەقڵانییەتی خۆرئاواوە بێتەدەرێ، چونکە ئەو عەقڵانییەتە خۆی دەبێت بە بابەتێک لە بابەتەکانی بیرکردنەوەی ئێمە، دەبێتە شوێنی پرسیار و گومانمان، دەبێتە مەیدانی تێفکرین و جەنگ و ململانێمان، عەقڵانییەتی خۆرئاوا هەتا لە پاکترین و مرۆڤدۆستانەترین ئاستیدا، لە ئەبستراکترین و بەڕووکار بێلایەنترین ئاستیدا، لەوەناکەوێت کە ڕوانینی ئەوی دی بێت بۆ دونیا، کە ناکرێت و ناتوانێت ئەلتەرناتیڤی ڕوانینی ئێمە بێت بۆ دونیا. گەورەیی خۆرئاوا و گرنگی بۆ ئێمە، پەیوەندی بەوەوە نییە کە پرۆژەی تازەگەریی لە خۆرهەڵات دەبێت هەڵقووڵاوی ئەو پرسیارانە بن کە کۆی قەیرانی فیکری و شارستانی ئێمە، لە فەزای کولتووری خۆمان و فەزای کولتووری جیهانیدا دەیخاتە پێش دەممان.

٣. تازەگەریی بۆ ئەوەی ببێت بە «بەها»، ببێت بە سیستمێک لە سیستمەکانی دروستکەر بۆ ڕەفتاری نوێ و پێکهێن بۆ سوبێکتی تازەی ئینسانی، دەبێت لە کێشەیەکی مەعریفی ڕووتەوە بووبێت بە کێشەیەکی سۆسیۆلۆژی و ئەتیکی «ئەخلاقی»ـش. ئەمەش بەمانای ئەوەی بووبێتە خەسڵەتێکی دیاریکەر و جیاکەرەوە بۆ قۆناغێک، واتە هەموو چەمکەکانی

بوونیتنە هەڵگری مانای سیاسی و ئابوری و شارستانی. تازەگەریی بۆ ئەوەی گەرەنتی لە خۆیەوە وەربگرێت «واتە سەرچاوەی دەرەکی نەبێت، وەکو هیگل دەیگووت». دەبێت بوونیتە بزاوتێکی سەرتاپاگیر، هوشیارییەکی تایبەت کە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا دەرکەوتەی تایبەتی خۆی هەیە وە پراکتیکێکی شارستانیانەی تایبەت دەخاتەوە، بەڵام بێگومان زەمەنی ئەمڕۆی جیهان زەمەنی هیگڵ نییە، کۆی جیهان لە دەرەوەی خۆرئاوا ناتوانێت سەردەمێک بژی گەرەنتییەکانی تەنها لە خۆیەوە وەربگرێت، واتە خۆ بەخۆ و دوور لە کاریگەری کولتوورەکانی تر و سەردەمەکانی تر بژی، هێندەی زەمەنێک دەژی کە زەمەنی کەناری خۆرئاوایە «جگە لەوەی کە کورد زەمەنی پەراوێزی دووهەمیش دەژی کەزەمەنی کەناربوونە لە ناو دەوڵەتە داگیرکەرەکاندا».

لەڕاستیدا لە دونیای ئەمڕۆدا مەسەلەی «زەمەنی تایبەتی» و «گەرەنتی هەڵقووڵاو لە خودی خۆتەوە» ئەستەمە، بۆیە ئەم دۆخە کارێکدەکات کە تازەگەریی زۆرجار لەدونیای ئێمە و دونیا هاوشێوەکانی وەک ئێمەدا، دەرکەوتەی «سیاسی، سۆسیۆلۆژی، تەکنیکی، ئەتیکی» ئاشکرای نەبێت، واتە تازەکردنەوەی کایەی سیاسی یان زانستی، یان ئەخلاقی کارێکی سەخت بێت و دەمێک قسە لە تازەگەری دەکرێت، تەنیا مەبەست تازەکردنەوەی ئەدەبی و مەعریفی بێت. ئەمەش وایکردوە تازەگەریی وەکو دەرکەوتەیەکی مەعریفی بچوک سنووری بۆ دابنرێت و هەر زوو گەمارۆبدرێت و نەبێتە پرۆژەیەکی هەمەلایەنە، واتە مەسەلەی «پرۆژەی تایبەتی» ئەو پرۆژەیەی کە بەرابەر تاریکییەکانی ڕابوردووی خۆت و بەرابەر هەموو دەستێدەوەردانە تێکدەرەکانی خۆرئاوا دەوەستێتەوە، ئەگەرچی ئامانجێکە لە ئامانجە گرنگەکانی تازەگەریی، بەڵام بەدڵنیاییەوە سنوورەکانی ئەم پرۆسەیە لە سنوورەکانی کارکردنی تازەگەریی مەعریفی گەورەترە.

## هەوڵدانێک بۆ تێگەیشتن لەو تەمومژ و ئاڵۆزییەی دەوری مانا و بەکارهێنانەکانی «تازەگەریی» دەدات

یەکێک لەو بیروڕایانەی کە گەلێک باوە و زیادە بەربڵاوە، لەگەڵ سەرەتای هەموو تازەگەرییەکیشدا دێتەپێشێ، ئەو بۆچوونە تیورییەیە کە دەڵێت: «تازەگەریی گەڕانە لەناو نادیاردا»، بەڵام زۆرجار ئەو ڕستەیە دەبێتە یەکێک لەو وەهمانەی دەیخەینە کار بۆ ونکردنی ماناکانی تازەگەریی و ماناکانی «نادیار» یش. لەڕاستیدا تازەگەریی لەهەر شوێنێکەوە سەیربیکەین جۆرێکە لە کارکردن لەگەڵ نادیاردا، بەڵام ئەم ڕستەیە ڕستەیەکی هێندە گشتییە کە کاتێک بە وردی سەرنجدەدەین، دەبینین ئەم شێوەیە لە خستنە ڕووی مەسەلەکان زیاتر لەوەی کێشەکانمان بۆ ئاسانبکات، پرسیارەکانمان بۆ ئاڵۆزتر و ئاڵۆزتر دەکات، زۆرجاریش دەبێتە بەشێک لە کەرەستەی ڕاکردن و یاریکردن بەدەوری ماناکانی تازەگەرییدا. وشەی نادیار، وشەیەکە دەشێت چەندەها مانای جیاواز جیاواز و قاڵب و سنووری جیاجیا لە خۆبگرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی پەیوەندیی نێوان نادیار و تازەگەریی پەیوەندییەکە هێشتا دیارینەکراوە، لەبەر ئەوە هەر دەقێک کە لە تاریکییەوە دێت، هەر ئایدیایەک کە لە بەرگی نادیاری دۆزراوەدا خۆی دەخاتەڕوو... مافی ئەوە دەدات بەخۆی ناوی تازەگەر بەسەر خۆیدا ببڕێت. تا ئەمڕۆ هیچ زانیارییەکمان دەربارەی نادیار نییە، لەبەر ئەوە هەموو دەقێک، هەموو نوسینێک و هەموو نوسەرێک دەتوانێت بێت و بڵێت من لە نادیارەوە هاتووم، من کوڕی تاریکییەکانی ناو نادیارم و لەو تاریکییەوە سەرمهەڵداوە. لەمجۆرە ڕۆشنبیریانەدا کە ململانێی زانستی تیایدا ون و بەرتەسکە، دەشێت

هەموو دیاردەیەک و هەموو دەرکەوتەیەک ناوی تازەگەر لەخۆی بنێت. کە تازەگەریی تیوریزەنەکرابێت، هیچ سنوورێکی بۆ دیارینەکرابێت، مانا مەعریفییەکانی ونبێت، سیفەتێکی ڕۆشن نەبێت لە بەرهەمە دێرینەکان جیایبکاتەوە، سیستمێکی پێوانەیی نەبێت تازەگەریی لە تەقلید و ئاسایی هەڵاوێردێ... هەموو یەکێک لای خۆیەوە بۆی هەیە ناوی تازەگەر بەسەر ئەزموونی خۆیدا ببڕێت، وە واقعی حاڵیش «لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا » هەر وایە.

بەمجۆرە دیاری نەکردنی مانای تازەگەریی یان ئەو سنوورانەی کە دەشێت دەقێک ببڕێت بۆ ئەوەی بە تازەگەر بیناسین، لێڵکەر و ئاڵۆزکەری یەکەمی مانای تازەگەرییە. لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێتەپێشێ، ئەویش ئەوەیە: چی وادەکات چەمکی تازەگەریی تا ئەم ئەندازەیە به تەپوتۆز و تەمتومان دەوری گیرابێت؟ چییە ئەو مافە دەبەخشێتە چەندەها دەق و نوسەر سیفەتی تازەگەر بنێنە پاڵ خۆیان؟ زەمینەی ڕۆشنبیریی ئەم تەمتومانە چییە؟ ڕەنگە هۆی سەرەکی ئەم حاڵەتە بگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێک ئەڵقەی لاواز کە ڕۆشنبیریی کوردی لە هەناوی خۆیدا هەڵیگرتووە، کە دەبنە مایەی دروستکردنی گێژاوێک لەناویدا دەمامکدارەکان بە ئاسانی خۆیان دەکەن بەناو کۆراڵی تازەگەراندا. تازەگەرانیش بەئاسانی لەناو هێزە دێرین و کۆنەکاندا وندەکرێن، لەپشت ئەو یارییەشەوە، سەلەفیەت و غەیبانیەت درێژە بە بەردەوامی خۆیان دەدەن .

ئەو هۆیانە لەم چەند سەرنجەدا کۆدەکەمەوە:

## ١. لاوازیی سیستمی (پرسیار) لە ڕۆشنبیریی کوردیدا

ئاراستەی هەر ڕۆشنبیرییەک پابەندی پرسیارەکانێتی، ڕۆشنبیرییەک کێشەکانی خۆی نەزانێت ناتوانێت تازەگەربێت، بۆ ئەوەی وریایی خۆشی بسەلمێنێ، پرسیار مەحەکی ئەو وریاییەیە. پرسیار سەرەتای تازەگەرییە، خەسڵەتی ئەو سەردەمانەیە کە دەتوانین ناویان بنێین سەردەمانی «پێش

تازەگەریی »)، بەڵام سەرەتایەکە دواتر زۆر لە ئەنجامە ترسناکەکان دەستنیشاندەکات. لاوازیی سیستەمی پرسیار لەرۆشنبیریی ئێمەدا مانایەکی گرنگی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە رۆشنبیریی ئێمە تا ئەم ساتە گرفتە سەرەکییەکانی خۆی ناناسێت، هیچ بیرۆکەیەکی بچوک و تەماویش سەبارەت بە دوارۆژی خۆی شکنابات.

لەرۆشنبیرییەکی وەکو رۆشنبیریی کوردیدا، دەبێت پرسیارەکان ئاراستەی کۆی بونیادەکە بکرێن... دەبێت گومان لە سەرجەمی کار و کاریگەریی سیستمەکە بکەین. مەسەلەی ئێمە، مەسەلەی پرسیارێک نییە لە کایەیەکی مەعریفیدا سەریهەڵدابێ و پێویستی بە وەڵام هەبێت، کێشەی «رێگرێکی ئەبستمۆلۆژی - عائق معرفی» نییە بیشکێنین و بیخەینەروو، دوای ئەوەش بکەوینەوە سەر رێگای کاری زانستی.. کێشەی ئێمە، کێشەی عەقڵێکە کە غەیبیانیەت لە هەموو ئاستەکاندا تووشی ئیفلیجییەکی سەرتاسەری کردووە، دامەزراندنی گۆران و پیادەکردنی پابەندییەکی گەورەی بە پیادەکردنی پرسیاری هەمەلایەنەوە هەیە.

پرسیار سەرەتا لەناو خودی کارکردنی سیستەمەکەوە دێتەگۆڕێ و لەناو بونیادەکەوە سەرهەڵدەدات، بەڵام توانای نییە لەناو لاوازییە کوشندەکانی ئەو بونیادەدا بۆ وەڵام بگەڕێت. تازەگەریی لە پرسیاردا کۆتایی نایەت، بەڵام هەمیشە بە لێشاوێک لە گومان و پرسیار دەستپێدەکات، تا بیسەلمێنێ کە چیتر رۆشنبیری باڵادەست و باو ناتوانێت وەڵامی پێداویستییە نوێکانی دونیا و مەعریفە بداتەوە، واتە جەوهەری پرسیار پەیوەندییەکی راستەوخۆی بە جەوهەری تازەگەرییەوە نییە، پرسیار ئەو دوا کارە نییە کە دەبێت تازەگەر بیکات، بەڵکو ئەو رێگرەیە کە لەبەردەم سیستمی کۆندا دایدەنێت و بەهۆیەوە گومان گەورەدەکات و دڵنیایی دونیای دێرین دەرهەق بە خۆی دەشکێنێت. پرسیار تەنیا بە مەبەستی «ئابڕوبردنی تەقلیدییەت» دەست پێدەکات، بەڵام دەرەنجامە مەعریفییەکانی قووڵتر و دوورتر دەڕۆن. لەبەرئەوە بایەخی پرسیار لە رۆشنبیریی کوردیدا بەندە بەوەی تا چ ئەندازەیەک دەتوانێت بونیادە

تەقلیدییەکە بخاتەڕوو، نهێنییەکانی بخاتە بەر گومان و ئاشکرایانبکات.
پرسیار دێت بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ لەمێژە تەقلیدییەت وازی لە پرسیارکردن هێناوە و چیتر پرسیارەکان ناتوانن لەناو ئەو دید و بونیاد و ڕوانینەوە بۆ مانای خۆیان بگەڕێن. لەم بارەدا پرسیار لەو وزەیە دەچێت کە دەدرێت بە ماشێنێک بۆ ئەوەی بکەوێتە کار، بەڵام کارنەکردنی ماشێنەکە، تەمەڵبوون و لە بزاڤ دەرچوونی سەلمێنەری ئەو ڕاستییەیە کە ماشێنەکە خەوشی گەورەی تێدایە، کەچی هەندێ پرسیاری وەهمیش هەیە کە جارجار دەردەکەون و جووڵەیەکی وەهمی و درۆزنانە دەبەخشنە ئەو ماشێنە، سەرنشینەکانی تووشی ئەو خەیاڵە درۆزنە دەکەن کە واوەختە ماشێنەکە بجوڵێت... لە سیستمی پرسیاری وەهمیدا هیچ نەوەیەک، نەوەکانی تر گوناهبارناکات، هیچ ئەزموونێک ئەزموونێکی تر ناخاتە بەر گومان، بەردەوام کۆی بونیادەکەش بە سەلامەتی دەمێنێتەوە.
بەڵام هەڵاوێرکردنی ئەوەی چ نوسینێک دەیەوێت لە بونیادە تەقلیدییەکە جیاببێتەوە، چ یەکێکی دیش دەیەوێت درێژکراوەی بێت، ئەوە تەنیا لە ڕێگای سیستمێکی باڵای پرسیارکردنەوە ئاشکرادەکرێت. بایەخنەدان بە ڕۆڵی کاریگەر و ئۆرگانی پرسیار یەکێکە لەو هۆ گرنگانەی وادەکات پرسیاری تازەگەریی بەئاسانی لە پرسیارە دێرینەکان جیانەکرێتەوە.
چونکە ونکردنی مانای پرسیار کەمکردنەوەی بەرپرسیارێتی هەموو نوسینەکانی دیکەشە لەبەردەم پاشەڕۆژدا. لەڕۆشنبیریی ئێمەدا ئەوە پرسیارە کە دەبێت دەمامک لەسەر دەقەکان لاببات، نەگووتراوەکان ئاشکرابکات، ئایدۆلۆژیاکان و درۆ و وەهمەکانیان بخاتەڕوو. پرۆسەی پرسیارکردن، پرۆسەی ئاشکراکردن و لادانی دەمامکە لەسەر دەقەکان، ئەوەی ئامانجی لابردنی دەمامکی نەبێت، ناتوانێت لەهیچ هەنگاوێکدا بەرەو تازەگەریی بەشدارییەکی کاریگەری هەبێت، چونکە قۆناغی پێش تازەگەریی قۆناغی لادانی دەمامکەکانە لەسەر هەموو ئەو نوسین و دەق و گووتارانەی لە ژێر دەمامکی جۆراوجۆردا دەیانەوێت خۆیان بکەنەوە بەناو سەردەمە تازەکاندا. زۆربەی دەمامکەکانیش سروشتێکی ستاتیکی، ئایدۆلۆژی، ئەخلاقیان هەیە. تازەگەریی ئاشکراکردنی دەمامکی

ڕۆشنبیریی سەردەمێکە، پرسیاریش کەرەستەی ئەو ئاشکراکردنەیە، ونبوونی پرسیاریش مانای هەموو نوسینە دەمامک بەسەرەکان دەتوانن بۆ سەردەمانێکی تریش بێترس بژین و بەردەوامبن.

## ۲. لاوازیی سیستمی پۆلێنکردن

تا ئەم ساتەوەختە ڕۆشنبیری ئێمە خاوەنی ڕێچکەیەک نییە بۆ جیاکردنەوەی شێوازە جیاجیاکانی دەق. بێگومان پۆلێنکردنە کۆنەکان جگە لەوەی ئەمڕۆ تەواو بێکەڵکن و مانا نادەن بەدەستەوە، ناتوانن شتێکی نوێش بخەنە سەر خوێندنەوەیەکی قووڵی ئەو دەقانە. دەبێت پۆلێنی «کلاسیکی، ڕۆمانسی، واقعی» کە سەپاندنی مێژووی ئەدەبیاتی خۆرئاوایە بەسەر ئەدەبیاتێکدا کە لە جیهانێکی دیدا ژیاوە، شوبهاندنی ڕێبازە ئەدەبییەکانی شوێن و جوگرافیا و سەردەمانێکی ترە بە ڕێبازە خۆرئاواییەکان، کە هەر ئەو میتۆدە خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە نوکتەی بێمانا و میتۆدی نازانستیانە، چ نهێنییەک بۆ ئێمە ئاشکرابکات؟ لەڕاستیدا ڕۆشنبیریی کوردی تا ئێستا نەیتوانیوە پۆلێنی شێوازە جیاوازەکانی ئەدەبی کۆن و نوێ بکات، ئەگەر لەبەرامبەر ئەدەبی کۆندا جۆرە پۆلێنێکی سەرەتایی بێکەڵکی خستبێتە گەڕ، ئەوا لە بەرامبەر پۆلێنکردنی ئەدەبی نوێدا بەتەواوی دەستەوەستانە. لاوازی سیستمی پۆلێنکردن مانای دیارینەکردنی شوناسی قۆناغەکان ـ شوناسی ڕێبازەکان ـ شوناسی فۆڕمە جیاوازەکان ـ شوناسی بابەتەکان. مردنی پۆلێنکردن لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا مانای لەڕۆشنبیرییەکدا دەژین کە تیایدا هیچ بەشێک شوناسی خۆی نازانێت و ناتوانێت شوناسی بەشەکانی تریش دیاریبکات، ئەمەش دواجار بە مەرگی هەموو کایەکان و بەرهەمەکان دواییدێت. لە ڕاستیدا شکاندنی ڕێچکەیەک بۆ پۆلێنکردن، کارێکی هەروا سانا نییە، بەڵکو بەناو کۆمەڵێ تەوەرەی ئاڵۆزدا تێدەپەڕێت کەڕەنگە سەرەکیترینیان ئەمانە بن:

*١ـ بونیادی دەق.*

*٢ـ وەزیفەی دەق.*

*٣ـ پەیوەندیی دەق بە کێشە گشتییەکانی هوشیارییەوە.*

*٤ـ شوێنی دەق لەو کایەیەدا کە داگیریکردووە.*

ونبوونی ئەم پێوانانەش کارێکدەکات پۆلێنی دەق ئەستەمبێت. لەڕاستیدا هیچ جۆرە تازەگەرییەک لە گۆڕێ نییە بەبێ زانستێکی پۆلێنکردن، بەبێ سیستمێک بۆ جیاکردنەوەی دەقە جیاوازەکان لەیەکتر. کاتێک کە زانیارییەک نەبێت سەبارەت بە جیابوونەوەی بونیادەکان و جیابوونەوەی وەزیفەکان و ترازانی شێوەی دەقی نوێ لە دەقی کۆن، کەرتبوونێک نەبێت لە هوشیاریدا بەرەو تایبەتمەندێتی، ناتوانین شێوازی تازەگەریی لە شێوازەکانی دی جیابکەینەوە. ونبوونی سیستمی پۆلێن، یەکێکە لە هۆ سەرەکییەکانی ئالۆزی لە دەوری مانای تازەگەریی. چونکە ونبوونی سیستمی پۆلێن مانای ونبوونی توانای جیاکاریی، کە توانای جیاکاریش نەما واتە سنووری جیاکەرەوە لە نێوان کۆن و نوێدا تەواو لە بەیندەچێت.

### ٣. تێگەیشتن لە تازەگەریی وەکو مەسەلەی پەیوەندیی دەق بە دەقەوە

هەموو دەقێک لەناو جیهانێکی گەورەدا دەژی لە دەقی دیکە، هەموو دەقێک کرانەوەی کۆمەڵێک دەقی دیکەیە، بەڵام ئایا دەقی تازەگەر کردنەوەی چ دەقێکە؟ ئەمەیان دەبێت پرۆسەی تازەگەریی خۆی دەستنیشانیبکات. لەڕاستیدا یەکێک لە هۆکارە گرنگەکانی تێگەیشتنی هەڵە لە تازەگەریی برێکی زۆری لەوەوە دێت کە زۆرجار تازەگەریی بە پرۆسەی بەیەکداچوون و نزیکبوونەوە لە دەقی دیکە و نموونەی دەقی دیکە تێدەگەین، واتە لە دەرەوە دەقێکی نموونەیی هەیە، کە بە دەقێکی تازەگەر ناسراوە و پێناسدەکرێت، لێرە خوڵقاندنی دەقێکی هاوشێوە،

دەشێت وەهمی تازەگەریی لەتەک خۆیدا هەڵبگرێت و بیگوازێتەوە... واتە جۆرێک لە ئاراستەی تازەگەرییانە دێتەپێشێ کە لە بنەڕەتەوە لەسەر خولقاندن و دوبارەکردنەوەی دەقە تازەگەرەکانی دەرەوە دروستبووە، لە کاتێکدا دەشێت ئەم حاڵەتە تەواو کوشندە و پێچەوانە بکەوێتەوە، ئەگەر سوریالیزم بەشێک بووبێت لە پرۆژەی نوێکردنەوەی ئەدەب و هونەر لە خۆرئاوا، مەرج نییە سوریالیزم بەشێک بێت لە پرۆژەی تازەگەریی ئێمە، یاخود هاتن و گواستنەوەی هیچ چەشنە دەلالەتێکی تازەگەرانەی پێبێت.

لە ئەدەبیاتی ئێمەدا (گۆران) و (ڕوانگە) بەتەواوەتی نوقمی ناو ئەو خولیایە بوون، خولیای بونیادنانەوەی دەقی نوێی دەرەوە لە ناوەوە. ئەم پرۆسەیە دەشێت لەڕووی هونەری و مەعریفییەوە زۆر سوودبەخش بێت، بەڵام دواجار ئەگەر لە ئاستی خولقاندنەوەی هونەرییانەی دەقی دیاریکراودا وەستا و نەبوو بە مایەی دروستبوونی هوشیارییەک سەبارەت بە قەیرانی کۆی بونیادە ڕۆشنبیرییەکە، ئەوا نابێتە بەشێک لە هیچ پرۆژەیەکی ڕادیکالانەی تازەگەریی. واتە لاساییکردنەوەی تازەگەریی مەرج نییە تازەگەریی بێت، چونکە تازەگەریی لەڕێگای خولقاندنەوەی نموونەی هاوشێوەوە لە ناو ڕۆشنبیرییەکەوە ناگوێزرێتەوە بۆ ڕۆشنبیرییەکی دی، بەڵام ئەم پرۆسەیە دەتوانێت ماناکانی تازەگەریی بەکۆمەڵێک ئاڵۆزی و تەمتومانی خەست ئابڵۆقە بدات، کارێکبکات لاساییکردنەوەی تازەگەریی بە تازەگەریی لەقەڵەمبدرێت. سەرەڕای ئەوەش چەند مەترسییەکی تر هەیە کە بەهەمان شێوە دەبنە هۆی بەخشینی سیفەتی تازەگەریی یان زەوتکردنی کە لەم دوو خاڵەدا کۆیاندەکەمەوە:

١- لاوازیی سیستمی دۆزینەوەی «لێکچوون» کە وادەکات زۆرجار سەرچاوە ڕاستەقینەکانی دەقێکمان بۆ نەدۆزرێتەوە و بکەوینە ناو فریوی ئەو بانگەشە ساختانەوە کە دەقێک بۆ خۆی دەیکات بەمەبەستی گومڕاکردنی ئێمە دەرهەق بە سەرچاوەکانی خۆی و ئەو ژینگەیەی لێوەی هاتووە... نەدۆزینەوەی لێکچوون مانای قبووڵکردنی ئەو سەرچاوانەی کە دەقێک دەیەوێت بیکات بەپاڵپشتی تازەگەرێتی خۆی، جا ڕاست بێت

یاخود درۆ.

٢ـ لاوازیی سیستمی دۆزینەوەی «جیاوازیی»، کە وادەکات کۆمەڵێک جیاوازیی گەورە نەبینین کە لە نێوان دەقی نوسراو و دەقی ڕاکێشراودا هەیە... ئەویش دەبێتە مایەی هەڵەیەکی دیکە لە تێکەڵاوکردنی دەقی تەقلیدی لەگەڵ دەقی تازەگەردا.

## ٤ـ بەهێزی یان باڵادەستیی سیستمی بڕیاری «سەلەف»

یەکێکی تر لەو خاڵە گرنگانەی وادەکات تازەگەریی لەڕۆشنبیریی ئێمەدا مانای نەبێت، سیستمی بڕیاری وەچەکانی پێشووە، چونکە تازەگەریی لە قۆناغە سەرەتاییەکانی خۆیدا پێوانە و بەها ئەبستمییەکانی خۆی نەچەسپاندووە، لەبەر ئەوە دواجار بڕیاری تازەگەریی لە دەمی باوکە ئەدەبییەکانەوە دەبیسترێ، نەوەک بەپێی ئەو یاسا و بنەمایانەی کە تازەگەریی دەبێت لەگەڵ خۆیدا بیانهێنێت، تازەگەر زۆر جار بە لۆژیکێکی تر کاردەکات کە هەرگیز باوکە ڕۆشنبیرییەکانمان ناتوانن دەستبخەنە سەر یاسا تایبەتی و مانا نهێنییەکانی... لۆژیکی تازەکردنەوە، لۆژیکی سەردەمێکی ترە، سەردەمێک کە لەبەردەمماندایە، نەوەکو لەدوامانەوە بێت، زۆرجاریش بەئەندازەیەک شەڕانگیزە، کەم لە باوکە سەلەفییەکان دەتوانن تەحەمولیبکەن. لەئێستای دۆخی هەوڵدانەکانی تازەکردنەوەوە دەتوانین بە ئاسانی سەرەنجی ئەو دەمارگرژیی و خۆ ترشاندنە بدەین، کە عەقڵ و دەموچاوی ئەوان تووشیدێت کە دەگاتە ئەندازەی مانگرتن لە گوێگرتن و خوێندنەوەی هەر بەرهەمێک بکەوێتە ژێر ئەو ناوەوە، لای زۆربەی ئەوان قەبوڵکردنی تازەگەریی ڕاستەقینە لە قبوڵکردنی مەرگ سەختترە، بەڵام بڕیاری سەلەف هەمیشە هەوڵدانێکە لەلایەن نەوەکانی پێشووەوە بۆ ئەوەی درێژکراوەی خۆیان بدۆزنەوە. «سەلەف» لەڕیزی وەچە تازەکاندا بۆ وێنەکانی خۆی دەگەڕێت، نەوەکو بۆ تازەگەریی، مەبەستیشی نەمرکردنی وێنەکانی خۆیەتی بۆ پاشەڕۆژ، نیازمەندی

دۆزینەوەی جێپێیەکە لە داهاتوودا، هەر لەبەر ئەوە باوکایەتی هەموو ئەو بەشە تازانە دەکات کە توانای سەرپێچییەکی گەورەیان نییە. سەلەف یان وەکو سەلەف دەبێت بمرێت و لە جێگای ئەو تازەگەرییەک بێتەپێشێ «ئەوەش سەرەتا لە گومانەوە دەستپێدەکات، بەرابەر کۆی پرۆژەکانی رابوردوو» یاخود دەبێتە یەکێک کە بانگەشە بۆ «سەلەفییەتی نوێ» دەکات، لەژێر دەمامکی تازەگەرییدا.

### ٥. باڵادەستیی سیستمی «وێناکردن»

سیستمی وێناکردن بریتییە لە سیستمێکی تایبەت بۆ تێڕوانین کە لە رێگای کۆمەڵێک وێنەوە، خوێندنەوەیەکی تایبەت بۆ واقیع بەرهەمدێنێت، کە هەر خوێندنەوەیەکی دیکەی دیالەکتیکی و زانستی دەخاتە کەنارەوە. من باوەرم وایە کە عەقڵییەتی کوردی عەقڵییەتێکی وێناکەرە، واتە ئەو وێنانەی بەرهەمیاندەهێنێت دەبێتە «سەنتەر» و دواتر وێنەکان جڵەوی پرۆسە عەقڵییەکان دەکەن، پرۆسە عەقڵییەکانیش دەچنەوە خزمەتی «وێناکردن». وێناکردن پرۆسەیەکە «راستی» و «فیکر» لەیەکتر جیادەکاتەوە، کارێکدەکات فیکر لە دەوری چەند ئەیقونەیەکی تایبەت بسورێتەوە، لێرەوە فیکر دەبێتە بەشێک لە سیستمی وێناکردن، دەبێتە کۆمەڵێک سیستمی گووتار «خطاب» کە لەسەر چەند چەمکێکی سەرەتایی بچووک بونیاتنراون، تیایدا وێنە زەینییەکان دەبنە قاڵبی رستێک بۆچوون و پێشبینی و بریاری پێشوەخت و پێشداوەریی کە زادەی ئەو وێنە زەینییە سەرەتاییانەن کە وەک کۆمەڵێک بەڵگەنەویست کاردەکەن و وەک هەقیقەتی دەرەگومان دەبینرێن، هەڵبەت کە سستمێکی سیاسی و ئاینی و رۆشنبیرییش لە تەنیشتەوە دەیانپارێزێن.

تا فیکر تەنیا لە خزمەتی وێناکردندا بێت، تازەگەریی دووردەست و بێناسۆیە، تا فیکر لە قاڵبە وێناکراوەکان نەچێتەدەرێ، بەرەو گەران بەدوای رێبازی نوێدا بۆ پشکنین و دۆزینەوە، کاری کۆی بەشەکانی

کولتووریک، هەر دەبێتەوە بە جۆرێکە لە وێناکردن و حوکمی خێرا دروستکردن و وێنەی سادە داڕشتن. بۆ نمونە لەلای ئێمە «سیستمی وێناکردن» لەوحاڵەتی بەرگرییەوە هەڵقووڵاوە کە مێژووی سەختی ئەم سەدەیە بەسەر ئێمەدا سەپاندویتی، لەم دۆخەشدا خولیای گەڕان بەدوای ڕاستیدا، شەیدایی بۆ گەڕان و دۆزینەوە لە نزمترین ئاستدایە، لێرەدا مەسەلەی خۆپاراستن لە فەوتان و تواندنەوە مەسەلەی سەرەکییە. لە ڕۆشنبیرییەکدا کە سەردەمی بەرگری دەژی، گۆڕینی «چییەتی - ماهیەت» نایەتەدی، تازەگەرییش گۆڕینی ماهییەتە. ڕۆشنبیریی بەرگری تەنیا بایەخ بە «بوونی ڕاستەقینە» بە «ژیانی ڕووت» دەدات، نەوەکو بە «بوونی ئیدیاڵ» یان «بوونی مافدار» یان «بوونی گۆردراو و بزافدار» کە تیایدا چییەتیش گۆڕدراوە.

## ٦. قەیرانی سەلەفییەت

سەلەفییەت بەدەست دوو کێشەی گەورەوە دەناڵێنێت: یەکەمیان/ سەلەفییەت بەردەوام خوازیاری ئەوەیە خۆی لە سەردەمە تازەکاندا دووبارەبکاتەوە و هەرگیزیش دەستبەرداری ئەو ئارەزووە نابێت. دووەمیش/ سەلەفییەت لە بەرامبەر پرسیار و کێشەکانی ئەمڕۆدا هیچی دیاریکراوی نییە بیڵێت، وە لە قەیرانی ئەوەدا دەژی کە وەڵامی کێشە مەعریفی و شارستانی و فیکرییەکانی ئەم ساتەی بۆ نادرێتەوە. بە دەستێکی خاڵییەوە لە هەموو کەرەستەیەکی مەعریفی دێتە ناو سەردەمە تازەکانەوە، بەڵام سوورە لەسەر ئامادەبوون، یان لەبەر نەبوونی ئەلتەرناتیڤێکی تازەگەرانە تەواو ڕێگاکەی بۆ کراوەتەوە، بەڵام بێگومان بە بەرگی تازەوە خۆی دەکات بەناو سەردەمە نوێکاندا، دەمامکی بیست ساڵ لەمەوبەر دەگۆڕێت و دەمامکێکی نوێ لەسەردەکات، بەهەندێ زاراوە و چەمکی بچوکی مۆدێرنزمی خۆرئاوا و تازەگەریی عەرەبییەوە بە خۆیەوە دەنازێت و خۆی دەڕازێنێتەوە. سەلەفییەت لە بەرامبەری دونیای

ئێمەدا هیچی نییە بیڵێت، لە مێژیشدە لەناو کەلاوە مەعریفیەکانی خۆیدا، بابەتی مردوو، شیعری مردوو، گووتاری مردوو دووبارەدەکاتەوە، بەڵام ئەمڕۆ توانای سەلەفییەت بەجۆرێکی تر دەردەکەوێت... لەو شێوە قاڵب و فۆرمانەدا بەرجەستەدەبێت کە بۆ ئەو هیچ نەوتنەوەی دەدۆزێتەوە. لۆژیکی «سەلەفیەتی نوێ کوردی» لەیەک ڕستەدا چڕدەبێتەوە، ئەویش بریتییە لە «هیچ نەوتن بەشێوەیەکی دیاریکراو، یان بەچەند شێوەیەکی دیاریکراو». واتە دۆزینەوەی فۆرمێک بۆ بێبەرهەمی، فۆرمێک بۆ نەزانین، فۆرمێک بۆ دابڕان لە بیرکردنەوە.

ئەگەر سەرنجبدەین، بەدرێژایی پەنجا ساڵی ڕابردوو، ئەو جووڵاندنەوانەی بە تازەگەریی ناوبراون، زنجیرەیەکی یەک لەدوای یەکی گۆڕان بوون لە شێوە و فۆرمدا «لە شیعری پەنجەوە بۆ فۆرمی ڕوانگە بۆ فۆرمی شیعری ئەمڕۆ... گۆڕانەکانی ناو فۆرم لە هونەری شێوەکاری، شانۆ و چیرۆکدا» دەرکەوتەی جیاوازی جەوهەرێکی نەگۆڕن «جەهەری سەلەفییەت» کە جگە لە گۆڕانکاریی فۆرم توانای گۆڕانکاریی دیکەی نییە... سەلەفییەت «وەکو تازەگەر داندییەکانی بۆدلێر» شێوەکانی خۆی دەگۆڕێت، بەڵام توانای گۆڕینی ماناکانی نییە. «هیچ نەوتن» جەوهەری سەلەفییەتە لە ئاستی مەعریفیدا، « فۆرم و شێوەکانیش» گەمەی سەلەفییەتن بۆ شاردنەوەی ئەو هیچ نەوتنە. یاریکردن تەنیا بە فۆرم، وە ناونانی ئەم یارییە بە تازەگەریی لەحوکمی تێکشکاندنی تازەگەرییدایە و وەک دەردێکی تاعوونی وایە بۆ هەر پرۆژەیەکی ڕاستەقینە کە بیەوێت دونیا یان پێکهاتی مەعریفی بگۆڕێت... ئەمڕۆ ئەو یارییە لەژێر ناوی «شێوەخوازی ـ فۆرمالیزم» دا دووبارەدەبێتەوە. فۆرمالیزم بەمانا تەقلیدییەکانی خۆی، دەتوانێت دەرگا بۆ سەلەفییەتی ئێمە بکاتەوە تا لە ڕێگایەوە تازەگەریی بگۆڕێت بۆ کێشەیەکی تایبەت بە فۆرم. فۆرمالیزم لە واقعی ڕۆشنبیری ئێمەدا، بەپێچەوانەی ڕۆڵی خۆیەوە لە واقعی ڕۆشنبیریی خۆرئاوادا، ڕۆڵێکی موحافەزەتکارانە دەبینێت، دەبێت بە دەمامکێکی تازە. گەرانە بۆ سەلەفییەتێک کە دەیەوێت قەیرانی خۆی لە شێوەکانی

قەیرانی تازەگەرییدا بخاتەڕوو، مایەپووچیی خۆی لە شێوەی مایەپووچیی تازەگەرییدا بەرجەستەبکات، هیچ نەوتنی خۆشی بکات بە هیچ نەوتنی تازەگەریی.

لێرەوە، لەڕوانگەی ئەو هۆکارانەی سەرەوە، دەتوانین بڵێین، لەناو ئەو بونیادەی ئێستای ڕۆشنبیریی کوردیدا و لەڕێگای ئەوەوە ناتوانرێت ئاسان مانایەکی دیاریکراو بە تازەگەریی بدرێت، بەڵکو لەو ساتەوەی کە تازەگەریی لەدوای شوناسێک بۆ خۆی و بۆ پرۆژەکەی دەگەڕێت، دەکەوێتە ناو تۆڕێکەوە لە تازەگەریی وەهمی کە هەر خودی سیستم یان بونیادەکە بەرهەمیاندەهێنێت، بەم پێیە، تازەگەر بۆ ئەوەی بوونێکی کاریگەریی هەبێت، دەبێت لە شەڕە قورسەکانەوە دەستپێبکات، شەڕی گەورەی هەموو تازەکردنەوەیەکیش لە ئاشکراکردن و خوێندنەوەی سەرجەمی بونیادەکەی خۆیەوە دەستپێدەکات، تازەگەر بەم مانایە دەبێت لە کۆی بونیادەکە داببڕێت، دابڕانیش لێرەدا بە مانای گۆشەگیری نایەت و مانای بێئاگایی ناگەیەنێت، بەڵکو جۆرێکە لە جیابوونەوەی هوشیار لە پێکهاتەیەک کە وەڵامی پرسیارەکانی ئەوی پێ نییە. لەبەر ئەوە تازەگەر بۆچوونی خۆی لە بۆچوونی پێش خۆی داناتاشێت، بەڵکو خۆی بیردۆزی خۆی دادەنێت و خۆشی هەوڵدەدات بیسەلمێنێت، بەڵام بەر لەوەی بتوانێت بە دروستی بەو کارە هەستێت، پێویستە دیدێکی تەواوی سەبارەت بە کۆی ئەو بونیادە هەبێت. ئەمڕۆ ئێمە لەو قۆناغەداین، قۆناغی دارشتنی تێگەیشتنێکی کۆ و گشتی بۆ سیستمەکانی ناو ڕۆشنبیریی کوردی و جومگە گرنگ و شادەمارە سەرەکییەکانی. تێگەیشتنیش لە زنجیرە گووتارەکان، یەکێکە لەڕێگاکانی تێگەیشتن لە سیستمی کارکردن و بەرهەمهێنان لەڕۆشنبیریی ئێمەدا، کە دەروازەیەکی سەرەکی خوێندنەوەی ئەو بونیادەیە کە دەمانەوێت تێیبگەین.

## مانای «نادیار» و ڕۆڵی لە تێگەیشتن لە مانای تازەگەرییدا

ئەگەر وەکو دەستنیشانکردنێکی سەرەتایی باوەڕمان بەوە هەبێ کە «نادیار» ئەو زەمینەیەیە کە دەبێت تیایدا بۆ ماناکانی تازەگەریی بگەڕێین، ئەوا دەبێت بەوردی لە ماناکانی نادیار خۆی تێبگەین.

نادیار بەوەدا کە جیهانێکە خەسڵەتی شتەکان تیایدا دیار نییە، شەوەزەنگێکە ناتوانین لە پشتییەوە «دیار» ببینین و بیخوێنینەوە و دەستنیشانیبکەین، جێگایەکە کاراکتەری شتەکان تیایدا ونە، لەبەر ئەوە دیاریکردنی شوناسی مەعریفی نادیار کارێکی ئاسان نییە.

نادیار شوێنێکی تاریکە، سنووری ماناکان تیایدا تێکەڵاوە، سنووری دیاردەکان و کایەکان تیایدا ونە، سنووری ئاشکرابوونی جیهان تیایدا سفرە، لێرەوە بازدان بۆ نادیار لەڕاستیدا بازدانە بۆ ناو تاریکی، بازدانە بۆ ناو موعەمایەکی گەورە.

نادیار تاریکییەکی مەعریفییە، تازەگەرییش ڕووناککردنەوەی ئەو تاریکییەیە، نەوەکو گواستنەوەی بێت بەهەموو تاریکی خۆیەوە بۆ ناو دەقێک.

نادیار شوێنی ئەو مانایانەیە کە پێویستە وە دەشێت ڕۆشنبیرییەک لە بەرەوپێشچوونی خۆیدا ئاشکرایبکات. تازەگەرییش خستنەگەڕی زمانە بۆ هەڵکۆڵین لەناو نادیاردا، نەوەکو بۆ ئاڵۆزکردنی جیهان، ئاڵۆزییەک کە هیچ پەیوەندییەکی  بە ئاڵۆزیی تازەگەرییەوە نەبێت.

سەلەفییەتی نوێ ئەمڕۆ جۆرێک لە ئاڵۆزی و تەمومژ دروستدەکات کە ڕەنگدانەوەی تێنەگەیشتنە لە «ئاڵۆزیی جیهان و ئاڵۆزیی زمان و ئاڵۆزیی فیکر». بۆ نمونە: شیعری فۆرمالیستی ئەمڕۆی کوردی ـ بەو دوورکەوتنە گەورەیەی لە مانا ئەوە دەسەلمێنێ کە لەناو نادیاردا ناسوڕێینەوە، بەڵکو

ئاڵۆزیی شیعری فۆرمالیستی نوێ ڕەنگدانەوەی تێنەگەیشتنی سەلەفییەتی هاوچەرخە لە ئاڵۆزیی جیهان.

تازەگەریی دەرخستنی نادیارە، ئەوەش بەمانای گەشتێکی ڕوناککردنەوە دێت بەناو ئاڵۆزیدا، نەوەکو بەمانای تاریککردنی وەهمیانەی ڕووبەرە بینراو و سادەکان. ستراتیژی سەلەفییەتی نوێ، تاریککردنی پانتاییە تەقلیدی و بینراو و دیارەکانە، لەکاتێکدا ستراتیژی تازەگەریی ئاشکراکردنی ئاڵۆزییەکانە «هەتا ئەگەر لەڕێگای زمان و فۆرمی ئاڵۆزیشەوە بێت»

نادیار نیشتەجێی مانایە، زەمەنی داهاتووی مانایە، سەلەفییەتیش هەڵهاتنێکی بەردەوامە لە مانا، لە بیرکردنەوەی بەرهەمهێن، لە ناوەڕۆکی پڕ، لەبەرئەوە یەکێک لە مەبەستە سەرەکییەکانی ئەو ڕێبازە تەقلیدیانەی ئەمڕۆی ڕۆشنبیریی کوردی، خولقاندنی وێنەیەکە دەربارەی نادیار وەک بەرهەمهێنی هەموو نوسین و دەقێکی بێمانا.

جا بۆ ئەوەی زیاتر لە نادیار و تازەگەریی و سیماکانی سەلەفییەتی نوێ تێبگەین، پەنادەبەمە بەر هەردوو زاراوەی «بوون بە زەبر» و «بوون بە ڕاستی» ی ئەرستۆییانە، «شت لە خۆیدا» و «شت بۆ ئێمە»ی کانتیانە.

نادیار، بەپێی ئەو مانایەی کە لەسەرەوە دەستنیشانمانکرد، «بوونێکە بە زەبر»، نەوەکو «بوونێک بێت بەڕاستی»، بوونێکە لە خۆیدا و تەنیا بۆ خۆشی هەیە، واتە بوونێک نییە بۆ دەرەوە، بەڵکو تەلیسم و تاریکییەکە کە نابڕدرێت. نادیار پارچەیەکی یەکگرتووی تاریکە، مانای دیاری نییە، تخوبی دیاری نییە، شوناسی دیاری نییە. بەوەدا کە ڕۆشنبیریی کوردی نەیتوانیوە دەروازەیەک بۆ چوونە ناو نادیارەوە دیاریبکات، کەواتە چوونە ناو نادیارەوە لە هەر گۆشەیەکەوە بێت، یەک مانای هەیە و یەک ناوی لێدەنرێت و یەک بایەخی پێدەدرێت. بەڵام بابزانین چۆن دەتوانین شێوە جیاوازەکانی ئەو دوو نزیکبوونەوەیە لە نادیار لەیەکدی جیابکەینەوە.

١ـ ئەگەر نادیار لەڕاستیدا بوونێک بێت بەزەبر، ئەوا دەقی تازەگەر گۆڕینی ئەو جیهانەیە بەرەو بوونێک بەڕاستی. هەرکاتێک دەقی تازەگەر توانی بوون بەزەبر بگوازێتەوە بۆ بوونێک بەڕاستی، لەهەمان کاتدا دەتوانێت نزیکبووبێتەوە، یان هەنگاوێکی نابێت بۆ هێنانەدی ستراتیژی خۆی، بەڵام کە دەقێک بهێنێتە بەرهەم کە بوونی ئەویش هەر بوونێک بێت بەزەبر... ماناکانی هەر لە نادیاردابن، فۆڕمەکان هەر لە تاریکیدابن، ڕستەکانی هەر ڕستەی هیولایی ناجێگیربن، وێنەی دنیا وێنەی فەوزا ـ کایوسێکی دەستنیشان نەکراوبێت، لەم کاتەدا ئیدی «دەق» فراوانکردنی ڕووبەری نادیارە، نەوەکو بچوککردنەوەی ئەو ڕووبەرە بێت... «دەق» دروستکردنی نادیارێکی دەستکردە کە دەبێتە درێژکراوەی وەهمی و درۆزنانەی نادیاری ڕاستەقینە. لەم ئاستەدا نوسین وەستانە لە سنووری وێناکردنی نادیاردا و هیچی دیکە.

٢ـ ئەگەر نادیار خۆی «شت بێت لە خۆیدا» ئەوا دەقی تازەگەر بەم مانایە «شتە بۆ ئێمە»، لێرەوە لە دەقی سەلەفییدا «نادیار» کە بوونێکە لەخۆیدا، هەر لەسەر جەوهەری خۆی دەمێنێتەوە و نابێت بە «بوونێک بۆ ئێمە». تازەگەریی ڕاستەقینە ئەو هەنگاوەیە، هەنگاوی گواستنەوە لە «بوون لەخۆیدا» بەرەو «بوون بۆ ئێمە». سەلەفییەتی نوێ بەو تەمومژ و تەمتومانە دەستکردەی بە چواردەوری خۆیدا کێشاویێتی، نەوەک بەتەنیا ڕووبەرە نادیار و داخراوەکان لەناو خۆیدا جێدەهێڵێت، بەڵکو ڕووبەرەکانی «دیار»یش دەگێڕێتەوە بۆ حاڵەتی «شت لە خۆیدا» و کۆی تازەگەرییش لە پرۆسەیەکەوە کە دەیەوێت جیهان بگۆڕێت بۆ «جیهانێک بۆ ئێمە» دەگۆڕێت بۆ پرۆسەیەک کە دەیەوێت جیهان بکاتەوە بە جیهانێک لەخۆیدا و بۆ هەتاهەتایە داخراو بە سەر خۆیدا.

## بونیادی «دیار» و ڕۆڵی لە شێواندنی مانای تازەگەریدا

تەنیا نادیار نییە کە ماناکانی تازەگەرییمان لێدەشێوێنێت، بەڵکو پرۆسە ناوەکییەکانی ناو بونیادی دیاریش هەمان کێشە دەخەنەوە، دیاریش کۆمەڵێک گرفتی گەورە بۆ ماناکانی تازەگەریی دەخولقێنێت.

مەبەستمان لە «دیار» سەرجەمی ڕووبەرە دۆزراوەکانە، سەرجەم ئەو پانتاییانەیە کە ئێستا ئاشکرایە و لەڕووە و لە کاردایە، دیار بەم مانایەش کۆی سیستمی بەرهەمهاتووی فیکری ئێمەیە، دەقە نوسراوەکانمانە، شێوازە باوەکانی بیرکردنەوەمانە، بابەتە سەرەکییەکانمانە، ئەو گووتارانەشە کە لەوانەوە بەرهەمدێن. تازەگەرییش جووڵاندنەوەیە بە پێچەوانەی ئاڕاستەی دیار، دوورکەوتنەوەیە لە دەقە باوەکان، جێهێشتنی شێوازە کۆن و ئاشکراکانە، لەدایکبوونی جۆرێکە لە نوسین و هوشیاری و تێڕوانین کە لەناو دیاردا ئاسەوار و ڕێگەی نییە. تازەگەریی کردەیەکە بۆ تێگەیشتن و جێهێشتنی دیار.

دیار وەک سیستمێک هەرگیز لەکارناکەوێت و ئاوانابێت، بەردەوامیش دەق و نوسین و گووتار فڕێدەداتە ناو بوارە جیاجیاکانەوە. لێرەدا گرفتی سەرەکی ئەوەیە، چۆن دەقە هاوچەرخەکانی دیار لە دەقی تازەگەریی جیابکەینەوە، لەکاتێکدا وەکو لەڕۆشنبیریی کوردیدا دەبینین، هەموو شێوەکانی دەق مافی ئەوە دەدەن بەخۆیان، بەخۆیان بڵێن تازەگەر. بۆ ئاسانکردنی ئەم وەڵامە، ئەوە دەخەمە پێشچاو کە دیار خۆی لەخۆیدا لە چەند ئاستێک دروستبووە: دیار لەڕووبەرێکیدا ئەو پانتاییەیە کە ئێستا هەیە و نوسراوە و دۆزراوەیە و خوێنراوەیە و پێی دەڵێین «ئاشکرا». «ئاشکرا» ڕابوردووی «دیار»ـە، بەرهەمەکانێتی، سەرکەوتن و قەیرانەکانێتی، دینامیکییەت و لەکارکەوتنێتی. لە بەرامبەر ئاشکراشدا ئاستێکی

تر هەیە، ئاستێکە دەیەوێت بیسەلمێنێ کە دیار بونیادێک نییە ئاوابووبێت، بوونێک نییە لە سنووری کاری خۆیدا ئاسۆی دیکەی نەبێت، ئەو ئاستەش بە «نائاشکرا» ناودەبەم. بە مانایەکی تر ئاشکرا ئەو دەق و نوسراو و گووتارانەیە کە تائەمڕۆ لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا بەرهەمهاتوون، بەڵام نائاشکرا ئەو دەق و نوسراو و گووتارانەیە کە لەداهاتوودا لە چوارچێوەی هەمان سیستم و بە هەمان عەقڵییەت بەرهەمدەهێنرێنەوە.

«نائاشکرا» کارکردنی بونیادێکە کە پێشتر چەندەها دەقی خستۆتە بەردەست، بەڵام لە ئاسۆی کارکردنی خۆیدا کۆمەڵێک دەق و نوسینی تر هەیە کە تا ئەم کاتە پێینەگەیشتووە و بەڵام پێیدەگات. بەم مانایە نائاشکرا گەیشتنی جووڵانەوەی ڕۆشنبیریی تەقلیدییە بە ئاستێکی دیکە، کە لەم ئاستەشدا هەمان یاسا و بونیاد و بابەتی دێرینە کاردەکەن. نائاشکرا هەر لەسەر هەمان هێڵی ئاشکرایە، بەڵام چەند خاڵێکە لەسەر ئەو هێڵە کە تا ئەو کاتە ئاشکرا پێینەگەیشتووە، هەر دووبارەکردنەوەی ئاشکرایە، بەڵام لە کاتێکی تر و لە هەلومەرجێکی تردا. لێرەدا زۆرجار تێکەڵاوکردنێکی کوشندە لەنێوان نادیار لەلایەک و نائاشکرادا لەلایەکی دیکە دروستدەبێت. نائاشکرا هەمان پێکهاتەی ئەدەبی و فیکریی ئێستایە بێگۆڕان لە بەرگی تر و لە ساتی تردا دەردەکەوێتەوە، بەڵام نادیار جیابوونەوەیە لەو پێکهاتەیە. زۆرکەس گۆڕانکارییەکی چکۆلانەی شێواز وا نیشاندەدەن کە بەدیارکەوتنی نادیارە، بەڵام لەڕاستیدا ئەوە دەرکەوتنی نائاشکرایە. وەک دەبینن لێرەدا هەوڵدەدەم جیاکارییەکی دیکە بکەم لە نێوان هەردوو زاراوەی «*دیارکەوتن*»، کە مەبەستم لە پرۆسەی گواستنەوەی «نادیار»ـە بۆ «دیار» خۆی، وە زاراوەی «*دەرکەوتن*» دا، کە مەبەستم گواستنەوەی «نائاشکرا» یە بۆ «ئاشکرا»... «دیارکەوتن» پرۆسەیەکە پابەندە بە تازەگەریی و میکانیزمی تازەکردنەوەوە، «دەرکەوتن»یش پرۆسەیەکە پابەندە بە جووڵانەوەی ناو بونیادە تەقلیدی و دێرینەکە. نائاشکرا لەتەک ئاسۆی دیاردا تەبادێتەوە و هەمان بونیادی هەیە، کەچی نادیار جیابوونەوەیەکی تەواوەتییە لەو

ئاسۆیە، بەڵام کۆی ئەو فاکتەرانەی لەمەوپێش ئاشکرامانکرد دەبێتە مایەی زەمینەخۆشکردن بۆ تێکەڵکردنی هەر دوو پرۆسەی جیاواز و دژبەیەکی نادیار و نائاشکرا بەیەکتر... کە بێگومان لەپشت ئەو تێکەڵکردنەشەوە سەلەفییەتی نوێ هەوڵدەدات جووڵاندنەوە بچوکەکانی ناو پێکهاتە و بونیادی خۆی لەژێر ناوی تازەگەرییدا ناونوسبکات، تا ئەم دەقیقەیەش ئەو پرۆسەیەی بەسەرکەوتنێکی گەورەوە ئەنجامداوە.

لەکاتێکدا دەکرێت بەئاسانی هەریەک لە «نائاشکرا» و «نادیار» لە یەکدی جیابکەینەوە:

١- «نائاشکرا» کاراکتەرێکی هەیە، سیستمێکی خەسڵەتی پێشینەی هەیە کە «نادیار» نییەتی، واتە قاڵبێکی پێشینەی هەیە کە لەخۆی دەگرێت، ونبوونی ئەو قاڵبەش لەدیدی ئێمەدا و لە هوشیاریماندا، دەبێتە مایەی دروستبوونی ئەو گرفتە سەبارەت بە جیاکردنەوەی نائاشکرا لە نادیار.

٢- «نائاشکرا» کۆی ئەو ئەگەرانەیە کە لەپێشدەم رۆشنبیرییەکدا هەیە بۆ خۆدووبارەکردنەوە، «نادیار»یش کۆی ئەو ئەگەرانەیە کە لەپێشدەم رۆشنبیرییەکدا هەیە بۆ خۆنوێکردنەوە.

## سروشتی پەیوەندیی لە نێوان «دیار» و «نادیار»دا

یەکێک لە هەڵە گەورەکان ئەوەیە کە «نادیار» و «دیار» وەکو دوو رووبەری لەیەکدی جیا و جیاواز سەیربکەین، واتە نادیار بە قەوارەیەک لە قەڵەمبدەین کە وەک یەکەیەکی یەکگرتوو دەکەوێتە دەرەوەی دیارەوە، دیاریش وەک بونیادێکی یەکگرتوو سەیربکەین کە دوورە لە نادیار و دوورە لە پانتایی و لۆچ و چەمکەکانی.

لەڕاستیدا نەخشەی پەیوەندییەکانی دیار و نادیار دابەشبوونێکی سفت نییە، دابەشبوونێک نییە هەریەکەیان دوو رووبەری یەکسانیان

داگیرکردبێت، دوو ڕووبەری داخراو کە تیایدا نادیار ناگاتەوە بە دیار و دیار دوورە لە نادیار... لێرەدا جارێکی تر دەبێت بەشێوەیەکی قووڵتر سەیری بونیادی ئەم دوو یەکە گرنگ و پێچەوانەیە بکەین. نادیار تەنیا ئەو شتانە لەخۆناگرێت کە نین و ئامادەنین و بەتاڵن و بێوەڵامن، بەڵکو هەموو ئەو شتانەشە کە دەربارەی دیار نایانزانین. بەمجۆرە یەکێک لە پرۆسە گەورەکانی تازەگەریی ئەوەیە هەموو نهێنی و مانا و ئاڵۆزییەکانی دیاریش ئاشکرابکات، ئەو ڕاستیانە بخاتەڕوو کە دەربارەی دیار نایانزانین. لەڕاستیدا ئێمە لە بەرامبەر دوو ئاستی جیاوازی نادیاردا ڕادەوەستین، نادیاریش وەکو دیار لە دوو ئاستدا دەردەکەوێت کە سەرچاوەی هەریەکەیان جیاوازە. ئاستی یەکەم: تەواو پابەندی دیارە و بە «نادیاری دیار» ناویدەبەین. ئاستی دووەم: جۆرێکی ترە لە نادیار کە ڕەهایە، لەو شوێنانەدایە کە تا ئێستا دیار نەیتوانیوە گووتارێکی تێدا پیادەبکات، بۆشاییەکی ڕەهای لە دەوری خۆی جێهێشتووە و بە «نادیاری ڕەها» یان «نادیاری سەربەخۆ» ناویدەبەین .

ئێستا دەتوانین پرۆسەی پەیوەندییەکان بەمجۆرە دابڕێژینەوە: نادیار دوو ئاستی جیاوازی هەیە، یەکێکیان تەواو پابەندی دیارە، واتە کۆی ئەو زانیاری و مەعریفە پێویستەیە کە دەربارەی دەقەکان و فەرهەنگەکەمان و دونیا پێدراوەکەمان نایزانین، نهێنی ئەو تێکستانەیە کە بوون بە کلاسیک و هێشتا خوێندنەوەی وردیان بۆ نەکراوە، تیوریزەکردنی ئەو ئەدەبیات و تێفکرینە جیاوازانەیە کە هاتوون و ڕۆیشتوون و تا ئەمڕۆ نەخوێندراونەتەوە. ئەوی دیکەیان پابەندی ئەو ڕووبەرانەیە کە کۆی سیستمە ڕۆشنبیرییەکە دەستی پێدا ڕانەگەیشتووە. تازەگەریی بریتییە لە جووڵاندنەوەیەکی بەردەوام بۆ ئەو دوو نادیارە و گەڕانەوەیە بۆ ناو دیار، هەموو پانتاییەکی ڕاستەقینەش کە دێتە ناو دیارەوە، لەپاڵ خۆیدا ڕووبەرێکی تازەی نادیار دەخوڵقێنێ... تازەگەریی ڕوناککردنەوەی نادیارە، بەرەنجامی ئەو ڕوناککردنەوەیەش گەورەبوونی پانتاییەکانی دیارە، دیاریش لەژێر ڕووکەشە ئاشکرا و جێگیر و بەرقەرارەکەی خۆیەوە،

چەندەها نادیاری تر دەخولقێنێ کە بە نادیاری تایبەتی خۆی لەقەڵەمدەدرێت، نادیار ئاشکرابوونی پانتاییەکە کە بونیاد و وەزیفە و شوێن و کەرەستە و مانا و ئایدۆلۆژیا و ستراتیژی... هتد، هێشتا هەمووی نوقمی تێنەگەیشتن و ئاڵۆزی و تاریکییە.

چەندێ زیاتر ئاستە نادیارەکانی دیار ببڕین، وە چەندێ تێگەیشتن لە دیار بەرفراوانتربکەین، مەودامان زیاتر بۆ دەکرێتەوە بۆ دەرچوون لە باڵادەستی سیستمی دیار، واتە سیستمی تەقلیدیی. تەنیا بەبچوککردنەوە و شکاندنی بەردەوامی «نادیاری دیار» و ڕوونبوونەوەی دەتوانرێت عەقڵێکی چاوەدێر دروستبێت یان بەرزەمنێکی مەعریفی «الانا العليا المعرفى» دروستبێت کە کۆنترۆڵی سیستمی دیار لاوازبکات و سنووری بۆ دابنێت. مەرجی یەکەمی تازەگەریی شکاندنی ئەو پێکهاتە عەقڵییە و گۆڕینی جڵەوی ئەو سیستمەیە کە دیار دروستیکردووە، ئەو سیستمەی کە دیار لەڕێگایەوە شێوازێکی تێڕوانین دەخوڵقێنێ، بەبێ دۆزینەوەی نهێنییەکانی دیار ئەستەمە بتوانین ئاڕاستەیەکی تازەگەرانە بەرەو ڕووی نادیار وەربگرین. چوونە ناو نادیاری ڕەهاوە بەبێ بوونی هوشیاریی تەواو سەبارەت بە دیار و بونیادەکەی، ڕۆچوونێکی تەقلیدییە کە هەمان سیستمی دیار جڵەویدەکات. ئەمەش یەکێک لەمانا جەوهەری و تازەکانی تازەگەرییمان بۆ ئاشکرادەکات کە بریتییە لەوەی: تازەگەریی وەکو سیستمێکی ئەلتەرناتیف تەنیا لەپاش دیاریکردنی جەوهەری سیستمی مەعریفی باڵادەست دێتە دونیاوە، نەوەکو لە تەنیشت ئەو سیستمە و جودا لەو سیستمە .

تازەگەریی هەرگیز تازەگەریی نییە ئەگەر نەزانێت بەراورد بە چ شتێک تازەگەرە، تازەگەریش هەرگیز تازەگەر نییە ئەگەر خەرمانێک زانیاری نوێمان نەداتێ دەربارەی دیاردە و بیرکردنەوە و دەقە تێپەڕێنراوەکان، هەرگیز تازەگەر نییە ئەگەر خوێندنەوەیەکی نەبێت بۆ ڕابوردوو وە ناساندنێکی نەبێت بۆ ئەو ڕابوردووە.

بەڵام لەم ئاستەدا گەلێ پرسیاری دیکە دێنەپێشێ. ئاشکرایە دیار لە گەلێک دەق و بەش و چەمک و گوتار و کایە و نیمچەکایە پێکدێت، هەریەک لەم بەشانەش دەرکەوتەیەکی دیاری هەیە و لەدوای خۆیەوە لە نادیاردا جێکەوتەیەکی هەیە. ئاخۆ بەم مانایە تازەگەریی پرۆسەی کارکردنە لەسەر ئەو ژمارە بێشومارە لە نوسین کە زۆربەی هەرە زۆریان دەقی مردوو، تێئاخنراو، بەزۆر نوسراون و بەردەوام بونیادەکە ستون و بۆشایی و لاپەڕەی گۆڤارەکانیان پێپڕدەکاتەوە... بەم مانایە تازەگەریی جۆرێکە لە خۆگێژکردن و سەفەری بێسەرەتا، بێکۆتایی و بێئامانج بەناو ئەرشیفێکدا کە برێکی گەورەی بەرهەمەکانی دەتوانرێت لەژێر خانەی «ئەدەبیاتی زبڵ» دا پۆلێنبکرێت. بێگومان تازەگەریی لە ئاستێکدا ناچارە مامەڵە لەگەڵ ئەو ئەرشیفەدا بکات، بەڵام دوای ئەوەی بەئاشکرا مەبەستەکانی ئەو جۆرە مامەڵەیە دیاریدەکات... بەڵام بەگشتی تازەگەریی لەدوای ئامانجێکی گەورەتر و گشتیتر دەگەڕێت. تازەگەریی بۆیە پۆلێنکردنی بەشە جیاجیاکانی دیاری بەلاوە گرنگە، تا خۆی لێجیابکاتەوە، وە بەپێچەوانەشەوە خوێندنەوەی جیاکارییانەی بەشەکانی دیار، واتە ئەو خوێندنەوەیەی کە گەوهەر و ناوەڕۆکی دیار بۆ دەرکەوتە پچوکەکانی فەرامۆشدەکات، لەبری ئەوەی کرۆکی دژە مەعریفیانەی دیارمان بۆ ئاشکرابکات، لەوانەیە تووشی هەڵەی دیکەمان بکات. خوێندنەوەی دیار لە خوێندنەوەی کۆی ئەو پێکهاتەدایە کە دیار خوڵقاندویێتی، واتە سەرەتای تازەگەریی ئەو ساتەیە کە دەتوانین کۆی بونیادەکە ببینین، تازەگەریی خوێندنەوەی کۆیە نەوەکو خوێندنەوەی جیاجیای بەشەکان. ئەگەر خوێندنەوەی بەشەکانیش لە چەند ئاستێکدا پیادەبکرێت، دەبێت هاوڕێ بێت بەهەستکردنێکی گشتی بە کۆوە بەبەستنەوەی ئەو خوێندنەوەیەوە بە کۆوە. تازەگەریی دۆزینەوەی بونیادی دەقێک نییە، بەڵکو دۆزینەوەی بونیادی ڕۆشنبیرییەکە، تازەگەریی پرسیار نییە لە دەقێک، بەڵکو پرسیارە لەسەرجەمی ڕۆشنبیرییەک، دەرهێنانی پەیوەندیی ڕەگەزەکانی ناو دەقێک نییە بەیەکەوە، بەڵکو دۆزینەوەی یاسای بەیەکەوە گرێدان و جیابوونەوەی

دەقەکانە، تازەگەریی ئاشکرابوونی دەقێک نییە، هێندەی ئاشکرابوونی کاری ڕۆشنبیرییەکە بەگشتی و ئاشکرابوونی پەیوەندیی دەقێکە بەو کۆیەوە.

بەڵام لۆژیکی کارکردن لەگەڵ کۆدا، جیاوازە لە لۆژیکی کارکردن لەگەڵ بەشەکاندا، چونکە دیار وەکو چەند بەشێک جیاوازە لە دیار وەکو کۆ «لە ڕاستیشدا ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵێکە بۆ خوێندنەوەی«دیار وەکو کۆ» چونکە بەپێچەوانەوە دەمانتوانی هەر دەقێکی ناو ئەم سیستمەی ئەمڕۆ بگرین و لەسەری قسەبکەین و ئەمەش بۆ خۆی ڕوانگەیەکی تایبەتی پێدەبەخشین دەربارەی کۆی سیستمەکە، بەڵام بەدڵنیاییەوە ڕوانگەیەکی بەرتەسک کەبەرتەقای تێگەیشتن نەدەبوو لە زۆر لە میکانیزمەکانی نێو سیستمەکە» . بێگومان نادیاری بەشە بچووکەکانیش جیاوازە لە نادیاری کۆ، نادیاری دەقێک جیاوازە لە نادیاری بونیادێکی ڕۆشنبیریی، نادیاری ناو کایەیەک جیاوازە لە نادیاری گشتیی فەرهەنگێک. ئەگەر تازەگەریی کارکردن بێت لەناو بەشە جیاجیاکانی دیاردا، ئەوا هەر دۆزینەوەیەکی سنووردار و دیاریکراو لە وتارێکی ڕەخنەییدا سەبارەت بەدەقێک دەبێتە تازەگەریی، زیادکردنی دەقێک بۆ کایەیەک، کردنەوەی کایەیەک بەدەقێک دەبێتە تازەگەریی، چونکە بەم مانایە شتێکی نوێمان هێناوەتە کایەوە. لێرەوە کاری تازەگەریی دەبێتە کاری پڕکردنەوەی کایە نەدۆزراوەکان، یاخود خانەی بەتاڵی هەندێک کایەی مەعریفی... ئاشکرایە ئەمجۆرە تازەگەرییە تا چ ئەندازەیەک سنووردارە، تازەگەرییەکە بەر هەندێک جێگا دەکەوێت، بەر هەندێک دەق دەکەوێت، بەر هەندێک کایە دەکەوێت و سەرجەمی بوارە ڕۆشنبیرییەکانی دیکە بێبەش دەمێننەوە.

تازەگەریی کە دێت بەر جەوهەری میکانیزمی کاری کایەکان دەکەوێت، بەر هەموو کونج و کەلەبەر و بونیادە ڕۆشنبیرییەکان دەکەوێت، دۆزینەوەی کۆی یاساکانی نوسین و کۆی یاساکانی نەنوسینە، دۆزینەوەی ئەو یاسایانەیە کە وادەکات ڕۆشنبیریی کوردی لە هەندێک بواردا بەرهەمهێن بێت و لەهەندێ بواری دیکەدا بوەستێت و بەرهەمی نەبێت.

تازەگەریی بەتەنیا لە شیعرێکەوە، لە لێکۆڵینەوەیەکەوە سەرهەڵنادات، بەڵکو لەو جومگە و کەناڵە مەعریفییانەوە سەرهەڵدەدات کە هەر گووتارێک، شیعرێک، لێکۆڵینەوەیەک دەبەستێتەوە بە سەرجەمی عەقڵییەتێکی رۆشنبیرییەوە.

تازەگەریی کوردی یاخود لەدایکنابێت، یان جۆرێک دەبێت لە «کۆ بینین». بەڵام ئاخۆ لە ئێستای رۆشنبیریی کوردیدا هیچ نیشانە و بەڵگەیەک هەیە سەبارەت بە دەرکەوتنی سیماکان یان دەلالەتەکانی نزیکبوونەوەی ئەمجۆرە تێڕوانینە سەرتاسەری و کۆییە؟

لەڕاستیدا تا ئەم ساتە رۆشنبیریی ئێمە تەنیا ئەو چاوەی هەیە کە بەشە جیاوازەکان و ڕووکەشی دەقە تاک و تەنیاکان ببینێت، بێئەوەی ئەو چوارچێوەیە ببینێت کە ئەو دەقانە کۆدەکاتەوە... هێشتا نوسینەکان بە جیا و لە کەناری تایبەتی خۆیاندا سەیردەکات، هەر لەبەر ئەوەش تا ئەم کاتە ڕەخنەگرتن لە هیچ دیاردەیەکی رۆشنبیری ناگوازرێتەوە بۆ ئەوەی ببێت بەڕەخنە لەسەرجەمی رۆشنبیریی کوردی و میکانیزم و یاساکانی بەرهەمهێنانی فیکری لەناو ئەو رۆشنبیرییەدا. تازەگەرییش گواستنەوەیە لەڕەخنەگرتن لە تایبەتەوە بەرەو ڕەخنەگرتن لە کۆ.

بەڵام هۆی ونبوونی ئەم خوێندنەوە «پان ـ رۆشنبیری» و سەرتاسەرییە چییە؟

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین «کۆبینین» و «ڕوانینی سەرتاسەری» کەرەستەی مەعریفی تایبەتی دەوێت، کەرەستەیەک بتوانێت شوناسێک بدات بەو بونیادە و چۆنێتی کارکردنی ڕەگەزە جیاوازەکانی دەستنیشانبکات و بەهای ئەو ڕەگەزانە و وەزیفەیان دیاریبکات. ئەو کەرەستە مەعریفییەش تیورە و کاری تیوریزەکردنە «لە کاری تیوریزەکردنی سنووردار و بچوکی پانتاییەکی دیاریکراوەوە تا کاری تیوریزەکردنی سەرتاسەریی». بەبێ تیورە «واتە بەبێ توانای تیوریزەکردن» ناتوانرێت ڕوانینێکی کۆبینمان لا دروستببێت. رۆشنبیریی

کوردیش ڕۆشنبیرییەکە بێتیورە و توانای تیوریزەکاریی، تیورەش تەنیا کەرەستەی مەعریفییە کە دەیسەلمێنێ فەرهەنگێک گەیشتۆتە ئاستی خوێندنەوەی خۆی و دەرککردن بەخۆی و پیاچوونەوە بەسەر خۆیدا. تیورە تەنیا کەرەستەیەکی کاریگەری ڕێکخستن و پیاچوونەوەی مەعریفییە، لێرەوە ونبوونی تیورە سەرەکیترین دیاردەی ژیانی فیکریی ئێمەیە، بەبێ تیورەش ئەستەمە جیهانبینییەک بێتەگۆڕێ کە ڕەهەندە سۆسیۆلۆژییەکانی فەرهەنگێک ئاشکرابکات. کەواتە دەبێت ڕۆشنبیریی ئێمە لە چی دروستبووبێت؟ کاتێک دەزانین هیچ یەک لە تیورە و لە جیهانبینی مەعریفی خولقێنەری جەستەی ئەم فەرهەنگە نین کە لە ناویدا دەژین، بەڵکو دوو ونن کە گەلێ نادیاری گەورەیان لەپشت خۆیانەوە جێهێشتوو. لێرەدا وەڵامەمان ئەوەیە کە فەرهەنگی ئێمە لە کۆمەڵێک زنجیرە و هێشوو و چینی جیاجیای گووتار «خیتاب ـ دیسکۆرس» دروستبووە، تائێستاش هیچ زنجیرەیەک و هیچ کۆمەڵەیەک گووتار کۆنەبۆتەوە تا بە ئاراستەیەکی مەعریفی هاوبەش ڕووە و بەرهەمهێنانی تیورەیەک یان زەمینەیەکی تیوریزەکراو بۆ چالاکی فەرهەنگییانە کاربکات. باڵادەستیی سیستمە لەیەکدی جیاکانی گووتار گەورەترین سیفەت و خەسڵەتی ئەم جیهانە ڕۆشنبیرییەیە کە ئەمڕۆ تیایدا دەژین.

بەڵام لێرەدا پێویستیمان بەوردەکارییەکی زیاتر هەیە، هیچ یەکێک لە «گووتار» و « تیورە» و «جیهانبینی» ماناکانیان بەوردی دیار نییە، ئاشکراشە کە هەریەکێ لەم سێ چەمکە لە ئێستا و پاشەڕۆژیشدا ڕۆڵێکی گرنگ لە پەرەدان بەسیستمی شیکردنەوەی ڕۆشنبیری ئێمەدا دەبینن.

ئەگەر دیار، سیستمێکی گووتار بێت... ئەوا یەکەمین «نادیاری دیار» ئەو ئاڵۆزی و تەمومژەیە کە چەمکی گووتار «خیتاب»ـی داپۆشیوە. گووتار لەڕۆشنبیریی ئێمەدا چییە و ماناکانی چین؟ وەڵامی ئەم پرسیارە سەرەتای هەر کردەیەکە کە بیەوێت لە سەرەتاوە، واتە لەڕەگەزە سەرەتاییە پێکهێنەرەکانەوە، بونیادی ڕۆشنبیریی ئێمە بخوێنێتەوە.

## گووتار «خیتاب»

بەرلەوەی هەوڵبدەین مانایەکی دیاریکراو ببەخشین بە گووتار، پێویستە هەندێ لە مانا دیاریکراوەکانی گووتارمان لەبەردەستدا بێت. «محمد عابد جابری» دوو ئاست جیادەکاتەوە لەگووتاردا. یەکەمیان: گووتار وەکو «گووتەی نوسەر». دووەمیان: گووتار وەکو خوێندنەوەی خوێنەر. خودی گووتار لای جابری بەبێ «نوسەرێک یان نێرەرێک» و بەبێ «خوێنەرێک یان وەرگرێک» نایەتەدی، جابری دەڵێت: «دەق نامەیەکە لە نوسەرەوە بۆ خوێنەر، لەبەر ئەوە گووتارە». جابری سەبارەت بە گووتاری نوسەر دەڵێت: «گووتار بەو مانایەی کە گووتەی نوسەرە... بونیادێکە لە بیروبۆچوون... هەڵگری دیدێکە، یاخود ئەو دیدەیە کە لە پێکهاتێکی ئیستیدلالیدا لە شێوەی چەند سەرەتا و ئەنجامێکدا داڕێژراوە. لێرەشدا وەک لەهەر بونیادێکی دیکەدا «بۆ نموونە: لە میعمار ـ خانووبەرە دا» دەبێت کەرەستە بەکاربهێنین «چەمکەکان ـ مفاهیم»، پەیوەندییەکی دیاریکراو لەنێوان ئەو کەرەستانەدا دروستبکەین تا ببێتە پێکهاتەیەک کە یەک ئەوی دی بگرێت «ئیستدلال یان داوەری هزر». جا مەسەلەکە مەسەلەی کەرەستەکان بێت یاخود شێوەی بیناکردنەکە بێت، دەبێت هەندێک شت هەڵبژێرین و هەندێ شتی تر فەرامۆشکەین، هەندێک لایەن ئاشکرابکەین و لەهەندێکی تر بێدەنگبین، پێشخستن و پاشخستن، گەورەکردن و بڕین پێویستە.. هتد. لەم گۆشەیەوە گووتار بۆچوونی خاوەنەکەی دەردەبڕێت و لەهەمان کاتیشدا ئاوێنەی تواناکانیشێتی بۆ بونیادنان...» «بڕوانە: الخطاب العربی المعاصر ـ دراسات تحلیلیة نقدیة ـ محمد عابد الجابری، دار الطلیعة ـ بیروت، ط٢، 1985، ل٨»

گووتاریش بەو مانایەی کە خوێندنەوەی خوێنەرە:ـ «هەمان بونیادە بۆتە بابەتی پرۆسەی بونیادنانەوە، واتە بۆتە دەقێک بۆ خوێندنەوە. پلەی هوشیاریی خوێنەریش هەرچۆنێک بێت، سەبارەت بەو کارەی پێی

هەڵدەستێت، ئەوا هەمان ئەو کارە ئەنجامدەداتەوە کە خاوەنی خیتابەکە لەکاتی بونیادنانی خیتابەکەیدا پێیهەستاوە، واتە هەندێک شت دەردەخات و لە هەندێکی تر بێدەنگدەبێت، هەندێک شت پێشدەخات و هەندێکی تر دوادەخات. بەمجۆرەش خوێنەر لە بەرهەمهێنانی دیدێکدا بەشداریدەکات..»«بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل9».

ئاشکرایە جابری گووتار وەکو «یەکەیەکی ڕاڤەیی - وحدە تاویلیة» سەیردەکات، گووتار لای جابری سەرچاوەی شتێکی ترە، دێت بۆ ئەوەی نیازێک بەرجەستەبکات و نیازێک داپۆشێت، یەکەیەکی مەبەستدارە، خوێندنەوەی گووتاریش خوێندنەوەیەکە لە دیوێکیدا مەبەستی درکاندنی گووتارە «تا لەپشت ئەو بونیادەوەی کە دەیخاتە ڕوو بونیادێکی ناواخنی یان بونیادێکی هاوشان ئاشکرابکات» «بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل10» بەمجۆرە لای جابری گووتار لە ناواخنی خۆیدا و لەپشت خۆیەوە هەڵگری مانایەکی ترە، جابری لای خۆیەوە ئەم مانایە بەمجۆرە دیاریدەکات: «ئەوەی مەبەستمانە لەم گووتارە نوێ و هاوچەرخە.. ناوەڕۆکە ئایدۆلۆژییەکەی نییە، ناوەڕۆکە مەعریفییەکەشی نییە، بەڵکو ئەوەی مەبەستمانە ئەوەیە کە هەڵگری نیشانەکانی ئەو عەقڵەیە کە بەرهەمیهێناوە. دەستنیشانکردنی ئەو نیشانانە - نیشانەکانی «ناعەقڵ - اللاعقل» - لە گووتاری عەرەبی نوێ و هاوچەرخدا لای ئێمە زۆر گرنگە »« بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو . ل 10»

دوا وتەی گرنگی جابریش سەبارەت بە گووتار، دەستنیشانکردنێتی بۆ مانای «گووتاری عەرەبی»: «مەبەست لە گووتاری عەرەبی ئەو خیتابەیە کە هزرمەندە عەرەبەکان بە زمانی عەرەبی بەرهەمیانهێناوە و لە ئاسۆیەکی عەرەبیدا بیریانکردۆتەوە» «بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل31»

لەڕاستیدا گرنگترین ڕەخنەیەک لەم ڕووەوە لە «جابری» ـی بگرین، گەورەکردنێتی بۆ چەمکی ڕاڤەیی «تاویلی» گووتار، جابری بەگشتی

«شیکردنەوەی میکانیزمی کارکردنی گووتار، جووڵاندنەوەی گووتار، دینامیکیەتی، شێوە و ساتی دەرکەوتنی، سیستمی دابەشبوون و پەرتوبڵاوبوونەوەی» فەرامۆشدەکات. جابری لەو کاتەشدا کە سیستمە گەورەکانی گووتار لە ناو پێکهاتی عەقڵی عەرەبیدا دیاریدەکات، ڕاڤەکردنێکی ئایدۆلۆژی ئەو سیستمانە ڕاڤەدەکات.. بەئەندازەیەک دەبێتە شوێنی سەرنجی زۆر لەنوسەرە عەرەبەکانیش، تەنیا بۆ نموونە ئەو سەرنجەی «علی حرب» وەردەگرین دەربارەی «جابری» کە پێیوایە خوێندنەوەی جابری «لەنێوان شیکردنەوەی ورد و گوزارەی ئایدۆلۆژیدا دێت و دەچێت، ئەو لەسەرەتاوە بەدەست ناکۆکییەکەوە دەناڵێنێ کە هەر لە سەرچاوەوە لەگەڵیایەتی و لێی جیانابێتەوە. چونکە نەیتوانیوە «شیکردنەوەی مەعریفی» و «خوێندنەوەی ئایدۆلۆژی» بەیەکەوە گرێبداتەوە»«بڕوانە محمد عابد الجابری: الطموح الی نقد معرفی للعقل العربی - علی حرب، دراسات عربیة، العدد10- اب 1980 ل 45». لەڕاستیدا زۆربەی توێژەرەوە عەرەبەکانیش دەستەوەستانن لەبەردەم دیاریکردنی هۆکانی ئەم یاریکردنە لە میتۆدی جابریدا، کە بەئاشکرا دەتوانین بیگێڕینەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە جابری بەتەواوەتی «شیکردنەوەی گووتار» دەکات بەقوربانی «شیکردنەوەی فیکریی». وە نهێنی دۆزی ئایدۆلۆژی لای جابری دەگەڕێتەوە بۆ گەورەبوونی ئەو جۆرە لە شیکردنەوە بەسەر ئاستی دووهەمدا کە شیکردنەوەی گووتارە «التحلیل الخطابی»

بەڵام شیکردنەوەی فیکری چییە؟ وە شیکردنەوەی گووتار چییە؟ ئەم جیاکارییەڕاستەوخۆ هەڵماندەگرێت بەرەو ماناکانی گووتار لەلای «میشال فۆکۆ». فۆکۆ جیاوازی نێوان ئەو دوو جۆرە شیکردنەوەیە بەمجۆرە چڕدەکاتەوە:

«شیکردنەوەی فیکر هەردەم و بەردەوام هەوڵدەدات مانای ڕاستەقینە لە پشت مانای مەجازییەوە دیاریبکات، ئەودیوی گووتارەکان دەگەڕێت، دەیەوێت بزانێت چی دەگووترا لەپشت ئەوەی کە گووتراوە، بەڵام

شیکردنەوەی گووتار ئەوەیە کە وەک شتێکی سەربەخۆ نامانگێڕێتەوە بەرەو هیچ ئاستێکی دی، کە مامەڵە لەگەڵ گوزارەدا بکات» «بڕوانە حفريات المعرفة ـ ميشال فوكو، ترجمة سالم يفوت، ط٢ 1987، المركز الثقافى العربى ـ بيروت، دار البيضاء، ص27».

لای فۆکۆ گووتار وەکو یەکەیەکی سەربەخۆ، بێپشتیوان و بێڕەگوڕیشە سەیردەکرێت، نەوەک گووتار بەردەوامی یان درێژکراوەی شتێکی دیکە بێت، یان تەنیا وەزیفەی ئەوە بێت نوێنەری زمانەوانی شتەکان بێت. کاری فۆکۆ شکاندن و وریاکردنەوەی ئێمەیە سەبارەت بە ڕەگوڕیشەکان و دەستنیشانکردنی وەهمی «بەردەوامی»یە، واتە گووتار بەردەوامی یان درێژکراوەی شتێکی دەرەوەی خۆی نییە، لێرەدا دروستدەبێت بێئەوەی ڕیشەی لە جێگایەکی دیکەدا بێت. ئەگەر بڵێین گووتار ڕەگوڕیشەی هەیە، گووتار بەردەوامی زنجیرە گووتارەکانە، گووتار کۆبوونەوەی چەمکە فیکرییەکانە لە شێوەی نوێدا. بێگومان بەم مانایە گووتار سەربەخۆیی خۆی وندەکات و دەبێت بەڕووکارێک بۆ ناواخنێکی دی لەپشت خۆیەوە، لەکاتێکدا ستراتیژی گووتار سەرچاوەی نییە، لەساتێکدا دەردەکەوێت و دەرکەوتنیشی لە چەمک و مانا و بیروبۆچوونەکانی و شێوازەکانی ترەوە هەڵناقووڵێت. پرسیاری سەرەکی پرۆسەی شیکردنەوەی گووتارەکانیش ئەوەیە : بۆچی ئەوەی کە وتراوە تەنیا بەو شێوەیە دەوترا؟ «هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧٢». «چ هێزێکە کاردەکات تەنیا ئەو گوزارەیە دەرکەوێت و لەبری ئەو هیچی تر دەرنەکەوێت»«هەمان سەرچاوە ل٧٢». لای فۆکۆ «گوزارە» چەندە بێنرخ و ڕاگوزەربێت، ڕووداوێکی سەربەخۆیە. هەر بۆ شکاندنی ئەو ڕوانگە یەکانگیرەشە « المنظور الاتصالي» فۆکۆ هەوڵدەدات «گووتار» لە «شتەکان» جیابکاتەوە، واتە گووتار لای فۆکۆ شوێنی خەزنکردنی شتەکان نییە، بەڵکو ئەو دەیەوێت «دەستبەرداری شتەکان» بێت «هەمان سەرچاوە ل٦٤». بەڵام ڕەتکردنەوەی شتەکان مانای گەڕانەوە نییە بۆ شیکردنەوەی زمانەوانیانە بۆ دەلالەت، واتە کە ئەوە ڕەتدەکاتەوە گووتار بەرهەمی شتە واقیعی و

کۆنکرێتییەکان بێت، ئەوەش رەتدەکاتەوە کە گووتار تەنیا فۆرمێکی دارێژراوی مانا و دەلالەت بێت... مانای گەڕانەوە نییە بۆ سوڵتانی وشە.

مەنهەجی فۆکۆ، میتۆدێکە بەقووڵی لەناو مێژووی گووتاری خۆرئاواییدا ریشەی داکوتاوە، مەنهەجێکە خوێندنەوەی پارچەپارچەبوون و پەرتبوونەکانی ناو فیکری خۆرئاوای خستۆتە ئەستۆی خۆی، مامەڵە لەگەڵ کەلەپوورێکی گەورەدا دەکات کە لەگەڵ کەلەپووری ئێمە تەواو جیاوازە. لەرۆشنبیریی ئێمەدا کێشەی «یەکانگیری/ جودایی» «الاتصال/الانفصال» هەرگیز کێشەیەکی گرنگ نییە، فۆکۆ لەپێشدەم مێژوویەکدا وەستاوە کە فیکرەی «پەرەسەندن» و «بەرەوپێشچوون» تا ماوەیەکی درێژ تاکە بیرۆکەی باڵای ناو زانست و فەلسەفەکانی بووە، بەڵام ساتەوەختی فۆکۆ ساتەوەختی گێڕانەوەی بایەخ و حورمەتە بۆ بیرۆکەی لەیەک پچڕان و لێک جودایی سەردەمە مەعریفییەکان و بونیادە مەعریفییەکان وگووتارەکان.

لەرۆشنبیریی ئێمەدا مێژووی گووتار، مێژوویەکی تەواو جیاوازە و شێوەی خوێندنەوەشی شێوەیەکی جیاوازە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە مەنهەجی فۆکۆ لە هەندێک شێوە خوێندنەوەی تایبەتدا سوودبەخش نییە، بەڵکو مەنهەجی فۆکۆ لە شوێنی تایبەتیدا بایەخی تایبەتی هەیە، بەڵام بەگشتی روانگەی فۆکۆ بۆ سەیرکردنی گووتار وەڵامی زۆر لە پرسیارەکانی ئێمە ناداتەوە.. لەبەرئەوەی لە بنچینەوە دۆخی گووتار لای ئێمە و لە خۆرئاوادا دوو دۆخی جیاوازە. گووتار لە خۆرئاوا نزیک لە کارکردنی کایەکان دێتەگۆڕێ، لەسەر سنووری ئەو کایانە و لە ئەنجامی نزیکبوونەوەیان لەیەکدی دێتە بەرهەم. لەڕاستیدا ئەگەر سەیری ئەو هۆکارانە بکەین کە فۆکۆ پشتی پێدەبەستێت بۆ دارشتنی تیورەی «سەربەخۆیی گووتار»، راستەوخۆ ئەو جیاوازییەمان بۆ ئاشکرادەبێت لەنێوان دۆخ لەسیستمی گووتار لەلای ئێمە و لە خۆرئاوا. سەربەخۆیی گووتاریی خۆرئاوایی، ترازانی لەوەی ئاماژەیەکی رووت بێت بۆ جیهانی شتەکان و بەردەوامیدان بێت بە دونیای رووداوەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی

ئەو بابەتانەی گووتار له خۆرئاوادا قسەیان لەسەر دەکات، بەدرێژایی مێژوویەک مانای جێگیریان نەبووە و بابەتەکانی لەهەر ساتێکدا مانایەکی تایبەتیان وەرگرتووە «بڕوانە گریمانەی یەکەم، فەسڵی ٢، پێکهاتەی گووتارەکان ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٣». لەبەر ئەوەی ئەو شێوازانەی زانستێک لە زانستەکان تەعبیری پێکردووە، بەردەوام گۆڕانی بەسەرداهاتووە .«هەمان سەرچاوە، گریمانەی دووەم». ئەو سیستمە لە چەمک کە گووتار پشتی پێبەستووە، خۆی سیستمێکی گۆڕدراوە «هەمان سەرچاوە، گریمانەی سێیەم». ناوەڕۆکە فیکرییەکانی گووتار جێگرییەک و تاک مانابیەک بەخۆیانەوە نابینن «هەمان سەرچاوە، گریمانەی چوارەم».

ئەگەر سەربەخۆیی گووتاری خۆرئاوایی بەو شێوەیە بێت، سەربەخۆیی گووتاری ئێمە شێوەیەکی دیکەیە. مێژووی گووتاری ئێمە و بوارەکانی لەوە بچوکترن بکرێت هەمان خوێندنەوەی گووتاری خۆرئاواییان بۆ بکرێت. بەپێچەوانەی کێشەکانی گووتاری خۆرئاواشەوە، گووتاری ئێمە بەدەست ئەوەوە دەناڵێنێت کە بابەتەکانی هەمیشە هەمان بابەتە، شێوازە کانی تەعبیر، دارشتن، نوسینەوە، تێبینیکردن، گۆڕانکاریی زۆر بچوک و سنووردار نەبێت، گۆڕانی ئەوتۆیان بەسەردا نەهاتووە. سیستمی «چەمکەکان ـ المفاهیم» نەوەکو سیستمێکی گۆڕدراو و زۆرجوڵە و بزۆک نییە، بەڵکو سیستمێکی تا ئەندازەیەکی بەرچاو ونە، چەمکە فکرییەکانیش لە فەزای ڕۆشنبیریی و کولتووریی ئێمەدا لە لاوازترین ئاستدان. گووتار لای فۆکۆ کێشەیەکە لە کایە مەعریفییەکان و بابەتی جیاواز جیاوازی ناو ئەو کایانە جیانابێتەوە، بەڵام دۆخی گووتار لای ئێمە دۆخێکی تایبەتی ترە. بەڵام بۆ ئەوەی سەرنجێکی تەواومان دەربارەی مانای گووتار لەبەردەستدابێت، دەبێت بڵێین کە هەندێک لە نوسەرانی دیکە پێناسەی دیکەیان بۆ گووتار کردووە. «بییر. ف. زیما، بەمجۆرە پێناسەی گووتار دەکات»: گووتار یەکەیەکی بان ـ ڕستەییە، لە زمانێکی دەستەجەمعییەوە دروستدەبێت، بونیادە دەلالییەکەی «وەکو بونیادێکی

قووڵ» بەبەشێک لە شفرەیەک لەقەڵەمدەدرێت.«بڕوانە العرب و الفکر العالمی ـ العدد 5ـ شتاء 1989، نحو سوسیولوجیه بییر. ف. زیما».
لای غریماس هەموو گووتارێک لەچەند جەمسەرێکی دژ بەیەک و پێچەوانە دروستبووە « خود ـ بابەت » «نێرەر ـ بۆنێردراو » « دژ ـ یاریدەدەر»، وە هەموو گووتارێک دەکرێت بەسەر ئەو جەمسەرانەدا دابەشبکرێت و لەو ڕێگایەوە کرۆکێکی سەردیانە بخاتەڕوو. جگە لەمانەش زمانەوانەکان گەلێ پێناسەی تریان بۆ گووتار کردووە. هاریس دەڵێت گووتار «گووترەوێکی درێژە، زنجیرەیەک ڕستەیە». هارتمان و ستۆرک دەڵێن «دەقێکە یەکێتییەکی سەرتاسەری ئاشکرای تیا دەبینرێت لەچەند گوزارەیەکی یەک بەدوای یەک پێکدێت، لە فەردێکی قسەکەرەوە دەردەچێت، نامەیەک دەگەیەنێت» «بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: افاق عربیه ـ العدد الثالث، اذار 1993. د. عبدالله ابراهیم. التشکیل المعرفی ـ ثنائیة الذات و الآخر ـ اشکالیة المصطلح النقدی ـ الخطاب و النص. ».

لەهەموو ئەو زانیاریانەوە دەربارەی گووتاری خۆرئاوایی بە چەمکە جیاوازەکانییەوە، وە لە زانیارییە سەرەتاییەکەمانەوە سەبارەت بە «دیار و نادیار» ... لەو دوو پێگەیەوە هەوڵدەدەین پێناسێکی گشتی بۆ گووتار و کێشەی گووتار دیاریبکەین. من پێموایە لەسەر ڕۆشنایی ئەو بۆچوونانەی سەرەوەدا دەتوانین بڵێین، گووتار بریتییە لە پێکهاتەیەکی بان ـ ڕستەیی مانادار، لەسەر سنوورەکانی کارکردنی فیکر و واقعدا دەردەکەوێت، لەڕستێک گوزارەی یەک لەدوای یەک پێکدێت، بابەتەکانیشی هەڵگری سیما و خەسڵەتی ئەو سیستمە عەقڵیەیە کە لە ناویدا بەرهەمدێت و ملکەچی کۆمەڵێ یاسای دەرکەوتن و ونبوونی تایبەتین، زۆر لە شێوازەکانی وتن و نوسین و دابەشبوونی مانا لەڕێگای کارکردنی ئەوەوە خۆیان ئاشکرادەکەن، هەمیشەش بەشێکە لە یەکەیەکی گەورەتر کە چەند گووتارێکی جیاواز بەیەکەوە گرێدەداتەوە «هەتا ئەگەر بەیەکەوە گرێدانێکی مەجازیش بێت». بۆ ڕاڤەکردنی گووتار، جگە لە سنوورەکانی تر، قووڵاییەکانی دیکەی وەکو سایکۆلۆژیا، هوشیاری،

**دەلالەتی زمان لە واقعی ئێمەدا بایەخی خۆیان ونناکەن.**

**گووتاری کوردی بەوەدا کە پراکتیکی ناو کایەیەک یان تیورییەک یان جیهانبینییەک نییە، لەبەر ئەوە «دیار » وەکو پانتاییەکی نوسین «کە وەکو گووتمان لە گووتار خولْقاوە» تاکە شوێنێکی ناسراو و زانراوی گووتارە، بەڵام ئەم شوێنە، کە هەڵبەت هەموو ئەم پێکهاتە ڕۆشنبیرییەی ئێستایە، بە ئەندازەیەک نەخوێندراوەیە وەکو شوێنێکی داخراو دێتە پێشچاو و هێزە تەقلیدییەکان لە هەموو خوێندنەوەیەکی ڕادیکال دەپارێزن .**

**بۆ چوونە ناو ئەو جیهانە داخراوەوە، بە بۆچوونی من هەریەک لە شیکردنەوەی گووتار، شیکردنەوەی فیکری، شیکردنەوەی زمانەوانیانە دەکرێت بکرێن بەسێ ڕێگا بۆ چوونە ناو یەک مانای گشتییەوە بۆ گووتار، بۆ کردنەوەی یەک دەروازەی گشتی کە لەوێوە بتوانین یەکەم هەنگاو بنێین بۆ ناو دونیای «سیستمی گووتاری کوردی»... ئەو ڕێگایەنەی سەرەوە هەریەک بەجیا وەرگرتنی چەمکە گشتییەکانی گووتارە ، کاتێک لەناو یەکەم ساتەوەختی تایبەتمەندێتیدا تێبینیاندەکەین.**

**لێرەدا دەبێت ڕوونکردنەوەیەکی گرنگ بدەین، ئەویش ئەوەیە، قسەکردنمان لەسەر گووتار بۆئەوەی لەسەرەتاوە بچێتە ناو کۆبینینەوە و لەگەڵ ئەم بۆچوونی سیاسی و ئەو بۆچوونی ئەدەبیدا دانەبەزێتە ناو دەمەقاڵێی لاوەکییەوە، دەبێت قسەکردن بێت لەسەر «سیستمی گووتار»، واتە شێوەی ئەو سیستمەی کە گووتارەکانی لەخۆگرتووە. «سیستمی گووتار» ئەو پەیوەندی و یەکبوون و دژایەتیانەیە کە گووتارە جیاواز جیاوازەکان لە کۆمەڵێک پراکتیکی جیاجیای نوسین و کارکردندا دەچنە ناوی، شێوەی ئەو سیستمەشە « لەئاستی ڕووکەش و لەئاستی پەیوەندییە ناوخۆییەکاندا» کە گووتارە جیاجیاکان دروستیدەکەن... وە مانای ئەم سیستمە، شێوەی کارکردنی گووتارەکان، ئاستی**

بڵاوبوونەوەیان، دینامیکییەتیان، دووروونزیکیان لەیەکتر دەستنیشاندەکات. «دیار»ی مەعریفیش دەکرێت سیستمێکی گووتار بێت و دەکرێت زیاد لە سیستمێکی گووتاریش بێت.

بەگشتی ڕۆشنبیری ئێمە لەئاستی پێکهێنانی سیستمێکی گووتاردا وەستاوە کە چیتر نەیتوانیوە چڕببێتەوە و شوێنی کارکردنی خۆی دیاریبکات... بەڵام بەرلەوەی بچینە سەر ئەو کێشانە، چەند پرسیارێکی تر دێنە بەردەممان: ئایا هەموو ڕۆشنبیرییەک چ گەورە و چ بچوک لە سیستمێکی گووتار پێکهاتووە؟ ئاخۆ تیورە خۆی سیستمێکی تایبەتی گووتارە؟ ئایا جیهانبینی سیستمێکی کاریگەرتر و بەرفراوانتر و ئیشکەرتری گووتار نییە؟ لێرەوە پێویستە بەوردی جیاکارییەکی گرنگ بکەین لەنێوان تیورە و سیستمی گووتاردا لەلایەک، جیهانبینی و سیستمی گووتاردا لەلایەکی تر.

## تیور

تیور، سیستمێکی گووتارە و دروستکەری بابەتی زنجیرەیەک گووتاری دیکەشە، چڕبوونەوە و پەرەسەندنی گووتاریشە لە شوێنێکی تایبەتیدا. زاراوەیەکی وەکو «سیستمی گووتار» مانایەکی زۆر گشتی هەیە، بەجۆرێ دەتوانێت لە هەموو شوێنەکاندا کاربکات.. گووتاری خۆرئاواش، ئەنجامی کارکردن و بەیەکداچوونی چەندین کایەیە، بەڵام گووتاری ئێمە دەرەنجامی تەنیایی خۆیەتی، واتە بەرهەمی کاری کایە مەعریفییەکان نییە، چونکە کایەکان لەڕۆشنبیریی ئێمەدا هەر لەدایک نەبوون تا قسە لەسەر گووتارەکانیان بکەین. لەکاتێکدا «تیورە» گەیشتنی سیستمێکی گووتارە بەباڵاترین ئاستی خۆی لە کایەیەک لەکایەکاندا، کە دەشێت ڕەنگدانەوەیەکی میتۆدییانە و تیوریی هەبێت لەکایەکانی تریشدا، تیورە چڕبوونەوەی گووتارەکانە لەیەک شوێندا بەمەبەستی گەیشتن بەکۆمەڵێک ئەنجام. تیورە نابێت بەتیورە تا نەگاتە کۆمەڵێک ئەنجام، هەر لەبەر ئەم

هۆیەش یەکێکی وەکو «فیتگنشتاین» باوەڕی وایە کە «فەلسەفە» نابێتە «تیورە»، چونکە لەدواجاردا ناگاتە کۆمەڵێک «ئەنجام».

بەوەدا کە «سیستمی گووتار» لەڕۆشنبیریی ئێمەدا ناگاتە «ئەنجام»، کارکردنی تێدا نییە بۆ «ئەنجام»، جووڵاندنەوەی تێدا نییە بەئاراستەی «ئەنجام»، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ونبوونی «تیورە»، ونبوونێکی زەق و لەبەرچاو و ئاشکرا نییە، چونکە لە بنەڕەتدا کارکردن بۆ تیورە لە ئاسۆی دیتنی ڕۆشنبیریی ئێمەدا نەبووە و هەرگیز خواستی ئەو نەوەیە نەبووە لە ڕۆشنبیران کە لەم سی ساڵەی دواییدا جڵەوی هەموو پرۆسەکانی بەرهەمهێنانی ڕۆشنبیرییان لەدەستدابووە و هەرئەوان بەرپرسیاری یەکەمن لەم تەمەڵخانەیەی ئەمڕۆ باڵادەستە و هەر ئەوانن کە بەئاسودەییەوە ڕۆشنبیریی ئێمە بەرەو سەدەیەکی تر لە جەهل و گەمژەیی ڕێنوماییدەکەن. مەبەستیشم لەئەنجام توانای ڕۆشنبیرییەکە بۆ بەرهەمهێنانی دیدی تایبەتی و زانستی خۆی وە کۆکردنەوەی کارەکانی لە کەناڵێک یان چەند کەناڵێکی دیاریکراودا کە لەدوا ئەنجامیدا بۆچوونێکی کۆنکرێت دەربارەی کێشە جەوهەرییەکانی بونیادی کۆمەڵایەتی و سیاسی و مەعریفی خۆی دروستبکات، چوارچێوەیەکی گشتی تەفسیر بخاتە ڕوو، بە جۆرێک نیشانەی ئەوە بێت کە عەقڵییەتێکی دیارکراو لە قۆناغی بیرکردنەوەی پەراگەندەوە گواستوێتییەوە بۆ قۆناغی کایەسازی و خۆڕێکخستن، چۆتە سەردەمێکەوە تێیدا پشت ئەستووربێت بە هێزی تێرامانی خۆی و بە ئەزموونی پراکتیککاری خۆی و بە سیستمی زاراوەیی تایبەت بەخۆی کە سنووری مانای ئەو زاراوانە و شێوەی بەکارهێنانیان بە ئاشکرا لەسنووری زاراوە خوازراو یان وەرگیراوەکان جیابکرێتەوە. مەبەستیشم لە ئەنجام بەبێ «تیورە» : سیستمی گووتار و پرۆسەی دەرکەوتنی گووتارەکانە، کە دوور لەو پرۆسە زانستییەی کەئاماژەم بۆیکرد، وەکو جۆرە چالاکییەکی ئازاد دەمێنێتەوە کە لە دەرەوەی ئیشکردنی کایەکان، پێداویستییە مەعریفییە گەورەکان، ئامانجە مەعریفییە گەورەکان کاردەکات و دەردەکەوێت. لە «تیورە»دا

گووتارەکان گەیشتوونەتە ئاستێکی باڵا لە پەیوەندیی لۆژیکی کە لە پشتییەوە سیستمێکی زاراوەی تایبەت بەرهەمدەهێنرێت، کە لەڕێگایەوە دەسەڵاتی تیورە سیستمێکی یەکگرتووی مانا بەسەر هەموو گووتار و گوزارە و یەکە بچووکەکانی خۆیدا دەسەپێنێت. خولْقاندنی سیستمی زاراوەیی نیشانەی یەکەمی کۆبوونەوە و کۆکردنەوەی سیستمی گووتارەکانە لەپرۆسەیەکی مانابەخشی کۆنکرێتدا، نەبوونی سیستمی زاراوەیی نیشانەی یەکەم و سەرەکی پەرشوبڵاویی سیستمی گووتارە، یان مانەوەی سیستمی گووتارە، لەدۆخی سادە و ساکاری خۆیدا، دۆخێک توانای وەڵامدانەوەی ئاڵۆزییە مەعریفییەکانی نییە و لەئاستێکی نزمی وەڵامدانەوەی مەعریفی و کارکردنی هاویەشدایە. ئەگەر سەرنجبدەین لەم خاڵەدا گەلێک ڕاستی تر و گەلێک ئاڵۆزیی دیکەمان بۆ ئاشکرادەبێت. ئێمە لەم ساتەوەختەدا، لەپێشدەم پرۆسەیەکداین کە کەمتر گەلانی دیکەی دونیا لەبەرامبەر ئەمجۆرە کێشەیەدا وەستاون، پرۆسەی شیکردنەوەی گووتار بەر لە ئامادەبوون و دەرکەوتنی سیستمی زانستی گووتار!! واتە بەرلەوەی گووتارەکان وەکو دەرکەوتە و دەرهاویشتنی پرۆسەی مەنهەجە زانستییەکان دەرکەون. پرۆسەی بەخشینی مانایەک بە گووتار بەر لەوەی گووتار مانایەک بەجیهان ببەخشێت، واتە خوێندنەوەی ئەو دوورییەی کە لە نێوان ئەم سیستمی گووتارەی ئێستا و بەرهەمهێنانی مەعریفەی زانستیدا هەیە، خویندنەوەی دیوارەکانی نێوان گووتار و تیورە، ئەم خاڵەش بەئاشکرا مافی ئەوەمان دەداتێ لە دەرەوەی «ئەرکیۆلۆژیا»ـی فۆکۆیی و لەدەرەوەی چەقبەستن لەناو «ڕاڤەکاری ـ التاویلیە»دا کاربکەین... چونکە هەوڵی ئێمە دانانی زانستێکە بۆ گووتار بەرلەوەی گووتار فۆرمێکی زانستی وەرگرێت. هەوڵی ئێمە دەڕژێتە خانەی «تیوریزەکردنی تیورە»وە، واتە ئاشکراکردنی زەمینەکانی کوشتنی تیورە و دیاریکردنی ستراتیژی بەرهەمهێنانی تیورەیە لەڕۆشنبیریی کوردیدا.

دواقسەشمان لەم ڕووەوە ئەوەیە، تیورە گەیشتنی گووتارەکانە بەباڵاترین

ئاستی کارکردنی هاوبەش، بەجۆرێک کەمترین شپرزەیی و کەمترین جیاوازی و تەسکترین مەودای لێکجودایی لەنێوانیاندا هەبێت. لە تیورەدا نەخشەی کاری گووتارەکان و دابەشبوونیان نەخشەیەکی ئاشکرایە، کە یەک لەدوای یەک و چین لەدوای چین لە چوارچێوەی کارێکی زانستیدا بەرەو بەرهەمهێنانی گووتارێکی بالادەست هەنگاودەنێت، ئەویش گووتاری سەرەکی تیورە خۆیەتی. گووتارێک لەو جۆرە گووتارانەی «غریماس» لە دوای دیاریکردنی بونیادە سەردییەکەیان دەگەڕا، جەمسەرەکانیشی کاراکتەری فەردی و کۆمەلایەتی چالاکن... شوێنی کارکردنیشیان زەمینە سۆسیۆلۆژییەکانی فیکرە، واتە ناو کایەیەکی گەورەترە، کە کایەی «جیهانبینی»یە.

## جیهانبینی

جیهانبینی ئاستێکی بالاترە لە تیورە، جیهانبینی کۆبوونەوەی ڕستێک تیورەیە لە دیدێکی یەکگرتوودا، دیدێک لەڕێگایەوە فیکر و شێوە جیاواز جیاوازەکانی مەعریفە گرێدەداتەوە بە واقیعەوە، واتە مەعریفە لە هێزێکی ئەبستراکتەوە دەگۆڕێت بۆ هێزێکی کۆمەلایەتی. بێگومان گووتارەکان و تیورەکانیش بنەمای کۆمەلایەتیان هەیە و بەدەرنین لەڕەگوریشەی کۆمەلایەتی، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازیی نێوان گووتار و تیورە و جیهانبینی جیاوازییەکی گەورەیە. لەئاستی گووتاردا لەڕۆشنبیریی ئێمەدا گەر بەرهەمهێن تاک بێت یان نەتەوە یان چین، بەپێی شوێنی خۆی لەناو نەخشە سۆسیۆلۆژییەکەدا گووتن و گوفتاری خۆی هەیە، بەلام ئەو گووتانە نیشاندەرەوەیەکی میکانیکی شوێنی بەرهەمهێنن وە نەبۆتە خۆڕاگەیاندنێکی مەعریفی بۆ دونیا. گووتار پەیامی ئامادەییە، ئامادەیی و خۆناساندن بە جەستە «چینێکە و هەیە... نەتەوەیەکە و هەیە». بۆ نمونە، لە واقیعی ئێمەدا «گووتاری سیاسی» کە گووتاری بالادەستە، زانستێکی سیاسی بەرهەمنەهێناوە کە تیوریزەی بوون و قازانجەکانی

نەتەوە یان چین یان حیزب بکات، بەڵکو گووتاری سیاسی ئێمە ڕاگەیاندنێکی کلێشەیی و سەرەتاییە لەلایەن ئەو هێزانەوە بۆ بوونی خۆیان، بەڵام لەپشت ئەو هەبوونەوە چ توانایەک شاردراوەتەوە؟ چ ئەگەرێکی مێژوویی هەڵگیراوە؟ مەبەست لەو بوونە چییە؟ بوونێکە بۆچی؟ بەرەو چی؟ ماناکانی لەناو سیستمی پەرت پەرتبوونی گووتاردا ئاشکرانابێت. ڕەنگە لێرەدا یەکێک دەربارەی ئەو هەموو نوسینانە بپرسێت کە لە ڕۆژنامەگەریی ئێمەدا بڵاودەبنەوە، نوسەرەکانی نێوی دیاریکراون، هەندێکیان دەرچووی هەندێ زانکۆ و ئەکادیمیای گرنگن و بپرسێت، ئایا ئەو نوسەرانەش هەر کارەکانیان بە لۆژیکی گشتی و دژەمەعریفی سیستمی گووتارەکانی ناو ڕۆشنبیری ئێمەیە یاخود جەوهەرێکی جیاوازیان هەیە؟ بەڕای من هەموو ئەو ڕۆشنبیرانەی کە هێزی بینین و تێپەڕاندنیان نییە لەناوەوەی ئەم بونیادە کولتورییەدا و لە ڕێگای مامەڵەکردنی ڕاستەوخۆوە لەگەڵ کێشە جەوهەرییەکانیدا، هەمووان بە جۆرێک لە جۆرەکان هەمان سیستم بەرهەمدەهێننەوە. ئەوانە زۆربەی هەرە زۆریان لەناو «نائاشکرا»دا کاردەکەن و پێیان نەخستۆتە سنووری بینینی کێشە گەورەکانەوە. گووتار لەڕۆشنبیری ئێمەدا بەگشتی بوونێکی فەردی و دەستەجەمعیشە، بێژەرەکەی ئەگەر بەناوی خۆشیەوە بدوێت، لە ناو هوشیارییەکی دەستەجەمعییەوە هاتۆتەدەرێ. بەڵام تراژیدیای گووتار، یاخود تراژیدیای گووتاری کوردی لەوەدایە، کە ناتوانێت «قسەکەرێکی ستراتیژی» دروستبکات، قسەکەرێک پرۆژەیەکی ئاشکرای پێبێت، یاخود دابڕانێک لەیەکێک لە کایەکاندا دروستبکات. گووتاری کوردی ڕەنگدانەوەی میکانیکی شوێن و ساتی قسەکەرە «قسەکەرێک، تەنیا زمانحاڵی دەنگێکی دەستەجەمعییە». ئەم ڕاستییەش بۆ هەموو بەرهەم و دیدی ئەکادیمی ئێمە ڕاستە، لە ئەکادیمیاکاندا دەنگی تێکدەر و تێکشکێن بۆ لۆژیک و سیستمی باو لاوازە، یاخود زۆر کزە، زۆرجاریش هەر نییە.

ئەگەر بە وردتر قسەبکەین، دەڵێین: ئەو سنوورەی لای ئێمە گووتارێک لە گووتارێک جیادەکاتەوە سنوورێکی مەعریفی، مێژوویی، ستراتیژی

نییە، بەڵکو سنوورەکانی جیاوازییەکی ڕووکەشە کە تێیدا کێشەی وەهمی، دیالۆگی سەفستاییانەی بێکرۆک، فۆرمالییەتی بەدەر لەمانا، شوێنی کارکردنی زانستی گرتۆتەوە. لەڕاستیدا ئەو سیستمە گووتارەی کە ئەمڕۆ لەڕۆشنبیری کوردیدا باڵادەستە تەعبیر لە هوشیارییەکی درۆزنی دەستەجەمعی دەکات کە لەڕێگایەوە جیهانێکی داخراو وە سنووردار و کورتکراوە بەرجەستەدەکرێت کە لەبری نەشتەری زانست، نەشتەری حوکمی پێشوەخت و بروای نەگۆڕ حوکمیدەکەن. بەڵام تیورە لەئاستی مەعریفیدا جیاکردنەوەی کۆمەڵێک گووتارە لە کۆمەڵێک گووتاری تر بە پێوانەی زانستی. لەڕووی سۆسیۆلۆژیشەوە بەخشینی مانایەکی ستراتیژییە بە مەعریفە. وەلێ لە هەر دوو ئەو خاڵە گرنگتر ئەوەیە کە کەسی بەرهەمهێن لە تیورەدا بایەخێکی بەرچاوی هەیە. قسەکەر لە تیورەدا فەردە، کەسی تیوریزەکەرە وەکو کەسی بەرهەمهێن نییە بۆ گووتار کەدەشێت هەر بەرهەمهێنەرەوەی گووتارە باوەکان بێت، بەڵکو تیوریزەکەر نیشانەی گەیشتنی ڕۆشنبیرییەکە بە ئاستێک کە تیایدا دەتوانێت کاراکتەری «زانا» بەرهەمبهێنێت، تیورە ڕەنگدانەوەی کامڵبوونی هوشیاریی تاکەکەسە، مانای شکاندنی دیوارەکانی هوشیاریی دەستەجەمعییە و شێوازەکانی ئەو هوشیارییەیە لە کارکردن و ڕوانیندا، مانای کۆبوونەوەی دیدگایەکی دیکەیە لەناو هزرێکی ئازاددا.

لەگەڵ هاتنی تیورەدا، ئیدی سنووری تیورەیە کە گووتار لە گووتار جیادەکاتەوە، بابەت و کایە و زاراوە و چەمکەکانی گووتار دەگۆڕێت. ئەگەرچی خوڵقێنەری تیورە تاکە کەسێکە یان ژمارەیەکی دیاریکراوە لە پسپۆڕان، بەڵام زۆرجار ئاشکرابوونی گەیشتنی چینێک یان نەتەوەیەکیشە بەهوشیارییەکی جیاواز، بەڵام ئەو هوشیارییە لە تیورەدا لەناو کەمایەتییەکی مەعریفیدا بەرجەستە دەبێت. تیورە ستراتیژێکی پێشنیارکراوە بۆ کایەیەکی مەعریفی، بۆ سیستمێکی مەعریفی یاخود بە مانایەکی گەورەتر بۆ چینێکی کۆمەڵایەتی یاخود سەرجەمی پێکهاتێکی کۆمەڵایەتی، کەچی بکەری تیورە.. هوشیاریی تاکەکەسە. بەڵام ئەوەی

تیورە و ستراتیژی تیوری لەئاستی تاکەکەس و کەمایەتییەوە دەگوازێتەوە بۆ ئاستێکی باڵاتر، ئەوەی لە ستراتیژێکی پێشنیارکراوەوە دەیگۆڕێت بۆ ستراتیژێکی کاریگەر.. کامڵبوونی «جیهانبینی»یە. جیهانبینی بە بۆچوونی من گۆڕانی مەعریفەیە بۆ هێزێکی کاریگەر، جا لەئاستی بەکارهێنانی زانستیدا بێت بۆ ئاوەژووکردنەوەی ئاراستەی زانستێک لە زانستەکان یان بەخشینی شوناسێکی تایبەت بێت بەکایەیەک لە کایەکان، یاخود لەئاستی کۆمەڵایەتیدا بێت بۆ گۆڕینی ئاراستەی کارکردنی دەستەیەکی کۆمەڵایەتی. جیهانبینی نیشانەی کامڵبوونی جۆرە بەریان و دیدێکی قووڵ و کارایە لە کایە زانستییەکاندا، وە ئاشکراکەری چەمکە کۆمەڵایەتییەکانی مەعریفەشە لەئاستی سۆسیۆلۆژیدا. جیهانبینی ئەو دەرگایەیە کە بەرەو شوناسی مەعریفی دەڕوات. لەئاستی کۆمەڵایەتیدا، شوناسی تاقمێک لە تاقمەکانی دیکە جیادەکاتەوە، لەئاستی جیهانیشدا، شوناسی ئێمە لە فەرهەنگەکانی دیکەی دونیا جیادەکاتەوە، لەئاستی مەعریفیشدا، شوناسی کایەیەک یان پرۆژەیەک لە کایە و لە بونیاد و پرۆژەکانی دیکە جیادەکاتەوە.

جیهانبینی لە دۆخێکی وەکو واقعی ئێمەدا، جودا لە هەر پێناسەکردنێکی «ئەنسرۆپۆلۆژی» سادە کە هەر پارچە ئەفسانەیەکی میللی یان هەر گۆرانییەکی فۆلکلۆری بە بابەتێکی بەرجەستەکەر دەزانێت بۆ جیهانبینییەکی گشتی، دەبێت بەرجەستەبوونی توانای هوشیارییەکی کۆیی بێت بۆ بوون بە هوشیارییەکی زانستی و داهێنەرانە، ئەمەش تەنها وەزیفەیەکە جیهانبینی لە قۆناغی زانستدا لە قۆناغە سەرەتاییەکان جیادەکاتەوە، جیهانبینی نەتەوە گەورەکان لە جیهانبینی خێڵە پچوکەکان جیادەکاتەوە. جیهانبینی بەخشینی مانایەکی تایبەتییە بە گووتار و تیورە، کۆکردنەوەیانە لە ستراتیژێکی سەرتاسەری و کاریگەردا، ئەگەرچی مەرج نییە هەموو تیورەیەک و هەموو خیتابێک دواجار هەر لە ناو چوارچێوەی ئەو ستراتیژەدا بەرجەستەببن. لەڕۆشنبیریی ئێمەدا جیهانبینی، وەکو سیستمێکی جیابوونەوە و جیاواز لە تیورە و

گووتارەکانی ناوخۆی و دەرەوەی خۆی، دەتوانێت ئاشکراکەری خەسڵەتی سۆسیۆلۆژی گووتارەکان بێت، لۆژیکیان بداتێ، مانایان پێببەخشێت، بکەریان پێببەخشێت، واتە ڕوانگەیەکی تایبەتی خوێندنەوە بێت. بەمجۆرە کە جیهانبینی وەک تێڕوانینێکی سەرتاسەری و وەکو ڕوانگەیەکی مامەڵەکردن گەیشتە ئاستە باڵاکانی خۆی، دەبێتە سەرچاوەیەکی ڕاڤەکاری «مرجع تاویلی» بۆ گووتار و تیورە ئازادەکانیش، واتە بۆ هەموو ئەو گووتار و گوزارانەی کە جیهانبینی لە خۆیان ناگرێت وە بۆ ناسینەوە و پۆلێنکردن و دیاریکردنی هۆکانی دەرکەوتنیان.

جیهانبینی قسەکەرێکی گەورەیە، قسەکەرێکی مێژووییە، بەهانە و زەمینە دەبەخشێتە سیستمێکی مەعریفی، چینێکی کۆمەڵایەتی، ڕەفتار و تێڕوانینی نەتەوەیەک. بەبێ جیهانبینی هەموو کایەکان، گووتارەکان، تیورەکان، بێ شوناس مێژووی خۆیان پیادەدەکەن. بەبێ جیهانبینی، چینەکان و نەتەوەکان بێ شوناس دەژین، بێ شوناس پراکتیکی مێژوویییەکی ئاڵۆز ئەنجامدەدەن، مێژوویییەک بکەرەکەی لە ناو تاریکی «بێ ـ مانایی» خۆیدا دەژی، لە مەعمای شوناسی خۆیدا دەژی. بەبێ جیهانبینی، مێژووی ئێمە دەبێتە ڕستێک ڕووداوی یەک لەدوای یەکی «بێ ـ مانا»، بێ چێوە، پەرت و ناڕێک. خوێندنەوەشمان بۆ مێژوو دەبێتە گێڕانەوەی مێژوو، گێڕانەوەی ڕووداوەکان، نەوەکو گێڕانەوەی مانا و چەمک و بۆچوون. بەبێ جیهانبینی مێژوویەکمان دەبێت، ئەوانەی دەیخوڵقێنن سیمایان نییە، بکەرەکانی هەندێک گووتار دەیانجووڵێنێ. ڕوانینی سەرتاسەری لە دیدەیاندا نییە، بەڵکو کوشتەی بینینی جیهانێکی پچڕپچڕن. بکەری مێژوویی ئێمە بکەرێکی پارچەپارچە و بەش بەشە کە بوونی ئاوێنەی ونبوونی دیدێکە کە خود و جیهانی بۆ یەکبخاتەوە، ئاوێنەی ونبوونی هۆشمەندییەکە بکەرێکی گەورەتر و کاراتری لێبخولقێنێ. ونبوونی تیورە و جیهانبینی حوکمدانی بکەری هوشیاریی ئێمەیە بە تەنیایی... تەنیایییەکی مێژوویی، تەنیایی هوشیارییەکی پڕ لە مەعما... پڕ لە گرێ... پڕ لە پرسیار... لە قۆناغێکدا بەهەق دەتوانین ناوی بنێین

قۆناغی «رۆشنبیریی پێش تیورە» «نەتەوە پێش ئاشکرابوونی جیهان» «چین پێش ئاشکرابوونی مێژوو».

بەڵام زۆرشتی گرنگی دیکەش هەیە کە پێویستە زیاتر ئاشکرابێت، لەوانە دیاریکردنی جیاوازی لەنێوان مانای ئەو چەمکە کۆمەڵایەتییەی لەپشت گووتارەوەیە، لەگەڵ مانای ئەو چەمکە کۆمەڵایەتییەی لەپشت هەر یەکێک لە تیورە و جیهانبینییەوەیە. لەرووی سۆسیۆلۆژییەوە دەنگی بەرهەمهێن بۆ گووتار لەرۆشنبیری ئێمەدا دەنگێکە خۆی ناناسێتەوە، ئەگەر خەیاڵێکی تاریکی خۆناسینیش لە بیرکردنەوەیدا هەبێت، خۆناسینێکی وەهمی خوڵقاندووە.. دەنگێکە بۆتە راگەیاندنی گووتارێک بۆ خۆی و پابەندی تێگەیشتن نییە لە شوناسی کۆمەڵایەتی خۆی. لەپشت گووتاری کوردییەوە دەنگێکی دەستەجەمعی هەیە، ئەگەرچی دەنگێکە وەزیفە و ئایدۆلۆژیای ئاشکرای خۆی هەیە، بەڵام ئەم وەزیفە و ئایدۆلۆژیایە نە لە تێرامانی مەعریفیدا، نە لە دەقی تیوریدا بەرجەستەنەبووە، نەکایەی زانستی دروستکردووە، نەکولتووری دونیای ناسیوە، نەجیهانیشی بۆ خۆی راڤەکردووە. دەنگێکە نەیتوانیوە دیدە فەردییەکان بەئەندازەیەک بوروژێنێ و توانایان بتەقێنێتەوە تا کاری گرنگ بخوڵقێنن، یا لە پشتەوە هوشیاری و قەیران و ئومێدی چینێکی کۆمەڵایەتی دەربکەوێت. دەنگی پشت گووتار، دەنگێکە لە مەعمادایە، دەنگێکە دەتوانین هەندێ رەگوڕیشەی سۆسیۆلۆژی بۆ دیاریبکەین، بەڵام ناتوانین هوشیاریی مێژوویی و هەست و نەستی قووڵی کۆمەڵایەتی و ئایدۆلۆژی بۆ دیاریبکەین، کەهەڵبەت ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەوجۆرە هەست و نەست و ئایدۆلۆژیایە بوونی نییە ، بەڵکو هەیە و لە قۆناغی بەر لە بەرهەمهێنانی مەعریفیدایە، پاراستنی ئەو دۆخەش ئەرکێکی ستراتیژی سەلەفییەتی ئێمەیە. لێرەوەیە کە دەتوانین بڵێین گووتاری ئێمە دەزانێت لەکوێوە دێت، بەڵام هیچ شتێک دەربارەی ئەو شوێنە نازانێت کە لێوەی هاتووە، هیچ شتێکیش دەربارەی ئەو شوێنە نازانێت کە بۆی دەچێت. دەنگی پشت گووتار، دەنگێکە بێشوناس، ئەوە سەرەکیترین خەسڵەتی سۆسیۆلۆژی گووتاری کوردییە.

دەنگی توانەوەی دوو ڕۆحلەبەری بێشوناس و بێسیمایە لەناو یەکدا کە «تاک» و «کۆمەڵگا»یە کە دواجار سەروەریش لەنێوان ئەم دوو کوژراوەدا بۆ گروپە دەستەجەمعییە بچووکەکانە، وەکو «حیزب» و «قەبیلە». بەڵام تیورە، تەعبیر لە توانای تاکەکان دەکات بۆ دروستکردنی دەنگ و دیدی خۆیان، بەجۆرێ ڕێگا خۆشکەر بێت بۆدامەزراندنی هوشیارییەکی ڕاستەقینە، کە یارمەتیبدات شتەکان لەبوون بۆ خۆیانەوە «بەمانا کانتییەکەی» ببن بە شت بۆ ئێمە، لەبوون بە زەبرەوە ببن بە بوون بەڕاستی. تیورە توانای هوشیارییەکە کە ئەگەرە ناوخۆییەکانی خۆی بخاتەگەڕ تا لە هۆشمەندییەکی شیمانەییەوە «وعی الممکن» بگوازێتەوە بۆ هوشیارییەکی بەرجەستە لە دیدێکی زانستییدا، جیهانبینیش توانای نەتەوە یان چین یان گروپی کۆمەڵایەتی یان ڕۆحی سەردەمێکە کە ئەو دیدە بگوازێتەوە بۆ پراکتیکێکی شارستانی.

خاڵی دووهەم کە پێویستی بەڕوونکردنەوەیەکی دەستوبرد هەیە ئەوەیە: ئاخۆ جیهانبینی وەکو سەرچاوەیەکی ڕاڤەکاری - مرجع تاویلی - لە چ ڕوانگەیەکەوە دەتوانێت ڕاڤەبکات؟.

ئاشکرایە بەپێی ئەو سەیرکردنەی سەرەوە وەزیفەیەکی جیاوازمان بەخشی بە جیهانبینی پێچەوانەی ئەو وەزیفانەی خۆرئاوا پێیدەبەخشێت. جیهانبینی لە چەمکە «گۆڵدمانی»یەکەیدا هێزێکە دەبێت ئاشکرابکرێت، بدۆزرێتەوە، لەودیوی دەقەکان و لەودیوی هوشیاریی فەردەوە کاردەکات. ڕۆڵی خولقێنەر و گرێدەرەوەی هوشیاریی تاکەکەسی هەیە بە هوشیاریی کۆوە، بەڵام گۆڕینی جیهانبینی بۆ سەرچاوەیەکی ڕاڤەکردنی پێشبینیکراو، کۆمەڵێ ئەرکی مەعریفی بەسەریدا دەدات ... جیهانبینی لەڕۆشنبیریی ئێمەدا بەپێچەوانەی خۆرئاواوە، ئامادەیەکی نەبینراو و نەدۆزراوە نییە بۆی بگەڕێین و تەمومژە ئایدۆلۆژییەکانی دەوری برەوێنینەوە، جیهانبینی دەبێت لەدایکبێت، دەبێت دروستبکرێت، کە دروستیشکرا مانای ئەوەی کە لە دەرگاکانی پشتەوە، لە کەناڵە نهێنییەکانەوە خۆی ئاشکراناکات، بەڵکو لەدایکبوونی پرۆسەیەکی

هوشیارانە دەبێت... جیهانبینییەک دەبێت کە سەرچاوە سۆسیۆلۆژی و دابڕانی ئەبستمۆلۆژیی خۆی ڕادەگەیەنێت و دەکەوێتە کار، لە دەرگاکانی پشتەوە دێتە ژووری، خۆی مەعریفە و ڕاڤەکردنی مەعریفە دەبێت.. خۆی بونیاد و ڕاڤەکردنی بونیاد دەبێت... بە هوشیارییەوە دروستیدەکەین، بەهوشیارییەوە پێی تێدەخەین، بەهوشیارییەوە پێمان تێدەخاتەوە.

جیهانبینی ئاشکرابوونی شوناسیشە، بەڵام ئاشکرابوونێکی مەعریفی نەوەک ئاشکرابوونێکی جەستەیی و بێڕەهەندی ڕووت و ئایدۆلۆژیانە. شوناسێکە کە لەدۆخی ئێستای فەرهەنگی ئێمەدا تەنها پانتایی و پێوەرێکی پێشبینیکراوە، واتە لە باڵاترین ئاستی مەعریفی خۆماندا، لە ترۆپکی گەشە و کامڵی فیکریماندا ئاواتی پێدەخوازین و هیچی تر، لەبەرئەوە سیفەتی «یوتۆبیا»ی مەعریفی هەیە.. یوتۆبیایەک دەنگەکان لەناویدا دەزانن لەکوێوە هاتوون، لەچ ساتێکدا لەدایکبوون، لەچ ساتێکدا دەمرن، دەزانن چەندەیان لەناو «نادیار»دا نوقم و چەندەیان لە ناو «دیار»دا ئاشکرایە. جیهانبینی یوتۆبیای مەعریفی ئێمەیە کە تیورەکان دەیهێننەدی... ئایدیالی مەعریفی ئێمەیە، خەونی پرۆژەیەکی تازەگەرییە لە کامڵترین وێنەیدا، ئامادەیەکی نەدۆزراوە نییە، بەڵکو دۆزراوەیەکی نائامادەیە. لێرەوە جیهانبینی چێوەیەکی کولتووریی نییە کە بۆچوون و تەفسیرە سادەکانی ژیانمان لە خۆدەگرێت، بەڵکو دۆخی چالاکبوونی تەواوەتی کۆی کایە مەعریفییەکانە بۆ بەرهەمهێنانی بەردەوامی فیکر و پێکەوە کارکردن.

## گەڕانەوەیەک بۆ کێشەی «دیار / نادیار»

ئێستا ئاشکرایە نادیاری ناو ڕۆشنبیریی ئێمە دوو چەمکی بنەڕەتی لە خۆیدا هەڵگرتووە، ئەویش تیورە و جیهانبینییە. تیور گەشتێکی فەردییە بەناو نادیاردا، جیهانبینیش کۆکردنەوەی دەستکەوتە جیاوازەکانی تیورەیە، لەیەک دیدی کۆ و گشتیدا، تا ببێتە بزوێنەری گرووپێک یان

کۆمەڵگایەک لە خۆبینین و خۆنوێکردنەوەدا.

ئەگەر تازەگەریی وەکو خواست مەسەلەی پەڕینەوەبێت بەرەو نادیار، پەڕینەوەیەک دوای ئەوەی کە زانیارییەکی پێشینی لەسەر وەردەگرین، بیرۆکەیەکی سەرەتایی لەسەر کۆدەکەینەوە «زانیارییەک کە هەر لەئاست و لەڕەنگی ئەو زانیارییەدایە کە دەریاوانێک سەبارەت بە دەریا دەیزانێت، بەر لەوەی بۆ یەکەمجار کەشتییەکەی بەرەو دەریایەکی نەزاندراو بیاژۆێ».

تازەگەریی ڕۆچوونێکی قووڵە بەناو تاریکیدا، تیورەش بەرجەستەکردنی ئەو ڕۆچوونەیە. هەموو تیورەیەکی ڕاستەقینە، هەموو تیوریزەکەرێکی ڕاستەقینە لەناو تاریکییەکانی نادیاردا نوقمدەبێت. ئەنجامەکانی تیورە دواتخوبی گەشتی تیوریزەکەرن بەناو نادیاردا. بەڵام لەپشت ئەنجامەکانی تیورەوە نادیار دواییناپەت، بەڵکو تیورە خۆی دواییدێت. تیورە لەناو ئەنجامەکانی خۆیدا دەمرێت، مردنیشی توانە و یەکبوونێکی ئۆرگانییە لەگەڵ تیورە و گووتارەکانی دیکەدا بۆ خولقاندنی جیهانبینی... واتە خولقاندنی دیارێکی نوێ کەڕەنگە نەتوانێت سەرجەمی دیاری پێشینە بگۆڕێت. تیورە ڕاستەوخۆ جیهانی پێش خۆی تێکناشکێنێت، بەڵکو جیهانی پێش خۆی ئاشکرادەکات. زنجیرەیەک دەنگ و گووتار و ئاشکرابوون و جیاوازی و بابەت فڕێدەداتە ناو دیارەوە، بەڵام بونیادێکی ئەلتەرناتیڤ نییە... هێشتا زەمەنی تایبەتی خۆی نییە... لەڕووی مەعریفییەوە جووڵەیەکە دژ بە دیار، بەڵام لەڕاستیدا هیچ تیورەیەک بە تەنیا سەردەمێکی مەعریفی ناخولقێنێت. تیورە ڕێخۆشکردنە بۆ لە کارکەوتنی هەموو سیستمی مەعریفی پێشوو، بەڵام لەپاڵ تیورەدا سیستمی پێشوو هەر کاری خۆی دەکات. ساتەوەختێک نییە تیایدا تازەگەریی بەڕەها ببێتە ئامانج.. تازەگەریی ببێتە مەبەستی کۆی سیستمێکی مەعریفی. چونکە هەمیشە و هەمیشە تازەگەریی ستراتیژی دەستەیەکی بچوکە... ستراتیژی پانتاییەکی بچوکی گووتارە کە بەناو جەستەی فەرهەنگێکی دیاریکراودا دەسوڕێنەوە. لەڕۆشنبیریی ئێمەشدا

تازەگەریی لەم ساتەدا لەپاڵ سەلەفییەتەوە کاردەکات... ناچارە لەسەر یەک ڕووبەر بەرجەستەببێتەوە کەڕووبەرێکە بە دیار ناویدەبەین، ناتوانێت کایەی خۆی جیابکاتەوە «چونکە کایەکان نین». ئێمە زانستمان نییە، ڕۆشنبیریمان هەیە، لە زانستدا بیریار ئیش لە کایەیەکی تایبەتدا دەکات، لە ڕۆشنبیرییدا بیریار لە ناو ڕووبەرێکی بەرینی پرسیار و کێشە و گرفتی جیاوازدا ئیشدەکات .. ناتوانێت زەوییەکی تایبەت جیابکاتەوە و بڵێ ئەمە زەوی منە، بەڵکو لەناو ئەو ڕووبەرەدا کە بە دیار ناویدەبەین و بەپێچەوانەوەی ئاڕاستەی لۆژیکی کارکردن ئەو ڕووبەرەوە دەردەکەوێت و چالاک دەبێت. بەڵام ئەم کارکردنە بونیادێکی عەقڵی تازە ئاشکرادەکات، زەینێکی نوێ کە پتر ناو نادیار دەگەڕێت، نەوەکو دیار کۆنترۆڵبکات. لە ناو ئەو زەینە تازەیەدا تیورە بەردەوام لەناو خۆڵەمێشی خۆیەوە تیورەی نوێ دروستدەکات.

لەم خاڵە بەدواوە دەبێت بۆچوونی خۆمان لە هەموو تێڕوانینێکی «ئەفلاتونی» پاکبکەینەوە. ئەم وێنەیەی تائێستا بۆ نادیارمان کێشاوە مەترسییەکی گەورەی داخزانی لەبەردەمدایە بەرەو «ئەفلاتۆنییەت». ئەم وێنەیەی تائێستا دروستمانکردوە ڕەنگە وابێتە بەرچاو کە تیورەکان یان ڕاستییەکان لە شوێنێکدایە لەناو نادیاردا. نادیار جێگایەکە، خەزێنەیەکە لە بیروبۆچوون و چەمک کە هێندەمان دەوێت بە عەقڵ دەرکی پێبکەین، وەکو ئەوەی بوونی مەعریفی تازەگەریی بوونێکی تەواو و کامڵ بێت لەناو نادیاردا دانرابێت، هیچ شتێکمان نەوێت ئەوە نەبێت پەردەی لەسەر لابدەین ... بەڵام بێگومان بەو جۆرە نییە. تازەگەریی ئەمیرەیەکی خەوتوو نییە، هیچی نەوێت ئەوە نەبێت لە خەوی هەستێنین. زەوییەکی ئامادە نییە کە بەبێ بوونی ئێمەش هەر لەوێ بێت و چاوەڕوانی میوانێک بکات. نادیار ئەو ڕاستیانەیە کە لەڕێگای جۆرێکی تر لە بیرکردنەوەوە دەیسەلمێنین و دەیدۆزینەوە. نادیار نەلە دەرەوەی جیهانە، نەلە دەرەوەی عەقڵدایە، بەڵکو ئەو سنوورە دوورانەی بیرکردنەوەیەیە کە یاساکانی دیار... یاساکانی بیرکردنەوەی کۆن.. لۆژیکی دێرینە ناهێڵێت ببینین.

تازەگەریی سەفەری جێهێشتنی عەقڵە بۆ تابۆ و حەرام و پەرژینەکانی خۆی. نادیاریش ئەو ئەنجامە چاوەڕواننەکراوەیە کە لەو جێهێشتنەوە بەدەستمان دەگات. نادیار عەقڵە کە خۆی بۆ خۆی ئاشکرادەکات، جیهانە کاتێک بەجۆرێکی دی دەبینرێت، بەڵام هەر بەشێک لەو خۆئاشکراکردنە و خولْقاندنەوەیە بۆ عەقڵ و بۆ جیهان پابەندی یەکترن. واتە عەقڵ پابەندی دۆخی خۆیەتی لە جیهاندا، جیهانیش پابەندی وێنەی خۆیەتی لە عەقڵدا، کەواتە نادیار نەوەک لە دۆخێکی ئەفلاتونیدا، بەڵکو لە تخوبی جووڵاندنەوە و کارلێکی عەقڵ و جیهاندا دەردەکەوێت، نادیار نائامادەیەک نییە ئامادەیبکەین، بەڵکو نەخولْقاوێکە بەپێی گەلێ هەلومەرج دەیخولْقێنین، خولْقاندنەوەش لە تیورەدا دیدگایەکی تاکەکەسییە. تیورە بەرهەمی تاکەکەسە، هەنگاوی تاکە بەرەو ناو تاریکی، تیورە لە تاکەوە بەرەو جیهان دەگەڕێتەوە، ساتەوەختی تاکە لە مێژوویەکدا کە تاکی فەرامۆشکردووە، گۆشەنیگایەکە کە چیتر ئاوێنەی دیدی کۆ نییە. لە تیورەدا عەقڵی تاکەکەس شوناسی خۆی ئاشکرادەکات، لە تیورەدا دونیا وەکو بونێکی نوێ و سەرتاسەر لەبەردەمماندا دەکرێتەوە، تیورە دەسەڵاتی تاکە لەناو دەسەڵاتی وشە و زاراوەدا بۆ درکاندن و هێنانە قسەی عەقڵ و جیهان... بۆ خولْقاندنەوەیان.. بۆ گۆڕینیان. تیورە لەسەرەتادا گووتاری قسەکەرێکە بەگۆشەیەکدا، بەڵام پرسیارەکان، گومانەکان، ئارەزووەکان پاڵ بەو قسەکەرەوە دەنێن، بۆ جێهێشتنی ئەو گۆشەیە. تازەگەریی لەو ساتەوە دەستپێدەکات «نادیاریش لەهەمان ئەو ساتەدا ئاشکرادەبێت» کە پرسیارێک یان گومانێک یاخود ئارەزوویەکی کوشندە پاڵمان پێوەدەنێت کە لەودیو سنووری شتەکانەوە، لەودیو مەرزی مەعریفەی ئامادەوە بۆ شتێک بگەڕێین، نادیاریش ئەو هەستکردنەیە بە ونبوون و بچوکی و بێدەسەڵاتی کە لەناکاو لە ناوەڕاستی وەستان و تێڕامانماندا لە کەرەستە مەعریفییەکانمان، دامانده‌گرێت، کاتێک ئاوڕدەدەینەوە و دەبینین شتێک ونە، دەبینین ڕوانینمان بۆ جیهان شتگەلێکی گرنگی نوقسانە، کاتێک دەپرسین دەبینین هەموو جیهان لەبەردەم پرسیارەکەماندا وەکو کەڕوڵاڵ بێدەنگ دەوەستێت. نادیار لەو

ساتەدا دێتە ناو مەداری بیرکردنەوەمان کە ئێمە دەپرسین و دونیا وەڵاممان ناداتەوە... دیار وەڵاممان ناداتەوە... ئاسۆکانی دیار وەڵاممان نادەنەوە... ئاشکرا وەڵاممان ناداتەوە... نائاشکرا وەڵاممان ناداتەوە... لەو کاتەدا «نادیار» وەکو بوونێکی تر، شوێنێکی تر، پرۆسەیەکی تر، لە بەردەمماندا ئاشکرادەبێت. بێدەنگی دیارە کە بێدەنگی نادیار ئاشکرادەکات، بێدەنگی ئێستایە کە بێدەنگی تازەگەریی دەردەخات... بێدەنگی سەلەفە کە بێدەنگی ئێمە بەرجەستەدەکات و دەیسەلمێنێت کە دەنگمان ونە و دەبێت ئامادەبکرێت، بەڵام تەنیا چەند رۆحێک هەست بەو بێدەنگییە دەکەن، چونکە دەنگی گووتارەکان، دەنگەکانی دیار دەتوانن هەمیشە گوێچکەی کۆمەڵ پرکەن، کۆمەڵگای ئێمە کۆمەڵگای دەنگە، دەنگێک کە لە وردبوونەوە و رامان داماندەبرێت، دەنگ لە هەموو شوێنێکدایە، باڵادەسترین سیستمی ئاماژەیە «دەنگی ئەو تەقانەی دەکرێن بەئاسماندا، دەنگی ئەو سروودانەی لە دەنگی هاوار و نەرەنەرِی فرۆشیارەکان بەرزترە، دەنگی ئەو تەلەفزیۆنانەی کە زیاتر دەستگای دەنگین تاوەکو دەستگای رەنگبن، دەنگی ئەو رۆژنامانەی کە پتر دەستگای بەرهەمهێنانەوەی نزمترین ئاستی شەرەجنێوون ... هتد». بێگومان تاک کە لەناو ئەو دەنگانەدا ناتوانێت رۆحی خۆی و ئارامی خۆی بدۆزێتەوە ناچارە سەرەتا خۆی لەو دەنگە دەنگانە داببرێت، تازەگەریی لە جۆرێک لە جۆرەکانی کەربوونەوە دەستپێدەکات... لەکاتێکدا سەرجەم جیهان لەناو غەڵبەغەڵبێکی تاریکدا ونبووە، بێدەنگی عەقڵ و بێدەنگی جیهان تازەگەر رووبەرووی چارەنوسێکی دیکە دەکەنەوە. لەو ساتەوەی کە تازەگەر هەست بە بێدەنگی جیهان دەکات، سەرجەمی دیار لە فەلەکی تازەگەردا دەکەوێتە ناو خانەی مردووانەوە. تازەگەر دیار جێدەهێڵێت بۆ ئەوەی بێدەنگی جیهان بکاتە قسە. تازەگەر لەترسی بێدەنگی جیهان و بێدەنگی دیار بەرەو تاریکستانی نادیار هەڵدێت، تازەگەریی جۆرێکە لە هەڵهاتن... هەڵهاتن بەڵام بەپێی دەستورێکی تایبەتی... تیورەش بۆ ئێمەی کورد ئەو دەنگە ونەیە کە دەشێت ببێتەوە بەسەدایەک بۆ عەقڵی ئێمە... تیورە ئەو ساتەیە کە تاک دەپرسێت و بەتەنیا بیردەکاتەوە و

دەنگدانەوەی خۆی لە جیهاندا گوێ لێدەبێتەوە. دەنگی هزرێکی پرسیارکەرە کە بەر شتەکان دەکەوێت، وەڵامی تاکە هوشیارەکانە بۆ پرسیارێکی مێژوویی... تیورە لەتەک خۆیدا تایبەتمەندێتی گووتارەکانی خۆی دەهێنێت. سەرەکیترین خەسڵەتی تیورەش لە دونیای ئێمەدا، خەسڵەتە رەخنەکارەکەیەتی... تیورە کە بەرجەستەبوونی شوێن هەنگاوی تازەگەرییە، تیورەیەکی رەخنەیی دەبێت، واتە تیورە لەدونیای ئێمەدا تەنیا دەتوانێت تیورەیەکی دژبێت بەواقعی ئێستای ئەم کولتوورە.

دیاری سەلەفیانەی ئێمە نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە خیتابەکانی بە فەردێکی جەوهەردارەوە گرێبداتەوە، وە شوێنێک و گۆشەنیگایەکی ستراتیژی نیشانبداتەوە، دیاری سەلەفیانەی ئێمە نەگەیشتۆتە ئاستی تیورە.. بەڵکو بۆ کوشتنی ئەو فەردە جەوهەردارە و کوشتنی پەرەسەندنی ئەو گۆشەنیگا ستراتیژییە کاردەکات .

لێرەدا دەبێت شتێکی نوێ ئاشکرابکەین. «دیاری نوێ کە هەڵبەت هەموو ئەو رووبەرانە دەگرێتەوە کە کاری تازەگەر لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت و ئاشکرایدەکات» کە دەبێت جێگای «دیاری سەلەفی» بگرێتەوە، دیارێک نییە لەسەر هەمان ریتمی دیاری کۆن و سەلەفی. ئەگەر «دیاری نوێ» بۆی هەبێت لەدایکبێت و بژی و بەردەوامبێت و لەناو سەلەفدا نەتوێتەوە، ئەوا هەنگاوە بۆ خوڵقاندنی تاکێک کە نە لە نێرجسییەتدا دەتوێتەوە و نە لە هاواری گروپدا دەخنکێت، سەقامگیرکردنی گۆشەنیگایەکی دیاریکراوی مێژوویشە، هەنگاوێکە کە تازەگەرییەکانی پاشەرۆژ لەناویدا سەرهەڵدەدەن و گەشەدەکەن و پەرەدەستێنن. دیاری نوێ لەو ساتەشدا کە دەبێتە سیستمێکی وەستاو، بەئەندازەی سیستمە سەلەفییەکانی دێرین ستراتیژی کوشتنی تاک و کوشتنی دیدگای مێژوویی پیادەناکات... چونکە دەبێتە سیستمی وەستاوی سەردەمێکی تر و ئایدۆلۆژیایەکی تر و کەسانێکی تر کە ناتوانن سەلەف دووبارەبکەنەوە، چونکە مەرج نییە سەلەفەکانی پاشەرۆژ هەمان ئاکاری سەلەفی ئەمرۆ دووبارەبکەنەوە. واتە تیورە کە بەرجەستەبوونی هەڵهاتنمانە لە دیار، بەوەدا کە پێگەی مێژوویی تاک

نیشاندەداتەوە، لە جیهانێکدا کە تاک تێیدا لە گەمارۆیەکی کوشندەدا دەژی، بەناچاری «تیورەیەکی ڕەخنەیی»یە.. تازەگەرییەک لەواقعی ئێمە دا نایەتە پێشێ بەبێ ستراتیژێکی ڕەخنەیی بەربڵاو و سەرتاسەری، پاشەڕۆژی تازەگەریی، هەر هەمان پاشەڕۆژی ڕەخنەیە، کاتێک شوێنپێ ستراتیژییەکانی خۆی و ڕوانینە ڕادیکاڵەکانی خۆی جێناهێڵێت.

لەپشت تیورەوە، ڕۆشنبیرییەک دەبێتە خاوەنی شوێنی ستراتیژی خۆی وە هەر لەوێشەوە ئەو چاوە پەیدادەکات کە بتوانێت هەموو کۆسپ و ڕێگرە ستراتیژییەکانی جاران ببینێت. تیورە بۆ ئێمە ڕێکخستنەوەی دونیایە، بەڵام بەرلەوەی کە ڕێکخستنەوەیەکی نوێ و مەعریفی بێت بۆ جیهان، هەستکردنە بە ئازادییەکی گەورە و فرینێکی تەنیا. بەرلەوەی هەنگاونان بێت ڕووە و دیسپلینێکی مەعریفیانە بۆ عەقڵ، هەستکردنە بە ئازادییەکی ڕۆحی. ئازادی لە تازەگەریی جیانابێتەوە، لەبەرئەوەی تازەگەریی لەجەوهەردا هوشیارییەکی قووڵە بەزیندان، زیندانێک یەکەمجار لەو بێدەنگییەدا دەیدۆزینەوە کاتێک جیهانی سەلەف بەبێدەنگی، یان بەزەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕانەوە وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە. تازەگەر لە ساتێکدا لەدایکدەبێت کە هەستبکات ڕابردوو دەبێت بمرێ، بێگومان مراندنی دیار و مراندنی ڕابردوو بەمانای بایەخنەدان یان توڕدانی ڕابردوو نایەت، بەڵکو بەمانای کۆتاییهاتنی دەسەڵاتیان دێت. تازەگەر ئەو مرۆڤە نییە کە پشتدەکاتە ڕابردوو، تازەگەر ئەو کەسەیە کەڕابردوو ناتوانێت ڕکێفیبکات، بەڕاشکاویش ئەو ڕاستییە ڕادەگەیەنێت کە دیاری سەلەفی و دێرین چیتر دەسەڵاتی مەعریفی نەماوە و هێزی هێزێکی سیاسییە «هەڵبەت بە مانا بەرفراوانەکەی سیاسەت»... دیار لای تازەگەر لەوە دەکەوێت کە خودی بیرکردنەوەبێت، بەڵکو دەبێت بە بابەتی بیرکردنەوە، بۆیە ساتەوەختی یەکەمەکانی تازەگەریی هاوشانی ئازادییەکی بێسنوورن. تازەگەر لە جیهانێکی بێقەید و بەندا دەژی، هیچ مەعریفەیەکی باڵادەست لەگۆڕێ نییە، هیچ مەرجێ لەگۆڕێ نییە، مەرجی بڕینی تاریکی و نادیار نەبێت.. لەو ساتەدا کە دیار دەکەوێتە بەر ڕەحمەتی خوێندنەوەکانی

تازەگەرییەوە، دیار دەبێت بەبێدەسەڵات و تازەگەر دەبێت بەدەسەڵاتدار. بەمجۆرە تازەگەر لەپاڵ سیفەتی ئازادییەوە، جۆرە پراکتیکێکی نوێ پیادەدەکات، کە لەڕووی ئەخلاقییەوە هەڵوێستێکی نەهەلستییە بەرامبەر بە دیار وە لەڕووی مەعریفییەوە خوێندنەوەیەکی توێکاریانەیە بۆی ... بەمجۆرە تازەگەریی جۆرێکە لە تیرۆرکردن، تازەگەر خۆشی بەشێوەیەک لە شێوەکان تێکدەرێکی هاوچەرخ و هاوساتە.

تیورە دەبێت بەبەشێک لە دیارێکی نوێ، وەکو دیارێکی تازە دەبێت بە مەڵبەندی سیستمێکی تازەی گووتار، وەکو تیورەش یان دەبێت مردنی خۆی ڕاگەیەنێت و بەرەو بوون بە ئایدۆلۆژیا بڕوات و ببێت بەڕێگرێکی ئەبستمۆلۆژی یان لەپشت خۆیەوە درێژکراوە تیورییە تازەکان بەردەوامیدەدەن بەو گەشتەی کە ئەو لە نادیاردا دەستیپێکردووە. واتە دوو جۆرە تیورەمان هەیە، تیورەیەک کە ساتەوەختی بە «دیارکەوتن ـ انکشاف»ـی ساتەوەختێکە کە ئیدی لەپشتییەوە پرۆسەی شکاندنی نادیار لەڕێگای تیورە و کەرەستەکانییەوە کۆتاییدێت... واتە بە دیارکەوتنی تیورە لە هەمان کاتدا، لەکارکەوتنی تیورەیە لە بڕین و شکاندنی نادیاردا، سەرجەمی پرۆسەکانی دیکەی تیورەش پرۆسەی «دەرکەوتن ـ الظهور» دەبێت «بێگومان ئەمە بەرەچاوکردنی ئەو دوو مانایەی دیارکەوتن و دەرکەوتن کە لەسەرەتاوە دیاریمانکرد ـ دیارکەوتن: بەمانای گواستنەوە لەنێوان دیار و نادیاردا. دەرکەوتن: بەمانای گواستنە وە لەنێوان ئاشکرا و نائاشکرادا». جۆری دووەمیش، جۆرێکە لە تیورە کە پرۆسەی دیارکەوتن، پرۆسە و تواناکانی تیورە لەکارناخات، واتە تیورە تاماوەیەکی درێژ دینامیکییەتی خۆی بەزیندوویی و بەچالاکی ڕادەگرێت و بەئاسانی لەهەڵکۆڵینی نادیارەوە دانابەزێت بۆ ئیشکردنێکی سادە لە سنووری چالاکییەکانی دیاردا.

بەڵام ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە بڕوانین، ڕاستەوخۆ پرسیارێکی گرنگ دەبینینەوە کە پابەندی تازەگەریی و لەکارکەوتنی تازەگەرییە: ئاخۆ کە مەعریفە لە کارکردنی ناو نادیارەوە دەگوازێتەوە بۆ کارکردنی دیار... تا

چ ئەندازەیەک لە خولیای تازەگەریی دەکەوێت و خەسڵەتی ئەو لە کارکەوتنەش چییە؟ بەڕای من هەرکات تازەگەریی «کە لەڕێگای تیورەوە شوێنێکی ستراتیژی نوێ داگیردەکات» گەیشتە ئاستێک لە دەسەڵات شوێنی گۆشەنیگا ستراتیژییەکانی تر زەوتبکات و بە زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕەوە، کە زەردەخەنەی سەلەفییەتە، سەیری ئەو پرسیارانە بکات کە خۆی ناتوانێت وەڵامیانبداتەوە... وە هەرکاتێک ویستی وەڵامی سەرتاسەری بداتەوە، مێژوویەکی سەرتاسەر و داتاشراو لە مێژووی خۆی بخوڵقێنێ «هەڵبەت وەڵامی سەرتاسەر لێرەدا تەواو لە چەمکی خۆبینین جودایە و مەبەست لێی ئەو کلێشە گشتیانەیە کەدیدێک بەسەر هەموو گرفتە جۆراو جۆرەکاندا دەیسەپێنێ». هەرکاتێک هەستی بەو بێدەنگییە نەکرد کە نەوە تازەکان هەستی پێدەکەن، ئەو کات لە تازەگەریی کەوتووە و بووە بەبەشێک لە بونیادێکی دیکە کە بەرەو خۆسەپاندن دەڕوات. ڕەنگە لێرەدا یەکێک بپرسێت: ئەی شوێنی جیهانبینی لەم گەمەیەدا دەکەوێتە کوێوە؟ جیهانبینی بەناو نادیاردا سەفەرناکات، جیهانبینی ئەو ئاستەیە کە تێیدا تیورە لەناو دیاردا لەتەک چەندین بەشی دیکەدا دەچێتە ناو پەیوەندییەکی ئۆرگانییەوە کە سەرجەم عەقڵێکی یەکگرتوو و گشتی پێکدەهێنن، واتە جیهانبینی یەکگرتنەوەی چەند ئاستێکی تیوری و گووتارییە لە یەکەیەکی گشتیدا کە دەبێ بەهەڵگری نیشانەکانی عەقڵییەتێکی دیاریکراوی دەستەیەکی دیاریکراو لەساتێکی مێژوویی دیاریکراودا. داڕشتنی جیهانبینی تەنها لەم ساتەدا واڕێکەوتووە لە کولتووری بەرهوتی ئێمەدا پەیوەندییەکی زۆر ئۆرگانی بەتازەگەرییەوە هەبێت، وەکو تر دەشێت جیهانبینی زۆر سەلەفیانە هەبێت کە جەستەی بە گووتار و تیوریی زانستی داڕێژراوە، کە بەکۆ ڕۆڵی ڕێگرێکی مەعریفی دەبینن، بەڵام ئەم حاڵەتە سیفەتی ڕۆشنبیرییە گەورەکانی دیکەیە، نەوەک سیفەتی ڕۆشنبیرییەکی هەژاری وەک ڕۆشنبیریی کوردی.

ئەی جیاوازیی نێوان دیاری جیهانبینی چییە لەگەڵ ئەو سیستەمە دیارەی کە ئێمە لە قەڵەمڕەویدا دەژین؟ جیاوازیی دیاری جیهانبینی لەگەڵ ئەو

سیستمە دیارەی کە ئێمە تیایدا دەژین ئەوەیە، دیاری جیهانبینی لە پشتییەوە تێگەیشتنێکی سەرتاسەر هەیە لە جیهان، لە مێژوو، لە بونیادی کۆمەڵایەتی. لەکاتێکدا دیاری ئێستا دیارێکە گووتارەکانی خۆی نەبێت هیچی دیکەی بۆ ڕۆشن ناکرێتەوە. «خۆڕۆشنکردنەوەیەک کە چەکی سەرەکی تیایدا زمانێکی ئینشائییە». دیارێکە هەر سەرکێشییەک بۆ شکاندنی، سەرکێشییە لەناو نادیاردا، وە شکاندنی پێویستی بە هەڵوێستێکی ڕادیکال و بەزەبر هەیە، واتە دیاری ئێستا دیارێکە بێجیهانبینی، لەساتێکدا جیهانبینیش بۆخۆی یوتۆبیای گەورەی تازەگەرییە لە کولتووری ئێمەدا .

## خوێندنەوەی بونیادی «دیار» و گەڕانەوە بۆ «گووتار»

لەم بەشە بەدواوە دەستبەرداری قسەکردن دەبین لەسەر یوتۆبیاکانی ناو «نادیار» و هێدی هێدی دەگەڕێینەوە بۆ سەر زەمینی ڕاستەقینەی کارکردن، ئەو زەمینەیەی کە کەسانی پێش ئێمە خوڵقاندویانە و ئێمە لە وێوە سەرمان دەرهێناوە. واتە بەئاڕاستەی «دیار» دەجوڵێینەوە. دەڵێم بەئاڕاستی دیار، چونکە جیاکردنەوەمان بۆ دیار و ئاستەکانی و نادیار و یوتۆبیاکانی ناوی یەک مانای هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە مەودایەکمان لەهەریەک لە «دیار/نادیار» وەرگرتووە. ئێستا دەمانەوێت جارێکی دی و بەستراتیژێکی ترەوە بگەڕێینەوە بۆ ناو دیار، واتە بۆ ناو ئەم سیستمە ڕۆشنبیرییەی ئێستاکە. دەگەڕێینەوە نەوەکو بۆ ئەوەی خۆمانی بۆ ئاشکرابکەین، بەڵکو بۆ ئەوەی ئاشکرابیکەین، بەنیازێکی خراپەوە بەرەو باوان دەبینەوە. دەزانین کە دیار کرۆکێکی هەیە لە خانە تاریکەکانیدا خۆی مەڵاسداوە، لەو جێگایەدایە کە دیار خۆی ئاگاداری نییە. ئەی تازەگەریی چییە، ئەگەر ئاگاداری نەبێت لە سەلەف، ئەگەر ناسینی سەلەف نەبێت زیاتر لەخۆی؟. دیار و تۆینەرەکانی ئەو پانتاییە نابینن لە پرسیار و کێشە کە بەجێیانهێشتووە، چونکە نەپرسیار لە جەوهەری

خۆیان دەکەن، نەپرسیاریش لەو پانتاییانە دەکەن کە بەجێیانهێشتووە. ئێستا کە دەگەڕێینەوە ڕاستە و ڕاست دیار دەخەینە بەردەمی کۆمەڵێک پرسیار کە لەوەوبەر لێی نەکراوە... بۆ یەکەمجار کۆی بونیادێک دەکەوێتە ژێر لێپرسینەوەیەکی گشتی. ئەمەش ئاساییە، چونکە تازەگەریی پرۆسەیەکی ڕەخنەگرانەی قووڵ و بێوەستانە، پرۆسەی لە خۆپرسینەوەی ڕۆشنبیرییەکە بۆ خۆی.

## سەرچاوەکانی گووتار یان جیهانی وەدەرنراو لە گووتار

دوای ئەوەی ئاینی نەتەوەکانی تر جیهانیان بۆ ئێمە ئاشکراکرد، ئیتر چیتر پێویستیمان بە دۆزینەوەی جیهان نەبوو. هەر لەبەرئەوە کاتێک نوسین دێتە مەیدان نادیاری یەکەمی ئێمە «جیهان» نییە... واتە هەر لە سەرەتاوە تەفسیرکردنێکی کوردیانە بۆ جیهان نەبۆتە خولیای ئێمە. کە کوردی نوسین دەستپێدەکات خودی خۆ نمایشکردنی زمانەکە بایەخێکی ستراتیژی وەردەگرێت، نەوەک خودی تێڕامان و بیرکردنەوە بە کوردی، کێشەی گەورە لەوکاتەدا و تائەمڕۆش ئەوە نییە «چۆن جیهان تەفسیربکەین؟» بەڵکو کێشەی سەرەکیمان ئەوەیە «بەچی جیهان تەفسیربکەین؟». واتە کورد بەحوکمی قەبووڵکردنی بۆ ئیسلام لە دوای جیابوونەوەی دیدگای خۆی ناگەڕێت، بەڵکو لەدوای جیابوونەوەی کەرەستەکانی تەعبیر لەخۆی دەگەڕێت. واتە لە هەمان قاپ دەخوات، بەڵام دەیەوێت کەوچکی خۆی هەبێت. نادیاری یەکەم لای مرۆڤی کورد پانتاییەکی مەعریفی نییە بیدۆزێتەوە، حەقیقەتێک نییە، لابەلاکردنەوەیەکی کوپەرنیکۆسیانە نییە ئاشکرایبکات، بەڵکو نادیاری یەکەم ئەو کەرەستەیەیە کە گووتاری کوردی دادەڕێژێت.. ئەویش «زمان»ـە. زمان نادیاری یەکەمی ئێمەیە.. ئاماژەیەکی کوژراوە بۆ خودێکی نەتەوایەتی کوژراو، پارچەیەکی کەینونی ناو کەینونەیەکی نادیارە. زمان کە دێت... کە هاتنی خۆی دووبارەدەکاتەوە، وەکو

نادیارێک دێت... سەرەتا لەسەر دەستی شاعیرە کلاسیکییەکان بەئاگادێتەوە. شیعری کلاسیکی ئێمە ئاشکرابوونی جەوهەری زمانێکی شاردراوەیە. زمانی کوردی کە لە تاریکییەوە دێت، هێشتا پەلاماردانی جیهان نەبۆتە ستراتیژی سەرەکی لەلای، نەبۆتە شوێنگەیەک بۆ تێڕامان لە دونیا، بەڵکو دێت و خۆی نمایشدەکات و خۆی ئەجەربێنێ، واتە دەسەڵات تیایدا دەسەڵاتی «مەدلول» نییە، دەسەڵاتی «دال»ـە، دەسەڵاتی «مانا» نییە، دەسەڵاتی «وشە»یە.

ئەگەر جیهان یان سروشت یان هەر پانتاییەکی دەرەکی تر لە سنووری گووتاری شیعری کلاسیکیشدا دەرکەوتبن، پێویستە ئەوە ئاشکرابکەین کە ئامادەگیان ئامادەگییەکی ستراتیژی نییە، بەڵکو لەڕاستیدا زمانی شیعری کلاسیکی خۆی دەبێتە خیتابی خۆی. مانای شیعری کلاسیکی ئێمە تاقیکردنەوەی زمانە بۆ ئیرادەی خۆی، کە دێتە پێشێ بۆ ئەوە نایەت کە ئەزموونی خۆی لەناو جیهاندا تاقیبکاتەوە، ڕوو ناکاتە دونیا، ڕوو ناکاتە شتەکان. واتە دونیا ناتوانێت زمان بکات بەکەنالێک بۆ بەرجەستەبوون، بەڵکو زمانە کە دونیا دەکاتە بابەتێک بۆ ئەزمونکردنی توانستە خەفەکراوەکانی خۆی، هەموو خوێندنەوەیەکی گشتی بۆ شیعری کلاسیکی ئەوەمان بۆ ئاشکرادەکات، شیعرێک کە جیهانی واقعی و مێژوویی و کێشە وجودییەکانی مرۆڤ پانتاییەکی زۆر بەرتەسکیان داگیرکردووە، بابەتەکانی شیعر هەمان بابەتە هەستبزوێنە ئاساییەکانن، هەمان بابەتە ئایینیە ناسراوەکانن، هەمان ترس و سکاڵا و بالۆرەی دینییە. دینە کراوەتە شیعر، هەمان شەوق و شێتی عەشقە کراوەتە شیعر. سەیرترین شت لە دونیای شیعری کلاسیکیدا بەرتەسکی بابەتەکان و بەرفراوانی ڕووبەرەکەیەتی... هەر ئەم دژایەتییەش، دژایەتی نێوان زۆرایەتی دەق و کەمایەتی بابەت، ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ کە زمان بەشێوەی جۆراوجۆر ئیرادەی خۆی تاقیدەکاتەوە و بابەتیش تەنیا بەهانەی ئەو تاقیکردنەوەیەیە «ئەگینا دەبێت ئەزمونی شاعیرێکی وەکو وەفایی بەچی بشوبهێنین کە دەیەها پارچە شیعری تەنیا لەسەر بابەتی عەشق هەیە،

کە کۆی دیوانەکەی دروستدەکەن».

لە شیعری کلاسیکدا، نێرجسییەتی زمان، پیشاندانی توانا ڕەوانبێژییەکان، سەرەتای سەرەتاکانە، واتە لەو کاتانەشدا کە زمان وەسفی جیهان دەکات، لەڕاستیدا وەسفی خۆی دەکات، نادیاری خۆی ئاشکرادەکات، بۆ ئەوەی ببێتە دیار جەستەی خۆی نمایشدەکات، شیعر دەبێتە سێرکی زمان... شیعر لەم ئاستەدا خۆی تاقیدەکاتەوە، نالی لە چرکەیەکی بلیمەتانەدا تەعبیر لەو دیوە گرنگەی هاوکێشەکە دەکات، کاتێک دەڵێت *«لەفزی شەکەرباری من، کوردی ئەگەر ئینشائەکا ـ ئیمتیحانی خۆیە مەقسودی لە عەمدا وائەکا»*. زمان لە کلاسیکدا «ئیمتحانی خۆیە مەقسودی» وە نالی واتەنی «لەعەمدا وائەکا». سەرچاوەی یەکەمی گووتار «ئیمتحانی» زمانە بۆ خۆی.

هەموو ئەم ڕاستیانەش یەک مانایان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە «جیهان لە گووتار وەدەرنراوە». ئەو ئەدەب و نوسینەی بە کوردی بەرهەمدێت، مەبەستی نییە دونیا بخوێنێتەوە، مەبەستی نییە تێفکرێت، مەبەستی نییە ڕامێنێت، مەبەستی نییە ڕاڤەبکات، بەڵام مەبەستێتی دەنگی بەرزی خۆی ببیستێتەوە کە قسەدەکات، مەبەستێتی لە ڕێگای وشەکانەوە سەدای بوونی خۆی ببیستێتەوە، ببینێت کە ئەویش هەیە و زیندووە. جیهان سەرچاوەی سەرەکی پرۆسەی گووتار نییە، وە زمان سەرکێشییەک نییە لە جیهاندا، ڕۆچوونێک نییە بۆ ناو کێشەکان، گووتاریش کرانەوەیەکی ئاشکرا و ڕاستەوخۆ نییە بۆ جیهان. واتە لەسەرەتاوە دابڕانێک هەیە لە نێوان سیستمی مەعریفی و کەرەستەکانی کاری مەعریفی لەلایەک و جیهان لەلایەکی تر. زمان نایەت تا ڕەهەندە جیاجیاکانی جیهان ببینێ، بەمجۆرە لە گۆشەگیری موتڵەقی خۆیدا دەژی، دوور لە دەسەڵات بێئەوەی زمان کارێکی ڕاستەوخۆی تیابکات، گەمارۆی بدات، ببیڕێت، پۆلینیبکات، وەسفیبکات، لەڕووی زەمەنییەوە قۆناغ قۆناغی بکات، ئاستە جیاوازەکانی دیاریبکات. زمان خەریکی ئەکسسوارەکانی خۆیەتی، خەریکی خۆڕازاندنەوەی خۆیەتی، خەریکی بەلاغەت و جیناس و مەجاز و

کنایەکانی خۆیەتی، سەرقاڵی دۆزینەوەی ریتمی جیاجیایە، هەتا لە وەسفی کلاسیکی کوردیدا «شوبهێنراو» و «پێشوبهێنراو» لەیەکدی نزیک ناکەونەوە. خەسڵەتە ستاتیکییەکانی ئافرەت لە شیعری کلاسیکیدا، جیاوازە و گەلێ دوورە لە خەسڵەتە واقعییەکانی. دنیا لەناو شیعردا، دونیای شیعرە، نەوەکو شیعری دونیا بێت... واتە شیعری کلاسیکی بەشیعریکردنی جیهان نییە، بەڵکو شیعر لە جیهان ئازادە و وەزیفەی نییە لەو بچێت. لێرەدا دەپرسین: ئەی شیعر ئەگەر دونیا نیشان ناداتەوە، ئەگەر جیهان پانتاییەکی وەدەرنراوە لە شیعر، شاعیر «خودی قسەکەر» چۆن و بەچ شوناسێکەوە دەچێتە ناو ئەو ئەزمونە و لێیدێتە دەرەوە؟ لە ڕاستیدا گرنگی شاعیر و فەردییەتی لەسەرەتادا پابەندی بابەتی هەڵبژاردنەکەیەتی، ساتەوەختی یەکەمی شاعیر لەناو ئەو هەڵوێستەدایە کە دەچێتە ناو پراکتیککردنی زمانێکەوە کە پێشتر پراکتیک نەکراوە، خۆی دەداتە دەست ئیرادەیەک لەوەوبەر تاقی نەکراوەتەوە، بەڵام شاعیر لەپشت ئەم هەڵوێستەوە پتر لەوەی کە سیمای خۆی ئاشکرابکات، سیمای پێکهاتەیەک ئاشکرادەکات. لەم ئاستەدا فەردییەتی شاعیر لە سنووری هەڵبژاردنی زماندا دەوەستێت، نادیاری شاعیر تەسلیمی سەرکێشییەکانی زمان دەبێت، زەخرەفەی زمان دەبێت بە سیمای شاعیر، دەقی شیعریش لەبری ئەوەی ببێتە دەرگایەک بۆ سایکۆلۆژییەتی شاعیر، یان هەڵوێستە عەقڵییەکانی ئەو، یان تایبەتمەندێتی چرکەساتە شیعرییەکانی شاعیر، دەبێتە دەرگایەک بۆ توانستی زمانەوانیانەی شاعیر، واتە شاعیر دەبێتە مەیدانی بەرجەستەبوونی تواناکانی زمان. لێرەوە پەیوەندیی نێوان شاعیر و جیهان لە سنووری پەیوەندییە تەقلیدییەکانی دەرناچێت کە ئاستە دەلالییە ساکارەکان هەڵیدەگرن. دووریی زمان لە جیهانەوە، دەبایە نزیکییەکی پێببەخشێت لە خودی شاعیرەوە، بەڵام ئەو نزیکییە لەئاستی پەیوەندییەکی سۆزدارانەی نێوان دەق و شاعیردا وەستاوە و هەر لەویاشدا مردوە.

لەڕاستیدا ئەم پێکهاتە ئاڵۆزە تەنیا شیعر دەتوانێت کۆیبکاتەوە، چونکە

شیعر تەنیا کایەیەکە لەگەڵ نێرجسییەتی زمان و گۆڕینی مانای دونیا و دورکەوتنەوە لەواقع و پەرستنی جونکاریدا تەبادێتەوە... سەروەریی شیعر لە سەردەمە دێرینەکاندا، ڕەنگدانەوەی کێشەیەکی ئەنتۆلۆژی - فەرهەنگی - مێژوویی ئێمەیە، هەموو ئەم ڕێگایانەش بەرەو ئەو ڕاستییەمان دەبەن کە شاعیریش دوور لە جیهان ماڵی خۆی دروستدەکات، وە نزیک لە «فەنتازیاکانی زمان» نیشتەجێدەبێت. ئەمەش کێشەیەکی ترمان بۆ دروستدەکات کە کێشەی دوورکەوتنەوەی شاعیرە لەڕۆحی سەردەم و قۆزاخەبوونی لەناو زەمەنێکی بەرتەسکدا، شاعیر لەم ئاستەدا چرکەیەکی بچوکی مەعریفی بەرجەستەدەکات، چرکەیەک کە لەڕابردوو و داهاتوودا درێژکراوەی نییە، گووتارێکیش پیادەدەکات کە ناوی دەنێم «گووتاری تاک ڕەهەند».

***گووتاری تاک ڕەهەند***: ئەو گووتارەیە کە ئاسۆی گەشەسەندنی نییە، واتە گووتارێکی شیعری - ڕۆشنیرییە کە دووبارەنابێتەوە، لەدوای تەواوبوونییەوە هیچ گۆشەنیگایەکی دیکە، هیچ کەسێکی دیکە ناتوانێت لەو خاڵەوە دەستپێبکاتەوە کە ئەو کۆتایی پێهێناوە، بواری کۆڵین و دۆزینەوەی تێدا نییە، ساتەوەختێکە، پرسیارێکە، وێنەیەک بۆ خۆی دەدۆزێتەوە و دێتەدەرێ و ئیدی دوای دەرکەوتنی دەمرێت، ئەزموونێکە لە پشت خۆیەوە نادیارێکی بچوک جێدەهێڵێت. گووتارێکە تەعبیر لە تەسکترین و کورتترین چرکەی زەمەنی دەکات. «گووتاری تاک ڕەهەند» ئەگەر نهێنییەکیشی هەبێت، کرۆکی بونیادێک ئاشکراناکات... نهێنییەکە تەنیا بەگێڕانەوەی بۆ ناو ناوکۆییەکی «سیاقێکی» گەورەتر مانای خۆی وەردەگرێت، گووتارێکە لە دەرەوەی خۆی درێژکراوەی نییە. گووتاری تاک ڕەهەند تەنیا یەکجار سەیری دیاردەیەک دەکات و جارێکی تر ناچێتەوە سەری، شیعریش زەمینەیەکی چڕ و بەپیت و گونجاوە بۆ ئەو جۆرە گووتارە تاک ڕەهەندە... شیعر بەحوکمی سروشتی خۆی، ئامێز بۆ خیتابی تاک ڕەهەند دەکاتەوە، چونکە شیعر هەرگیز لەو شوێنەوە دەستپێناکاتەوە کە شیعرێکی دی دواییدێت، واتە ئەگەر وردتر

قسەبکەین، شیعر هەمان ساتەوەخت دووجار دووبارەناکاتەوە. یەکجار بەیەک گۆشەنیگا دەڕوانێت، ئیدی جارێکی دی ناتوانێت بگەڕێتەوە ناو هەمان نیگا و هەمان خاڵی وەستان و هەمان پراکتیکی زمان. شیعر خۆی نوقمبوونە لەناو ڕوانینێکدا کە دووبارەکردنەوەی دووبارەکردنەوەیەکی ڕەسەن نییە، بەڵام ئەگەر ئەم خەسڵەتەی شیعر بوو بە خەسڵەتی مەعریفەتیش ئەوا دەبێتە مەعریفەیەکی تاک ڕەهەند و مردو... کێشەی «نالی» و «حەبیبە» بەتایبەتمەندێتییەکانی خۆیەوە لە ئەزموونێکی تردا دووبارەنابێتەوە، بەڵام پرسیاری «مەعریفە» بەردەوام خۆی دووبارەدەکاتەوە.. گووتاری مەعریفی بەپێچەوانەی گووتاری تاک ڕەهەندە وە هەمیشە درێژکراوەی خۆی هەیە، هەمیشە پیاچوونەوەی هەیە: کە کیرکجارد سەبارەت بە «پەشۆکان» دەدوێت و دەپرسێت: دەبێت پەشۆکان چی بێت؟ ئەم پرسیارە لەدوای کیرکجاردەوە بەردەوامی هەیە و درێژدەبێتەوە، دووبارەدەبێتەوە، کەمارکس لەسەر ململانێی چینایەتی و گەشەی مێژوو دەدوێت، ئەم گووتارانە دواتر بە چەندین چەشن درێژکراوەی خۆیان هەیە، کە فرۆید لە سیکسوالیەتی منداڵ دەدوێت بەهەمان شێوە ئەم گووتارە درێژکراوەی خۆی هەیە... گووتاری مەعریفی بەپێچەوانەی گووتاری تاک ڕەهەندەوە کێشەیەک دەخاتە ڕوو کە لە هەموو ساتێکدا بەشێوەیەک، بەوەڵامێک، بەدیدێکی تایبەتییەوە دێتە پێشێ، خیتابی مەعریفی ڕاستەقینە کێشەیەک دەخاتەڕوو کە سات لە دوای سات و قۆناغ لە دوای قۆناغ وەڵامی جۆراوجۆر دەدرەوشێتەوە.

لێرەدا دەگەڕێینەوە بۆ کێشەی زمان و جیهان، وەکو گووتمان شیعری کلاسیکی لە جیهان پچڕاوە، سەرچاوەکانی گووتاری کلاسیکی هەڵقووڵان و بە «دیارکەوتنی» نادیاری زمانە. بەڵام ئایا هیچ هەوڵدانێکی گونجاندن و کۆکردنەوەی ئەو دوو پۆڵە لەگۆڕێ نییە؟ لەڕاستیدا خەتێکی نهێنی هەیە کە پاڵ بەو دوو پۆڵەوە دەنێت بۆ نزیکبوونەوە لەیەکدی. «گۆران» جیدیترین هەوڵدەرە بۆ دروستکردنەوە و بیناکردنەوەی ئەو پەیوەندییە پچڕاوە، چەکی گۆرانیش بۆ ئەم فرمانە، زمانی وەسفییە. ئەو جیهانەی

لەوەوبەر تەنیا کەناڵێک بووە زمان ئیرادەی خۆی تیا تاقیکردۆتەوە، لای گۆران دەبێتە پوڵێکی سەرەکی ناو هاوکێشەکە، وە بۆ یەکەمجار لای گۆران سروشت وەکو بابەتی سەرەکی سەرکێشییەکانی زمان و سەرچاوەی یەکەمی گووتارەکان خۆی دەسەپێنێت... ئێجگار سەیرە کە تەنیا لە ساتەوەختی «گۆران»دا ئەدەبیاتی نوسراوی ئێمە دونیا دەدۆزێتەوە، سروشت دەدۆزێتەوە، ئەوەش سەلماندنی ئەو ڕاستییەیە کە گووتاری ئەدەبی ئێمە دوور لە دونیا لەدایکبووە، لە دونیای موجەرەداتی دینی و عاتیفی و سیاسیدا. هەڵبەت کە ئەوانەش بەشێکن لە دونیا، بەڵام ئەم گووتارە هەرگیز ئاماژە نییە بۆ واقیعێکی کۆنکرێت، بۆ دونیایەک کە شتەکانی تیا ڕوودەدات، بۆ دەروونێکی قسەکەر لەسەر خۆی. بۆ نمونە لە شیعری کلاسیکدا قسەیەکی زۆر لەسەر ژانی عاتیفەکان دەبیستین، بەڵام قسەیەکی زۆر کەم لەسەر کەسی هەڵگری عاتیفە، لەسەر جۆری ئەو پەیوەندییەی کە ئەم عاتیفەیەی دروستکردوە، جۆری ئەو دونیایەی کە ئەم عاتیفەیە تێیدا لەدایکبووە .. دونیای شتە واقیعییەکان، مێژووی شتە واقیعییەکان، نهێنی مرۆڤ هەمیشە لای ئێمە هەسارەیەکی دووربووە، شاعیر ئەو کەسە نەبووە کە جوان لە دونیا دەڕوانێت، ئەو کەسەبووە کە جوان زمان بەکاردەهێنێت. گۆران یەکەم هەوڵدانە بۆ سوڕانەوە لە خولگەکەیدا. گۆران لەڕێگای وەسفەوە هەوڵدەدات دونیا بخولقێنێتەوە. لە وەسفدا جیهانیش ئامادەبوونی خۆی دەسەلمێنێت و زمانیش خۆی نمایشدەکات.

زمانی وەسف، خاڵی هاوسەنگی نێوان «ستاتیکای زمان» و «ئامادەگی جیهان»ـە. بەڵام ئەو جیهانەی لە شیعری گۆراندا دەردەکەوێت، جیهانێکی پاسیڤ و سەلبییە بێ دینامیکیەتی مێژوو، دونیایەکە لەبەردەم وشەکاندا وەستاوە بۆ وەسف، جیهانێکە ئاڵۆزی و کێشە و جەوهەر و گرفتی بەلاوەنراوە، بۆ ئەوەی ڕووکەشە ستاتیکیە ڕووتەکەی بەرجەستەبکرێت، ئامادەبوونی لە ئامادەبوونی کچی مۆدێل دەچێت لە پێش دەم وێنەکێشێکدا. لە ساتەوەختی گۆرانەوە جیهان بە سەلبی

ئامادەیە، هەڵبەت سێبەری ئەم دنیا واقیعییە لای پێرەمێرد و قانعیش دەردەکەوێت، بێئەوەی هیچیان ئەو زمانە وەسفییەی گۆرانیان هەبێت. زمان لای گۆران لەوە دەردەچێت، خەریکی خۆ جوانکردن و خۆ ئەزمونکردن بێت، دەبێتە زمانێک کە لەخزمەتی وەسفی دونیادایە. سەنتەری بایەخدان لای شاعیر چیتر خودا یان حەبیبەیەکی نادیار و ئایدیالیزەکراو نییە، جوانی شتێکی میتافیزیکی نییە، بەڵکو بوونێکی مەتریالی و واقعی و چاوگیری هەیە. جیهان جیهانێکی بێ جووڵەیە و رابوردووی دیارنییە، ئێستای دیارییە، پاشەڕۆژیشی بەتەمی ئایدۆلۆژیا گەمارۆدراوە، شیعریش کەرەستەی وێنەگرتنی ئەو وەستانەیە. لێرەوەیە کە تێنەگەیشتن لە پەیوەندیی نێوان زمان و جیهان یەکێک لە وەهمە ئەکادیمییە گرنگەکانی خوڵقاندووە، ئەویش شوبهاندنی قۆناغێکی شیعری گۆرانە بە واقعییەت، واقعییەت ڕێبازێکە سەرەکیترین خەسڵەتی ئەوەیە کە شتە گشتییەکان، ڕۆحی گشتیی سەردەمێک لە پانتایی و نموونە بچوکەکاندا بەرجەستەدەکاتەوە، واتە دۆزینەوە و وێنەگرتنەوەی گشتییە لە تایبەتیدا. بەڵام لە ئەزمونی گۆراندا واقیع بەمانا مێژوویی و گۆڕدراو و زەمەنییەکەی بەتەواوەتی ونە، ئەو واقیعەی گۆران وێنەی کێشاوەتەوە، واقعی سروشتە لەلایەک و واقعی جیهانە بەوێنە ئایدۆلۆژییەکەی نەوەکو بەوێنە ڕاستەقینەکەی خۆی. لەڕاستیدا وێنەی ئایدۆلۆژی دونیا، مانای وێناکردنی دونیا نەوەکو دیتنی وێنەی ڕاستەقینەی دونیا. لێرەوە وێنەی جیهان لای گۆران هێشتا وێنەیەکی یەککگرتوو، سازاو، بێناکۆکی، یەکپارچەیە کە تیایدا «*چەند بەئاهەنگ چەند سیحراوی — ئەگەرێ قاز یان مراوی*». گۆران مەترسییەکانی پێش خۆی و دوای خۆی نابینێت، بە یەک ئاست سەیری دونیا دەکات، تا سەر ئێسقان لە کانی گووتارە ئایدۆلۆژییەکانی سەردەمی خۆی خواردۆتەوە. وەک دەزانین تازەگەرییش هەر لەسەرەتاوە ئاشکراکردن و دەرخستن و دژایەتی ئەو وەهمانەیە... لێرەوە دیدە ئایدۆلۆژییەکانی گۆران لەسەر واقع و وێنەگرتنی وەسفیانەی بۆ سروشت، تا ئەندازەیەکی زۆر سیفەتی ئەزمونێکی ڕادیکاڵی لێدەستێنێتەوە و لەبری ئەوە شانازیی هەندێک تازەکردنەوەی تایبەتی

پێدەبەخشێت لەهەندێ پانتایی دیاریکراودا، بێئەوەی توانای ئەوە هەبێت ئەو تازەکردنەوانە لە وێنەی هەڵوێستێکی بەردەوامدا دووبارەبکرێتەوە... ڕەنگە گرنگترین ئەو تازەکردنەوانەش گۆڕینی ئاراستەی پەیوەندیی نێوان شیعر و جیهان بێت، وە ئەو هەوڵدانەبێت بۆ بەخشینی ڕووبەرێکی نوێ بەجیهان. گۆران جیهان لە مەنفای شیعری کلاسیکی ئازاددەکات، بەڵام لە بری مەنفا لەناو مەلەکوتی شیعردا بە دەستبەسەری دەیهێڵێتەوە. جیهانی گۆران جیهانێکی یەک دیو و وەستاوە، کە تەنیا جوانی خۆی نیشاندەداتەوە، گۆران لەدوی جیهان ڕاناکات، بەڵکو لەدوی جوانی ڕادەکات، واتە دواجار گۆران حەقیقەتی جیهان ناهێنێتە ناو کایەی گووتارەوە، بەڵکو جوانی دونیا دەهێنێتە ناو کایە گووتارەکانەوە.

گۆران جیهانێکی تاک ڕەهەند دەهێنێتە ناو زمانێکی تاک ڕەهەندەوە، ئەو تاکەڕەهەندەی جیهانیش، جوانییە و ئەو تاکەڕەهەندەی زمانیش، وەسفە. لەڕاستیدا ساتەوەختی گۆران ساتەوەختێکی باشبوو بۆ ئازادکردنی دونیا و گۆڕینی بۆ جێگای تێڕامانی مەعریفی و بۆ خاکی سەرهەڵدانی پرسیارە فەلسەفییە گەورەکان، بەڵام لەبری ئەمە گۆران جوانی جیهان تێکەڵ بە جوانی زمان دەکات. ئەو ڕەوانبێژییەی کە لای کلاسیکییەکان ستراتیژی زمانە، گۆران لە سروشتدا دەیدۆزێتەوە، بەڵام هێشتا وشە وەسفییەکانی گۆران دوورن لە جەوهەری جیهان، هێشتا نەبوونەتە کەرەستەی لێوردبوونەوە لە جیهان و لێوردبوونەوە لە ناکۆکییەکان و دژایەتییەکان. نادیاری شیعری گۆران جیهان نییە، لەمەشدا تەبایە لەگەڵ کلاسیکییەکاندا، بەڵکو دیاری شیعری گۆران جیهانێکە کە تەنیا ڕەهەندی جوانی پێسپێردراوە. شیعری گۆران لەدوای کۆڵین و دۆزینەوە ناگەڕێت، بەڵکو لەدوای چێژ و لەززەت عەودالە... لەوبەری گومانەوە لە دایکدەبێت. لای گۆران بەئاشکرا زمان وەسفی سروشت دەکات، بەڵام نایشکێنێت، سروشت هێلکەیەکی سپییە، زمانیش وەسفی ئەو هێلکەیە دەکات، بەڵام تەنیا بەشی دەرەوە و دیوی یەکەمی وەسف دەیگرێتەوە، ئیدی ناوەوە و پێکهاتەی قووڵی فەرامۆشدەکرێت - لەڕاستیدا ئەو

شوێنەی کە گۆران تیا وەستاوە، جێگایەکە لەگەڵ هیچ پێناسەیەکی ڕادیکاڵانەی تازەگەرییدا نایەتەوە، تازەگەریی کۆتاییهێنانە بەوەسفی جیهان و دەستکردنە بەگەڕان لەناو ئەو نادیارەدا کە وەسفناکرێت، تازەگەریی ئیشکردنە لەو شوێنانەدا کە وەسف ئاشکرایان ناکات، کە وەسف نایاندۆزێتەوە. نادیار ئەو جێگایەیە کە وەسف تیایدا ئیفلیجە و وەسفناکرێت. لای گۆران مەسەلەی سەرەکی وەسفکردنی جیهانە، نەوەکو گەڕان بێت لەدوای «چییەتی - ماهیەتی» جیهان، گەڕان لەدوای چییەتیش بە تێبینی ناکرێت بە «ڕامان - تامل» دەکرێت، بە «هەستەوەرەکان» ناکرێت بە «عەقڵ» ئەنجامدەدرێت. گۆران عەودالی ئەوەیە ئەو خەیاڵەی کە پێی مەستە بیخاتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستەوە .. گۆران دەیەوێت بیسەلمێنێ کە زمان دەتوانێت ئاوێنەی جیهان بێت، بەڵام جیهانێکی نادیار نا، بەڵکو جیهانێک کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەستەکاندا قسەدەکات. گۆران لەناو نادیاردا ناگەڕێت، بەڵکو لەناو دیاردا جارێکی تر توانای زمان تاقیدەکاتەوە، واتە لە دواجاردا شیعری گۆران هەر بەوێنەی شیعری کلاسیکی پەردە لەڕووی ئیرادەی زماندا هەڵدەداتەوە، نەوەکو پەردە لەسەر نهێنی جیهان لابەرێت. جیهان جارێکی تر چەقی ئەزمونی مەعریفی و شیعر نییە.

بەڵام بۆ؟ بۆ دنیا لای کلاسیکیەکان و لای گۆرانیش لەو ئاستەدا دەوەستێت، کە ئاستی پێدراوێکە بە هەست «حس» نەوەک بە عەقڵ. بۆ هەرگیز بوونی ڕاستەقینەی خۆی، قەوارەی ئاڵۆز و پڕنهێنی خۆی ئاشکراناکات، بۆ هەمیشە جیهانێکی ڕەدونراو یاخود جیهانێکی دەستبەسەرە؟

لێرەدا سێ هۆی سەرەکی دەستنیشاندەکەین، بەهیوای ئەوەی کە لە داهاتوودا ببێتە هەوێنی باسێکی درێژ و سەربەخۆ بۆ خۆی:

1- ئەو خەسڵەتە گشتییەی کە تێڕوانینی دینی سەپاندوێتی بەسەر جیهاندا، بەجۆرێک لەپشت سیفەتی مادییانەی دونیاوە کۆی ئاستە جیاواز

جیاوازەکانی دونیا لەناو یەکدا ونەبن... لێرەوە جیهان جیهانێکی یەکگرتووی مادییە، بەمجۆرە بەئاسانی چەمکە ئۆرگانییەکانی وەکو سروشت، مێژوو، سروشتی مرۆڤ.. هتد وەکو چەند چەمکێکی مادی بە ئاسانی وەدەرنراوە و لەناو یەک یەکەی گشتی و هیولایی و ناتایبەتمەندا تواوەتەوە.

2 - بێبایەخی دونیای واقعی لە چەمکی دینیدا، لەڕوانینی دینیدا جیهانی واقع لەبەرامبەر جیهانی ڕەهادا وەستاوەتەوە، دونیای واقیع بەرامبەر دونیای موتڵەق هیچ و کەم بایەخە... زەمین لەبەرامبەر ئاسماندا وەستاوەتەوە، ئەمەش کارێکیکردوە ئەزمونی دینی خۆی لەخۆیدا لە ئاستێکدا بەلاوەنانی جیهان بێت.

3 - یاساکانی شیعری کلاسیکی، ئامادەگی و جەبرێکی بەردەوامیان هەیە لەسەر شاعیر، بەجۆرێک قاڵبە شیعرییەکان پتر لە خزمەتی خەیاڵدا کاردەکەن. یاساکانی شوبهاندن، جیناس، تباق، ناتوانن بونیادنەری زمانێک بن کە بەشێوازێکی بابەتیانە لەدونیا بدوێت، ئەوەش خۆی یاریدەدەری وەدەرنانی جیهان و خوڵقاندنی گووتارێکە دوور لە دونیا و لە مێژوو و لە واقیع. شیعری کلاسیکی زیاتر شاعیر بە هونەری شیعرەوە سەرقاڵ دەکات، وەک بە پەروەردەکردن و تیژکردنەوەی توانای بینینی دونیاوە.

4 - شوێنی پەراوێزی کورد لە هەموو دابەشبوونە سیاسییەکانی مێژووی کۆن و نوێدا، کردوێتی بە هێزێکی ناچالاک و کۆمەڵگایەکی داخراو کە دەستگای ئیداری و سیاسی بزوێنی نەبێت بۆ پرۆسەی بەرهەمهێنانی گووتاری مەعریفی.

هەڵبەت هەریەک لەو چوار خاڵەی سەرەوە پێویستییان بەڕوونکردنەوەی زیاتر هەیە، کە ئەفسوس دەبێتە دەرچوون لە سنووری باسەکەمان.

## شێوەی دەرکەوتنی گووتارەکان «یەکەیەکەبوونی گووتار»

دەتوانم بڵێم، ئەم ئاستەی باسەکەم قورسترین ئاستی لێکۆڵینەوەکەیە دەربارەی بونیادی «دیار» یان ئەگەر ڕاستتر قسەبکەین، قورسترین هەنگاوی دیتنی «دیاری ڕۆشنبیریی ئێمەیە وەکو کۆ». لێرەدا قسەمان دەربارەی چۆنێتی دابەشبوونی گووتارەکانە، لەتەک دیاریکردنی هۆکانی ئەو دابەشبوونەدا، لەسەر هەردوو تەوەرەی «دایکرۆنیکی» کە تیایدا زەمەن گۆڕدراوە، وە تەوەرەی «سایکرۆنیکی» کە زەمەن تیایدا جێگیرە ... بەر لەئێستا باسمان لە جۆرێکی تایبەتی گووتار کرد، کە گووتاری تاک ڕەهەند بوو، ووتمان: خەسڵەتی سەرەکی ئەم گووتارە ئەوەیە کە درێژکراوەی نییە، واتە ئاستە زەمەنییە جیاجیاکان، ئاست و مەدلولی جیاجیا نابەخشن بەو گووتارە، واتە لە شوێنێکدا لەدایک دەبێت و لەویادا دەوەستێت و ناتوانێت فرەدیو و فرە دەلالەت بێت. لەڕاستیدا گەڕان بە دوای مانای گووتاردا لەسەر ئاستی دایکرۆنیکی سوودێکی ئەوتۆی نییە بۆ گووتاری کوردی، لەبەرئەوەی تەمەنی ئەم گووتارە بواری ئەوەی پێ نادات کە لابەلابوونەوەی گەورە گەورە لە مێژووی ئەم گووتارەدا جیابکەینەوە و قۆناغ قۆناغ دابەشیبکەین... تەوەرەی دایکرۆنیکی تەوەرە یەکی ستراتیژییە بۆ خوێندنەوەی مێژووی گووتاری خۆرئاوایی، بەڵام بۆ ئێمە بایەخێکی بچووک و ناچیزی هەیە.. لێرەوە قسەکردن لەسەر شێوەی دەرکەوتنی گووتار، لەسەر تەوەرەی دایکرۆنیکی دەخەینە ئەولاوە، چونکە بایەخێکی تەکتیکی بچووکی هەیە و لەڕاستیدا تەنیا جووڵە لەسەر ئەم تەوەرەیە، واتە دووبارەبوونەوەی گووتاری تاک ڕەهەندە لەساتی جیاواز جیاوازدا. قسەی ئێمە پتر لەسەر ئەو نەخشەیەی گووتارە، وە لەسەر ئەو جەوهەرەی گووتارە کە ئێستا لەبەردەمماندایە و دەیبینین... تەنیا لە ڕێگای ئێستاوە، لەڕێگای قووڵبوونەوە بەناو بونیادی دیاردا، دەتوانین

مانایەک بدەین بەو زەمەنە پێشینانەش کە گووتاری تاک ڕەهەندیان بەرهەمهێناوە، یاخود لەناو سنووری گووتاری شیعر نەپەڕیوینەتەوە بۆ ناو ئاستەکانی تری گووتار... زەمەنێک هیچ تازەگەرییەکی بەرهەمنەهێناوە، هیچ لابەلابوونەوەیەکی تۆمارنەکردووە، وە هەرگیز سیمای خۆشی لە مەعمای پرسیارەکاندا جیانەکردۆتەوە.

دەپرسین: ئاخۆ ئەو سیستمی گووتارەی لەبەردەممانداپە، چ یەکەیەکی گشتی خوڵقاندووە؟... چەند «ناوکۆی - سیاق»ـی جیاجیای دروستکردووە؟ چەند بونیادی دروست و پێشکەشکردووە؟

وەک دەبینین، پرسیارەکان ئاسان نین، لەڕاستیدا پرسیار دەربارەی شێوەی دەرکەوتنی گووتار دەبێتە پرسیار دەربارەی سروشتی بونیادی ڕۆشنبیریی کوردی، بەڵام ئاخۆ ڕیزبوون و دەرکەوتنی گووتارەکان لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا بواری ئەوەمان پێدەدات وشەی بونیاد بەکاربهێنین؟

بونیاد: «کۆی ئەو پەیوەندییە ناوەکییە نەگۆڕاوانەیە کە کۆمەڵەیەک لەوانی دی جیادەکاتەوە کە تیایدا «کۆ» پێشینەیەکی لۆژیکی بەسەر بەشەکاندا هەیە، واتە هیچ ڕەگەزێک لەو بونیادەدا مانای خۆی وەرناگرێت بەپێی ئەو دۆخە نەبێت کە لەناو کۆمەڵەکەدا هەیەتی، وە «کۆ» بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە، هەرچەندە ڕەگەزەکانی ناوی گۆڕانیان بەسەردا بێت». «بڕوانە: المیتافیزیقا، العلم و الایدیولوجیا، عبدالسلام بنعبدالعالی، دار الطلیعة - بیروت، ط ١/1981 ص٧».

ئەگەر ئەمە پێناسەی «بونیاد» بێت، یاخود یەکێک لە پێناسە زۆر گشتییەکانی «بونیاد» بێت... بەئاشکرا دەتوانین باس لە ئامادەگی «بونیاد»ێک بکەین کە سەرجەمی گووتارەکانی ئێمەی گرتۆتە ئامێز، لە بەرئەوەی لەپشت کۆی پرۆسەی بەرهەمهێنانی گووتارەوە، لۆژیکێکی گشتی هەیە کە سەرجەم ڕەگەزە بچووکەکانی لەیەک سیستم و لەیەک ئاراستەی کارکردندا کۆدەکاتەوە، کە لۆژیکێکی غەیبانی دژەمەعریفییە، واتە مانایەکی گشتی یان ئامانجێکی گشتی هەیە کە پارچەکان

کۆدەکاتەوە، ئەو مانا گشتییەش لەئاستی ڕووکەشدا نابینرێت، بەڵکو هێزێکی شاردراوەیە لەئاستی پەیوەندییە ناوەکی و ئاڵۆزەکاندا شاردراوەتەوە... «لە وتاری «ڕۆشنبیری تاک ڕەهەند» دا هەوڵمداوە کەمێک لە خەسڵەتەکانی ئەو بونیادە گشتییە ئاشکرابکەم، خوێنەر ئەگەر بگەڕێتەوە سەر ئەو وتارە، دەتوانێت پتر لە بۆچوونەکانم تێبگات». بەڵام ئاشکرایە کە پەیوەندییەکی ئۆرگانی و مانایەکی گشتی و نیازێکی دیاریکراو لەپشت کۆی پرۆسەی گووتارە جیاجیاکانی ئێمەوە وەستاوە... ئەو پەیوەندییە گشتییەش، ئەو هێڵە عەقڵییە هاوبەشەش پێکهێنی سنوورەکانی ئەو بونیادەن کە گووتارە جیاجیاکان و ڕەگەزە جیاجیاکانیان خولقاندووە. ئەوانە بەکۆ بونیادێک دروستدەکەن، لەبەر ئەوەی بە کۆ سیستمێکی تایبەتی گووتار دروستدەکەن بە جەوهەرێکی غەیبانییەوە، بەکۆش ڕەنگدانەوەی قەیرانی عەقڵییەتێکن لەساتێکی دیاریکراودا. ئەمانە بە بونیاد حساب ناکرێن لەبەرئەوەی گوایە پەیوەندییەکی مەحکەمی ناوەکی لەنێوانیاندایە، بەڵکو لەبەرئەوەی بەرجەستەبوونی ئەو سنوورە تەسکانەن کە عەقڵییەتی ئێمە تیایدا وەستاوە و بەگیرهاتووە... بونیادن چونکە کۆی گووتارەکان ئەو خەسڵەتی وەستان و ئیفلیجییەیان هەڵگرتووە، لەبەر ئەوەی مۆرکی نازانستی و سەرەتایی و ناکامڵی لە هەموو بەشەکانیدا دەبینرێت، بەشەکانیشی چەندە گەمەبکەن، چەندە بێن و بچن تائێستا نە لە کاریگەرییەکانی لۆژیکی گشتیی بونیادەکە ئاگادارن، نەدەتوانن دەربازیان بێت لێی. ڕۆشنبیرەکانی ئێمەش لە حاڵەتی بێهۆشی و بێئاگایی تەواوەتیدا دەژین، دەرهەق بەکۆی ئەو بونیادەی تیایدا دەسوڕێنەوە. تازەگەرییش جۆرێکە لە وریایی و ئاگاداری بەرامبەر بەکۆی ئەو بونیادە.

واتە گووتارەکان خۆیان لەئاستی پەیوەندیی ئۆرگانیدا نین وە مەرج نییە لەو ئاستەدابن بۆ خولقاندنی بونیاد، بەڵکو بەپێچەوانەوە لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا لەیەکپچڕانی گووتارەکان ماهییەتی ئەو بونیادە پێکدەهێنێ کە گووتارەکان کۆدەکاتەوە. واتە بونیاد کۆی ئەو پەیوەندییانەیە کە کۆی

گووتارەکانی لەیەکتر جیاکردۆتەوە، بونیادی ڕۆشنبیریی ئێمە بەم مانایە، بونیادی لێکترازاندنی گووتارەکانێتی... ئەمەش پێچەوانەی مانا گشتییەکانی چەمکی بونیاد نییە، چونکە چەمکی بونیاد هەر لەسەرەتاوە، لە بنەچە تیورییەکانەوە هەڵگری چەمکی داپچڕان و جیاوازییە. بنعبدالعالی دەڵێت: «بونیادگەریی کاتێک دەسپێدەکات کە کۆمەڵەی جیاواز جیاواز دەتوانن، نەک ئەگەرچی لەیەکدی جیان، بەڵکو بەهۆی لەیەکجوداییانەوە لەیەکتر نزیکببنەوە»«هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٩».

ڕۆشنبیریی ئێمەش، بەهۆی لەیەکدی ترازانی گووتارەکان، دەشێت وشەی بونیادی بەسەردا ببڕین. بەڵام جیاجیایی گووتارەکان لەڕۆشنبیریی ئێمەدا جیاوازییەکی بونیادی قووڵی هەیە، لەو جیابوونەوانەی کە دەشێت لە ڕۆشنبیرییەکی دیکەی وەکو ڕۆشنبیریی خۆرئاوا یان عەرەبیدا بەرچاوبکەوێت... ئەوەی گووتارەکانی ئێمە لەیەکدی دەترازێنێت و لە یەکیان دووردەخاتەوە، جیاوازیی نێوان دوو ڕیز گووتار نین سەر بە دوو کایەی جیاواز... جیابوونەوەی چەمک و بنەماکانی پشت گووتار نین... جیابوونەوەی سەرچاوە سۆسیۆلۆژییەکان نییە، لەڕاستیدا ڕەگوڕیشەی یەکەیەکەبوونی گووتار، گەلێ زۆرە وە هەر هۆکانی ئەو یەکەیەکە - بوونەشە کە شێوەی لێکترازانەکان بەرجەستەدەکەن، بەڵام خودی ئەو یەکەیەکەبوونە چییە و چۆن تەعبیری لێدەکەین؟.

*یەکەیەکەبوونی گووتار*: مانای نەبوونی هیچ پەیوەندییەکی مەعریفی یەکانگیر لەنێوان گووتارەکاندا بەئەندازەیەک هەر گووتارە و بەجۆرێک لە جۆرەکان ببێتە تەواوکەری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی زانستیانەی ئەویتر، تا بەکۆ نیشانە و خەسڵەتی مەعریفی سەردەمێک دیاریبکەن.

لێرەدا گووتار و بەرهەمهێنانی گووتار، پابەندی هەستان و وروژانی هەندێ مەسەلەی کاتییە، یاخود پابەندی دزەکردنی هەندێ گووتار و چەمکی ئەکادیمییە بۆ ناو گۆڤار و پاشکۆ ڕۆشنبیرییەکان، یان ئەنجامی هەندێک هەواو هەوەسی ڕاگوزەری نوسەرانە، یان پابەندی هەندێ مەسەلەی ڕۆژە،

بێئەوەی ئەم گووتارانە ڕەوتێکی یەکانگیری مەعریفی دروستبکەن، یاخود خاڵێکی هاوبەش کۆیانبکاتەوە، بەڵکو وەکو وتمان خاڵی هاوبەشیان لەیەکدی پچڕانە، نەوەکو لەیەکدی نزیکبوونەوە. تەنیا بۆ نموونە: کتێبەکەی «د. کمال مظهر» دەهێنینەوە یادتان سەبارەت بە «ڕێنسانس». ئەم کتێبە وەکو پرۆژەیەکی مەعریفی بۆ تاوتوێکردنی «ڕێنسانس» نەهاتۆتە گۆڕێ، لەپشتییەوە هەوڵدانێک نییە بۆ پێکوڵکردنێک ڕووەو ڕامان لەڕینسانسێکی کوردی یاخود خۆرهەڵاتی، یاخود بۆ فەلسەفاندنی چەمکی ڕێنسانس، بەجۆرێ لەگەڵ بزواندنی واقیعی مەعریفی یان شارستانی ئێمەدا بگونجێت، بۆیە وەکو کتێبێکی ئەکادیمی دێت و دواتر لەناو سەرجەمی نوسینەکانی تردا وندەبێت. یان باسێکی تایبەت بە «زەخیرەی زمانەوانی لەلای منداڵی کورد» کە دەنوسرێت، دواجار وەکو خیتابێکی جێماو و پەرشوبڵاو دەکەوێتەوە، چونکە نە بەشێکە لە پرۆژەی خوێندنەوەیەکی دەرونی، نە لەناو پرۆژەیەکی خوێندنەوەی زمانەوانیدا بەردەوامی هەیە، نە درێژکراوەی تەوەرەیەکی فیکریی پێشینە، نە سەرچاوەیە بۆ خوێندنەوەی دیکەش، واتە یەکەیەکەبوونی گووتار: مانای دەرکەوتنی گووتارە تاک ڕەهەندەکانە بێ هیچ «سیاق» ێکی مەعریفی یان نیازێکی فیکریی گەورە.

## هۆکانی یەکەیەکەبوونی گووتار

لەڕاستیدا هەمان ئەو بونیادەی کە یەکەیەکەبوونی گووتاری لە ئامێزگرتووە، هەمان بونیاد لەپشت پایەداری و بەردەوامیی حاڵەتی یەکەیەکەبوونەکەشە.

یەکێک لەو هۆکارانەی هۆی یەکەیەکەبوونی گووتارە و لەهەمان کاتیشدا بەرجەستەکەری یەکەیەکەبوونەکەشە، ونبوونی کایە مەعریفییەکانە. لەوەوبەر لە چەند جێگایەکدا ئاماژەمان بۆ ونبوونی کایە مەعریفییەکان کردووە، بەڵام هەرگیز بەشێوەیەکی ورد نەچووینەتە ناو ئەم مەسەلەیەوە،

لەهەندێک کاتدا بەشەرمەوە یان بەترسەوە باسمان لە کایەی ئەدەب یاخود سیاسەت کردووە، بەڵام لەڕاستیدا دەبێت لێرەدا ئەوەش ڕاستبکەینەوە و بڵێین کە «کایە» لەناو ڕۆشنبیریی کوردیدا بوونی نییە، بۆ ئەوەی ئەوەش بکەین ناچارین کۆمەڵێ خەسڵەتی گشتی «کایەی ڕۆشنبیریی» دیاریبکەین... چەمکی کایەی ڕۆشنبیریی - وەکو چەمکێکی تیوری - پابەندی هەندێ خاڵی بنەڕەتییە، کاتێک ئەو خاڵانەش ونبوون، واتە کایەی ڕۆشنبیریی ونە. ئەو خاڵانەش لەم چەند یەکەیەدا کۆدەکەمەوە، واتە بەبێ ئەم خاڵانە ئەستەمە کایەیەک ناوبنێین کایە:

١- ئامادەگی گیانی ئەکادیمی : لەڕاستیدا هیچ کایەیەک، لە هیچ یەکێ لە لقە گشتییەکانی زانستدا، بەبێ ئامادەگی گیانی ئەکادیمی و کاری ئەکادیمی و ژێرخانی ئەکادیمی نایەتەگۆڕێ، بەڵام نابێت ئەوەش لە یادبکەین کە تەنیا بەئامادەبوونی ئەکادیمییەت کایەیەک دروس نابێت.

٢- ئامادەگی زەینی تیوریزەکەر : لەڕاستیدا ڕۆحی تیوری ئەو زاراوە و چەمکانە دەخوڵقێنێ کە «ئەکادیمیستەکان» و لەمپەرەکانی ناو عەقڵی ئەکادیمی ناتوانن بەرهەمیبهێنن. هەر لەڕێگای ئەم ڕۆحییەتەشەوە ئەو زاراوانە دێنە دونیاوە کە لەڕێگایانەوە واقعی فەرهەنگی و سۆسیۆلۆژیی ئێمە دەکرێت بخوێنرێتەوە، هەڵبەت جیاکردنەوەشم بۆ زەینی تیوریزەکەر لەڕۆحی ئەکادیمی بەو مانایە نییە کە ئەکادیمیستەکان ناتوانن تیوریزەبکەن، بەڵکو بەو مانایەیە کە مەرج نییە ڕۆحی ئەکادیمی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیک ببێتە بەرهەمهێنی زەینێکی تیوریزەکەر. لە ڕاستیدا بایەخی گیانی تیوریزەکردن لەوەدایە کە وادەکات کایەیەک لەکایە زانستییەکان کایەیەک بێت بۆ ئێمە و کایەیەک بێت لێرە. چەمکی تیوریانە کایە دەپارێزێت، لەو زانستە ئەکادیمییە ڕووتانەی لە شوێن و زەمانی ترەوە دێن و بایەخیان لە سنووری بەکارهێنانی ئەبستراکتی ناو ئەکادیمیاکان تێناپەڕێت و لەدەرەوەی سنووری خوێندن و تاقیکردنەوەی قوتابیانەوە کەس نایانکاتە چەکێکی ڕاڤەکار و ڕامانکار - تاملی - بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە واقیعی ئێمە. تەنیا زەینی تیوریزەکەریشە کە دەبێتە

یاریدەدەرێکی گرنگ بۆ ئەوەی کایە بکاتە کایەیەکی تایبەت بەکێشە مێژووییەکانی ئێمە.

٣ـ گیانی پراکتیکی و ئەمبریکی: واتە نزیکخستنەوەی چەمکە تیۆرییەکان لە دونیا، بەگەڕخستنی نموونەی ئەوتۆ کە تیایدا واقع و تیورە لە زمانێکی زانستییانە و لۆژیکیدا بەرجەستەببن. پراکتیککردنی چەمکە ئەکادیمی و تیۆرییەکان. خوڵقاندنی نموونەی ئەمبریکی بۆ کارکردنی چەمکە فیکرییەکان، دامەزراندنی سیستمی پێوانە و پۆلێن، واتە دەرگای واقیع بۆ ئەزمونکردن و جەرباندنی چەمکە تیۆرییەکان دەکاتەوە و کەناڵی پەیوەندی لە نێوان جیهان و فیکری ڕامانکاردا فراوانتردەکات.

٤ـ چەمکی ڕۆشنبیریی گشتی: بەئامادەبوونی ئەم چەمکە، هەموو ئەو هەوڵە زانستییانەی لە کایەیەک لە کایەکاندا دەدرێت، دەبێتە وەڵام یان بەشێک لەوەڵام بۆ ئەو پرسیارە گشتییە «یاخود بۆ ئەو کێشە گشتییەی» لە زەمەنێکی دیاریکراودا، ڕۆشنبیرییەک بەرامبەری دەوەستێتەوە. کایەی مەعریفی بەگشتی لە ئاستێکی پەیوەندی باڵادایە لەگەڵ ئەو پرسیارە گشتیانەی قۆناغێکی مەعریفی بەرهەمیاندەهێنێ، هەر کرۆکی ئەو پرسیارانەشە کە تا ئەندازەیەکی باش کاری مەعریفی ناو کایە ئاڕاستەدەکات، چونکە ئەگەر ئەو پرسیارانەش لەناو پرۆسەی کارکردنی زانستیانەدا بەرجەستەنەبێت... خوڵقاندنی کایەیەکی مەعریفی لەگۆڕێ نییە، واتە دەشێت چەمک هەبێت، کارکردنی زانستیانە هەبێت، بەڵام بێئەوەی هیچ یەکێک لەم هەوڵانە پابەندی وەڵامدانەوەی ئەو گرفتە سەرەکیانەبن کە ڕۆشنبیرییەک دووچاریبووە.. لێرەوە هەموو ئەو هەوڵانەی کە قورسایی ئەو ئەرکە مەعریفییەیان لەئەستۆ نەگرتووە، لە شێوەی کایەیەکی مەعریفی تایبەت بە دونیای ئێمەدا دەرناکەون، یاخود کایە دروست ناکەن و لەباشترین حاڵدا زەمینەی پێشینەی کایە دەبن، هەرواش دەمێننەوە تا لە هەڵگرتنی کێشە فەرهەنگییەکانی ئێمە و لەم کاتەدا هاوبەشییەکی ئۆرگانی نیشاندەدەن. واتە کایە تەنها لەو کاتەدا کایەیەکی مەعریفییە بۆ ئێمە کە ئیشکردن بێت لەسەر کێشەکانی ئێمە و

پرسیارەکانی ئێمە، بەم پێودانەش دەشێت چەندین کتێبی وەرگێڕدراومان هەبێت لەسەر سۆسیۆلۆژیا، بەڵام کایەی سۆسیۆلۆژیامان نەبێت، چونکە گرفتەکان نەبوونەتە گرفتی دۆزینەوەی وەڵام بۆ کێشەکانی ئێمە، دەشێت چەندین گووتارمان لەسەر بونیادی مەعریفی هەبێت، بەڵام کایەیەک بۆ لێکوڵینەوەی مەعریفی لەدایکنەبووبێت کە ڕاستەوخۆ وەڵامی کێشەکانی ئێمە بداتەوە. بە ونبوونی ئەم چەمکەش کایە دەگۆڕدرێتە سەر قەوارەیەکی بێکاریگەر.

ئەگەر ئەم پێوانانە بخەینەکار، بەئاسانی هەستدەکەین کە هیچ بوارێکی چالاکیی فیکریی لەلای ئێمە ئەم مەرجانەی بەسەردا ناسەپێت، هەربۆیەش دەتوانین بەئاسانی ئەو ڕاستییە بسەلمێنینەوە کەڕۆشنبیریی ئێمە ڕۆشنبیرییەکە بەبێ کایەی مەعریفی و خاڵی لە کایەی مەعریفی.

لەڕاستیدا نەبوونی کایەی مەعریفی، مانای نەبوونی هیچ فۆڕمێک بۆ کۆکردنەوە و ڕێکخستنی زانیارییەکان، نەبوونی هیچ چێوەیەک کە گووتارەکان تیایدا کۆببنەوە و بە ناڕاستەیەک کاربکەن. ئەوە کایەی مەعریفییە کە بەهای هەر زانیارییەک لەپێشدەم زانست و لەپێشدەم دونیادا دیاریدەکات. ڕیزبەستنی زانیارییەکان لە کایەیەکدا دەیانخاتە ناو ئەزموون و پراکتیکێکی زانستییە... کە کایەش ونبوو، سروشتی سەرەکی دەرکەوتنی گووتار «پارچەپارچەبوون» یاخود «یەکەیەکەبوون» دەبێت، ئەوەش جەوهەری سەرەکی دەرکەوتنی گووتارە لەواقعی ڕۆشنبیریدا. ئەوەی لەواقعی ئێمەدا هەیە «یەکەکانی گووتار»ـە، نەوەکو «کایە مەعریفییەکان».

ئەو یەکانە کۆمەڵێک یەکەی بچوک و گۆشەگیرن کە سنوورەکانیان داخراوە و زۆرجار بێمەبەست دێنە گۆڕێ. گووتاری ئەکادیمی بچوک بچوک، یان گووتاری پێناساندنی هەندێک چەمکن، گووتارێکن کە مانایەک نادۆزنەوە بۆ بوونی خۆیان لەو ناوەندەدا، هاوڕێیان نییە، ناچنە ناو پەیوەندییەکەوە لەگەڵ هیچ زانیارییەکی دیکەدا، نەڕۆحی کێشە

ڕۆشنبیرییەکانی ئێمەی تیادا دەردەکەوێتەوە، نە وەزیفەی ئەکادیمی خۆشیان دەبینن. نەتوانای ئەزمونی تیوریی و نەتوانای ئەزمونی پراکتیکییان نییە. لێرەوە زۆر لەیەکەکانی گووتار لە کۆمەڵێک دوورگەی جیاجیا دەچن، کەزۆربەی کات گووتاری سیاسی یان ئەدەبی زۆر نزمن کە کەسانی دوژمن و حیزبی شەڕکەر و تاقمی ناتەبا لە ئاستێکی بازاڕیدا دەیگۆڕنەوە... ڕەنگە لەسەرەتادا تێزەکانی تازەگەریی خۆشیان هەر لە شێوەی «یەکە ـ گووتار»دا بن، بەڵام گرنگی ئەم یەکە تازانە لەوەدایە کە مەبەستی سەرەکییان گەڕانە بەناو «نادیار»دا و ڕاگەیاندنی وەستان و لە کەڵککەوتنی یەکەکانی ترە، واتە سەرەتا تازەگەریی ناتوانێت سەرتاپای نەخشەی ڕۆشنبیرییەک بگۆڕێت، بەڵکو تازەگەر هەڵوێستێک لەو نەخشەیە وەردەگرێت. تا ئەم هەڵوێستەش قووڵتر و زانستیتر بێت، سیمای تازەگەریی دڕتر و کاریگەرتر و چالاکتردەبێت، بەڵام وەکو لە سەرەتاشەوە دیاریمانکرد... تازەگەریی ئەگەر هەڵوێست نەبێت لەکۆی ئەو نەخشەیە، ئەوا تازەگەریی نییە. تازەگەریی سەرەتا گووتارێکە لەسەر ئەو نەخشەیە، دواتر دەبێت بە تیورەیەک لەسەر ئەو نەخشەیە یان لەسەر نادیاری ئەودیو ئەو نەخشەیە.

بەڵام جگە لە هۆکاری ونبوونی کایەکان هۆی دیکەش هەیە، کە بەهەمان ئەندازەی «بێکایەیی» کاریگەرە و ڕۆڵی ئاشکرای لە «یەکەیەکەبوونی» گووتاردا هەیە، یەکێکی دی لەو هۆیانە «بزربوونی ژێرخانی گووتار»ـە.

## بزربوونی ژێرخانی گووتار

ژێرخانی گووتار کۆی ئەو گووتارانەیە کە پێویستن بۆ دەستکردن بەکاری تیوریزەکردن و کاری ڕێگا خۆشکردن بۆ تیورە. کۆمەڵێ کەرەستەی پێویستە بۆ هەر خوێندنەوەیەکی مەعریفی «بەربڵاو یان تایبەتمەند». زەمینەی دیاریکردنی سنوور و مانای ئەو زاراوانەیە کە پێویستە لە بەرهەمهێنانی گووتاردا لەبەردەستماندا بێت، کۆی ئەو چەمکە فیکری و

فەلسەفیانەیە کە پێش ئێمە بەرهەمهاتوون و ناتوانین لە هیچ مامەڵە و پرۆسەیەکی فیکریدا ڕەچاویان نەکەین... دەروازەکانی کارکردن و هەنگاونانن. بەبێ ژێرخانی گووتار، گووتارەکان پێوانەیەکی بەهاو مانا نابێت شانی بدەنە سەر، پاشخانێکی مێژوویی نابێت پشتی پێببەستن. واتە ژێرخانی گووتار کۆی ئەو زانیاریانەیە کە پێویستە تا لە ڕێگایەوە ڕۆشنبیرییەک هەنگاوبنێت بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارێکی دیاریکراو یان کێشەیەکی دیاریکراو، بریتیشە لەکۆی کاریگەریی فیکری پێش خۆت لە سەر شێوەی کارکردنی پرسیارەکان و سەرهەڵدانیان و ئاراستە وەرگرتنیان... ژێرخان کۆی ئەو زانیاریانەیە کە مرۆڤایەتی پێش ئێمە بەرهەمیهێناوە و ئێستا لەبەردەمماندا ئامادەیە، کۆی ئەو مانا و بەها و پێوانکاریانەشە کە ڕۆشنبیریی کوردی پێش ئێستا بەرهەمیهێناوە.

ژێرخانی گووتار، ئەگەر ئاراستەی ئەو ڕێگایەشمان نیشان نەدادەتەوە کە دەبێت پیایدا بڕۆین، ئاراستەی ئەو ڕێگایەمان نیشاندەدات کە دەبێت پیایدا نەڕۆین، دەوری ئەو پێشینە لۆژیکییە دەبینێت کە بەبێ ئەو ناتوانین بچینە ناو هیچ هاوکێشەیەکی ئاڵۆزترەوە. ئەوە ژێرخانی گووتارە کە ڕێنمایی ڕۆشنبیری کورد دەکات، بتوانێت لە کێشەکانی میتۆلۆژیا و فەلسەفەی یۆنانییەوە دەستپێ نەکاتەوە، ژێرخانی گووتارە سەردەمە فیکریی و ڕۆشنبیرییەکان لەبەردەمماندا چڕدەکاتەوە، شوێنی ڕووبەڕووبوونەوەی ڕۆشنبیرییەکە لەگەڵ ڕۆشنبیرییەکانی تردا. جەستەی کشاوی فەرهەنگەکانی دیکە و زەمەنە ڕۆشنبیرییەکانی ترە بۆ ناو ئەم ساتەوەختەی ئێستا، توانای ئێستاشە لە خوڵقاندنی چەند چەمک و زاراوە و گووتارێکی بنچینەیی کە دەبێتە هۆی خوڵقاندنەوەی پرۆسەیەکی بەرهەمهێنانی گووتار.

لەم ئاستەدا دوو جۆر شێوە «ژێرخانی گووتار» دەبینین:

١ـ ژێرخانی گووتاری گشتی ٢ـ ژێرخانی گووتاری تایبەتی.

# ژێرخانی گووتاری گشتی

کۆی ئەوگووتارانەیە کە لە «ئەویدی ـ الآخر»ـەوە هاتووە، وە زۆربەی زۆری سەرچاوەی ئەو گووتارانە فیکری خۆرئاوایە، بەڵام ئامادەبوونیان لە ژێرخانی گووتاردا مانای ئەوە نییە کە ئیدی بوونەتە بەشێکی ئۆرگانی فیکری ئێمە. ژێرخانی گووتار ئەو ئاستەیە کە زەمینەی گفتوگۆ ئاسان و لە باردەکات، زەمینەی بەراورد فەراهەمدەکات «کە هەندێک ترسنۆکانە و لە دیدێکی سەلەفییانەوە دەیانەوێت خۆیان لەو بەراوردە بدزنەوە». لە هەموو شتێک گرنگتر ئەوەیە تێبگەین کە ژێرخانی گووتار چییەتی «ماهییەتی» گووتارەکان دەستنیشاننا‌کات، بەڵام ڕەگەزێکە هەر گووتارێک بێتە بەرهەم پێویستە لەئاستێکی باڵای دیالۆگدا بێت لەگەڵ ئەودا.

ژێرخانی گشتی ئەو بونیادە دەرەکییەیە کە لێرەدا لەسەر ئاستی نوسراو، یاخود لەسەر ئاستی ئامادەبوونی موجەرەد لە هوشیاریدا «بۆ نمونە کە کتێبێکی عەرەبی لەسەر مارکسیزم دەخوێنینەوە، واتا و ماناکانی گەرچی نابن بە واتا و مانا بۆ ڕۆشنبیریی کوردی، بەڵام بوونێکی موجەرەد و ئامادەگییەکی عەقڵییان لە هوشیاریی نوسەری کورددا دەبێت، بێئەوەی لە ناو خودی ڕۆشنبیریی کوردیدا قورسایی یان بوونیان هەبێت» ، یاخود لەسەر ئاستی گووتاری ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بونیادنراوەتەوە. نەوەکو بۆ ئەوەی ببێت بەبەشێک لەڕۆشنبیریی ئێمە، بەڵکو لەبەرئەوەی بەبێ دایەلۆگ لەگەڵ ئەو ژێرخانەدا پرۆسەی بەرهەمهێنانی گووتار، پرۆسەیەکی شێواوە، چونکە «ئەویدی ـ الآخر» لەڕێگای ژێرخانی گشتییەوە سیمای خۆیمان نیشاندەدات، یان ڕاستتر وایە بڵێین پرۆسەی ئەو سیما نیشاندانە بەجۆرێکی ئەکتیڤ لەسەر ئێمە دەکەوێتەوە و بەرەو سیمای خۆمانمان دەبات. ژێرخانی گشتی، ئەو زەمینەیەیە کەوادەکات فیکری ئەویدی لەناو ئێمەدا بیربکاتەوە، ئێمە لەناو فیکری ئەویدیدا

بیریکەینەوە، سەلماندنی ئەو پرۆسە بریختیەیە کە دەڵێت «من لە ناو زۆر سەری تردا بیردەکەمەوە، زۆر سەری دیش لەمندا بیردەکەنەوە. هەر ئەمەشە بیرکردنەوەی ڕاستەقینە». تا ژێرخانی گووتار گەورەتربێت.. مانای ئەوەی کە گەلێ سەری تر لە ناوماندا بیردەکاتەوە و ئێمە لە ناو گەلێک سەری دیکەدا بیردەکەینەوە، واتە دیالۆگی ئێمە و فیکری مرۆڤایەتی قووڵترە. ژێرخانی گووتار دیاریکەری بابەتی هەڵبژاردن و شێوەی نزیکبوونەوە و ئاڕاستەی دیالۆگەکانی ئێمەیە لەگەڵ فیکری «ئەویدی»دا، نەوەکو سیستمی مەعریفی ئێمە بێت. بەم مانایەش ئێمە هیچمان لەسەر ئەوگووتارانە ئەنجام نەداوە، یاخود ناشێت لە ئاستی گووتاری گشتیدا، سەیری ئەو گووتارانە بەجۆرێک بکەین، لە ماناکانی خۆیان دووریانبخەینەوە. ژێرخانی گشتی چەمک و زاراوەکانی ئەویدییە لە مانا ڕەسەنەکانی خۆیاندا، لەساتی پاکی خۆیاندا، ئەو گووتار و دەقانەن کە ئێمە وەکو بەشێکی گرنگی کولتووری مرۆڤایەتی وەریاندەگرین و وەریاندەگێڕین و لەساتەکانی سەرهەڵدان و وەزیفەی مەعریفییان لە کایەکانی خۆیاندا وردەبینەوە. ژێرخانی گشتی دەنگی ئەویدییە کاتێک بەسەر زەمینی ئێمەدا تێدەپەڕێت... دەنگی ئێمە نییە و نابێت بەدەنگی ئێمە، بەڵام زۆر دووریش نییە لە دەنگمان، چونکە دەنگی ئێمەش لە دیالۆگێکی درێژی نێوان «خۆی» و «خۆی»، «خۆی» و «ژێرخانی گشتیدا» دروستدەبێت. «ئەو» ئێمە نییە، بەڵام ئێمە بەناچار لەبەردەم ئەودا وەستاوین، سیستمێکە دەبێت بە نێویدا تێبپەڕین، تێیبگەین، ئەو کێشانەی کە چارەسەریکردون دووبارەی نەکەینەوە، لە بەراوردێکی کوشندەدا خودی خۆمان بدۆزینەوە، نەوەک لەڕێگای دووبارەکردنەوەی ئەوەوە، چونکە دووبارەکردنەوەی مانای هێشتا ئێمە لە ژێرخانی گووتار دەرنەچووین. ئەو زەمەنی خۆیمان نیشاندەداتەوە، زاراوەکانی خۆیمان بۆ یەکاڵادەکاتەوە، قۆناغەکانی خۆیمان پێشکەشدەکات، نەوەک بۆ ئەوەی دوبارەیبکەینەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی لەپشت ئەوەوە، لەودیوی ئەوەوە دەستپێبکەینەوە. ژێرخانی گشتی گووتار ئەو بەربەستەیە کە فیکری ئێمە لە ناکامڵی و سەرەتایی و خورافەتگەرایی و بێمانایی دەپارێزێت، ئەو

بەربەستەیە کە ناهێڵێت لە کێشەکاندا بگەڕێینەوە بۆ شیکارە دێرینەکان. واتە ڕووبەڕوو لەبەردەم بەرهەمە فیکرییە نوێکانی سەردەمدا داماندەنێت، دەمانخاتە ژینگە و کەش و هەوای ڕۆشنبیریی ئەم ساتەوە نەوەکو لەو پرسیارانەدا دیلمانبکات کە خەڵکانی دی سەردەمانێکە وەڵامیانداوەتەوە، بەرەو دیتنی کێشەکانی ئێستامان دەهێنێ نەوەکو بمانگێڕێتەوە بۆ هەندی کێشەی سەردەمی یۆنان. لە ئەدەب و هونەریشدا لەپێش تازەترین بەرهەم و ڕێبازی سەردەمدا داماندەنێت نەوەک تەنیا لەبەردەم «سێرفانتس» و «مایکڵ ئەنجیلۆ» دا.

ئەگەرچی ئێمە میللەتێکین لەدوادوای شارستانییەتەکاندا، بەڵام ژێرخانێکی گشتیی چالاک کە توانای نزیکبوونەوەیەکی بەردەوامی هەبێت لە دەرەوە و توانای بەگەڕخستنی پرۆسەیەکی بەردەوامی وەرگرتن و وەرگێڕان و هەڵبژاردن و چاوەدێریکردنی هەبێت، ناهێڵێت لە دوادوای ڕۆشنبیرییەکانەوە دەستپێبکەینەوە، بەڵکو زەمینەی ئەوەمان پێدەبەخشێت کە ئەگەر ئێستا و لێرەدا دەستمان پێکرد، ئەو دەستپێکردنە هاوشانی ڕۆشنبیریی مرۆڤایەتی بێت، بەچەمکە فیکری و زاراوە نوێکانی ئەو ڕۆشنبیرییە بێت، نەوەکو لەدوادوای ئەو ڕۆشنبیرییەوە بێت. بزربوونی ژێرخانێکی گشتی بۆ گووتارەکانی ئەویدی و نەخشەکانی وایانکردوە ڕۆشنبیریی ئێمە لەدوای دواوەبێت، تەنیا باری شارستانی بەرپرسیار نییە لەو دواکەوتنە، چونکە بەڕاستی هەندێک باری سیاسی و شارستانییان کردووە بە تەنافێک دەیانەوێت هەموو جلی پیسی خۆیانی پیاهەڵخەن. بێهێزیی ژێرخانی گشتی گووتار، بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ سستی ڕۆشنبیران نەوەکو سستی شارستانییەت، سستی پرۆسەی ناساندنی ئەویدی و دیالۆگ لەگەڵ فیکری ئەویدیدا و شارستانییەت بەجۆرێکی ڕاستەوخۆ لێی بەرپرسیار نییە، بەڵکو ڕۆشنبیران لێی بەرپرسیارن. دەستکردنە پرۆسەی ڕۆشنبیریی جیدیش هاوشان بەفیکری مرۆڤایەتی پابەندی گەورەیی و قووڵی ئەو ژێرخانی گووتارەیە کە لێوەی دەستپێدەکەین، چەندە ژێرخانی گشتی بچوک بێت، هێندە لەدوای

جیهانەوە دەستپێدەکەین، چەندە گەورەش بێت، هێندە نزیک لەسەردەم و هاوشان بەمرۆڤایەتی دەجولێینەوە.

## ژێرخانی گووتاری تایبەتی

ئەگەر ژێرخانی گشتی پانتاییەک بێت نەتوانین لە سنووری ئەو پانتاییەدا دەستکاری مانای گووتارەکان بکەین، هەروەها نەشتوانین کردەی «ژینگاندن»، «ئێستاندن»، «ئێراندن» ئەنجامبدەین، ئەوا لە ژێرخانی تایبەتیدا بەپێچەوانەوە رووبەڕووی کۆمەڵێک گووتار دەبینەوە کە لێرەوە، لە خوێندنەوە و پراکتیککردنی ئێرەوە مانا و چەمکی خۆیان وەرگرتووە. بۆ نموونە، ئەگەر لە ژێرخانی گشتیی گووتاردا باسی «مێژوو»مان کرد... هەر لەڕووی ناچارییەوە باس لە چەمکی «هیگڵی، مارکسی، سپنسەری، فرۆیدی... هتد» بۆ مێژوو دەکەین. مانای وشەی مێژوو لە ژێرخانی گشتیدا ناچارە بۆچوونی ڕێبازێکی فیکری بێت، بەڵام ژێرخانی تایبەتی هەوڵدانە بۆ دروستکردنی بۆچوونێکی ئێرەیی و ژینگەیی و ئێستەیی لە گووتاردا، وە چەسپاندنی کۆمەڵێک «مانا» و «بەها» کە بەبێ ئەوە ناکرێت دەست بە پرۆسەیەکی تیوریزەکردن بکەین. کە ڕێبازێکی ڕۆشنبیری لەواقیعی ئێمەدا دەڵێت «مێژووی ئێمە حەتمییەت بەڕێوەی دەبات» بەمە ژێرخانێکی گووتار بۆ تیوریزەکردنی مێژووی ئێمە دادەنێت. کە یەکێکی دیش دەڵێت «مێژووی ئێمە ئیرادە بەڕێوەی دەبات»، بەمە جۆرە پێشینەیەکی تایبەتی دیکەی گووتار بۆ هەمان چەمک دادەنێت. واتە بەبێ جووڵانەوەیەکی بەردەوام و بەربڵاو لەئاست ژێرخانی تایبەتیدا، ئەستەمە بەرەو کاری تیوریزەکردنی واقع و فەرهەنگی ئێرە بڕۆین، هەر لەم ئاستەشدایە کە ئێمە مانای خۆمان دەبەخشینە زاراوە فیکرییەکانی دەرەوە و وادەکەین مەنهەجێکی زانستی، زاراوەیەکی فیکری، چەمکێکی ڕاڤەکردن جێپەنجەی ئێمەی بەسەرەوەبێت، هەر ئەم ئاستەی ژێرخانیشە وادەکات زاراوەیەک یان چەمکێک بەکەڵکی کارکردن و

ئیشکردن بێت لە دونیای تیورەدا، واتە لەم ئاستەدایە کە وشەکان لە مانای ڕۆژانەی خۆیان دەچنەدەرێ، بەرەو ناو مەداری «وتە فیکرییەکان - المقولات».

هیچ پرۆژەیەک، هیچ تازەگەرییەک، هیچ کایەیەک، هیچ تیورەیەک نابێت بەپرۆسەیەکی ئێرەیی و ئێستەیی ئەگەر ژێرخانێکی گووتاری تایبەتی نەبێت لەڕێگایەوە چەمک و زاراوەکان مانای «ئێرە و ئێستە» وەرگرن. ژێرخانی تایبەت ڕۆڵی بونیادێکی تەفسیریی، مێژوویی دەبینێت کە شێوەی کاری وتەکان و سنووریان و بەکارهێنانیان دیاریدەکات. بەمجۆرە بزربوونی ژێرخانی گووتاری «گشتی و تایبەتی» کارێکدەکات گووتارەکانی ئێمە ڕەگوڕیشەیان نەبێت، پاشخانێکی تیوریان نەبێت «تادواتر تیوریزەکردن بیانخاتە کار »، لە پەیوەندیدا نەبن لەگەڵ «ئێرە و ئێستا»دا. لە دایەلۆگدا نەبن لەگەڵ فیکری دەرەوەی خۆمان و پێش خۆماندا، کە دایەلۆگ چەکێکی گرنگە دەتوانێت یەکەیەکەبوونی گووتار بشکێنێت و یەکەیەکی مانا دروستبکات.

هەموو ئەم هۆیانەش فاکتەری گرنگی پچرپچڕ و لێکترازانی گووتارەکانن، پێکهێنێکی بنەڕەتی بونیادی ڕۆشنبیریی سەلەفیشن. بەڵام جگە لەم هۆیە فاکتەری گرنگی دیکەش ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە پارچەپارچەبوونی گووتارەکان و یەکەیەکەبوونیاندا، ئەویش «بزربوونی دەرهاویشتنی مەنهەجی»یە.

## بزربوونی دەرهاویشتنی مەنهەجی «میتۆدی»

مەنهەج بریتییە لە کۆی ئەو هەنگاوانەی کە بەر لە لەدایکبوونی گووتارێکی مەعریفی دەنرێت. عبدالله العروی دەڵێت «مەنهەج ڕێگایەکە بۆ خستنەڕووی بابەتێک لە بابەتەکان»« بڕوانە: المنهجیە فی الأدب و العلوم الأنسانیە. المنهجیە بین الأبداع و الأتباع. عبدالله العروی. ط1986/1،

دار توبقال للنشر .دار البیضاء - ص9». وە جابری دەڵێت «مەنهەج ئەو چەمکانەیە کە توێژەرەوەیەک دەیخاتە کار لە چارەسەرکردنی بابەتەکەیدا» «الخطاب العربی المعاصر. ص 12»

واتە بەکورتی مەنهەج ڕێگای خستنە ڕووی بابەت و چارەسەرکردنەکەشێتی، بەڵام ئاخۆ دەشێت گووتارێکمان هەبێت بەبێ مەنهەج، دەشێت بابەتێک بخرێتە ڕوو بەبێ مەنهەج، دەشێت کۆمەڵێ گووتاری گرنگ، دەرهاویشتنی هیچ مەنهەجێک نەبن؟ بێگومان دەشێت، بەڵام بەشێوەیەکی تایبەت و لەبەرامبەر کۆمەڵێک زیانی گەورە گەورەدا. لەڕاستیدا کۆی گووتارەکان لەڕۆشنبیریی ئێمەدا بەدوورن لە دەرهاویشتنی مەنهەجی، واتە «مەنهەجێک» کاری نەکردووە تا ئەم گووتارانەی ئەمڕۆ بەرهەمی کاری ئەو مەنهەجەبن، بەم مانایەش گووتارەکان یاخود لە ژینگەیەکی ڕۆشنبیریی و مەنهەجی ترەوە بەشێوەی گووتاری پەرش و بڵاو هاتوون، وەکو لە حاڵەتی مارکسیزمدا بە زەقی دەیبینین، یاخود وەکو وتمان ملکەچی مەسەلە کاتی و ڕاگوزەرەکانن، یان ملکەچی کێشە ڕۆژانەکانن، یاخود دووبارەبوونەوەی ئاشکرا و وتراوەکانن، یان لەباشترین حاڵەتدا پەرچەکردارێکی سایکۆلۆژی یان سۆسیۆلۆژیی قەیرانێکی مێژوویین، جا قەیرانی سەرجەمی کۆمەڵ بێت یاخود قەیرانی تاکەکەس. گووتارەکان بەبێ مەنهەج ملکەچی جۆرە شێوەیەکی دی بەرهەمهێنان دەبن، کە ئەویش یاساکانی پەرچەکردار و دووبارەکردنەوەیە، ئەو گووتارانە بەرهەمی وەڵامدانەوەی کێشەکان و مەترسییە ڕاستەوخۆکانن، بەرهەمی بیرکردەوە و حوکمدانی خێران، وەڵامدانەوەیەکی سەرەتایین کە هێندەی دەبنە ڕستە گووتارێکی سەتحی لە پەراوێزی ڕوداوەکاندا نابنە گووتار لە دیدێکی زانستییەوە. گووتاری بونیاد و دەزگا کۆمەڵایەتییەکانە کاتێک خۆیان بۆ دنیا نمایشدەکەن، گووتاری ئاشکرابوونی قەیرانە مێژووییەکانە لەسادەترین شێوەیاندا؛ نەوەکو گووتاری تێڕامان بێت لە میکانیزمەکانی مێژوو، کۆمەڵ، سروشت و عەقڵ... لەڕاستیدا پۆلێنکردنی گووتارەکان «واتە پۆلینی ئەو گووتارانەی دەرهاویشتی مەنهەج نین»

بەپێی سەرچاوەی دەرهاویشتنیان کارێکی ئاسان نییە. بەڵام دەبێت لە ئێستاوە ڕەچاوی ئەوە بکەین کە هیچ یەک لە سەرچاوەکانی دەرهاویشتن حاڵەتی پچڕپچڕبوون و یەکەیەکەبوونی گووتارەکان ناشکێنێت، بەڵکو لە ڕاستیدا دەیچەسپێنێ.

ئاشکرایە کە مەنهەج گووتارەکان دەگێڕێتەوە بۆ ناو ڕیزبەندێکی زانستیانە، واتە دەیانکات بە بەشێک لە زنجیرەیەک گووتار، بەڵام ئەو گووتارانەی کە لە دەرەوەی کاری مەنهەج لەدایکدەبن، خستنەڕووی قووڵی هیچ بابەتێکیان مەبەست نییە کە خستنەڕووش لەگۆڕێ نەبوو، واتە ئیرادەیەکی مەعریفی لەگۆڕێ نییە. لەواقعێکی وەکو واقعی ئێمەدا ئەگەر مەعریفە هێزێکی هەبێت ئەوا لە دارشتنی مەنهەجدا دەیخاتەکار.

مەنهەج گومانێکە دەکەوێتە پێش ڕاستییەوە، یاخود ڕاستتر وایە بڵێین مەنهەج خواستی خەیاڵێکە کە دەیەوێت بەڕاستی بگات. نەبوونی مەنهەج مانای نەبوونی ئیرادەی گەیشتن بەڕاستی، مانای گووتارەکان دوور لە خواستی وردیی و دوور لە نیازی گەیشتن بە ڕاستی لەدایکدەبن. نەبوونی مەنهەج مانای نەبوونی غەمێکی مەعریفی کە بە غەمی ڕاستی ناویدەنێین. کە مەنهەج نەبوو، واتە گووتارەکان بەرهەمی خواستی مروڤ نین بۆ کرانەوە بەسەر شتەکاندا، واتە نەبوونی ئیرادەی شکاندنی نادیار. نەبوونی مەنهەج کوشتنی ئەگەرەکانی بینین و وتنە، کۆتاییهێنانە بە بینین و درکاندن، کاتێک مەنهەج نەبوو جیهان ئاشکرانابێت، کە جیهانیش ئاشکرانەبوو، وێنەکانی ناو یادەوەری شوێنی وێنە ڕاستەقینەکان دەگرنەوە ـ یادەوەری و وێناکردن ـ دەچنە شوێنی هەوڵی تێگەیشتن لە جیهان.

نەبوونی مەنهەج مانای ئەوەی دونیا لە گووتار وەدەرنراوە و ڕێگایەکی نییە پیایدا بگەڕێتەوە. مەنهەج ئیرادەی فەرهەنگێکە بۆ کرانەوە لەبەردەم ڕاستی جیهاندا، ئاشکرابوونی ئەو ساتەیە کە عەقڵ وەکو هێزێکی زانستی دێتە مەیدان، بەڵگەیەکە کە عەقڵ دەسەڵاتی هەیە بچێتە ناو

سەرکێشییەکی مەعریفییەوە.

لێرەدا بەدڵنیاییەوە تووشی پرسیارێکی تازە دەبین، ئەویش ئەوەیە: لە هەناوی پرۆسەی تازەگەرییدا «مەنهەج» و «تیۆرە» جیاوازییەکانیان چییە؟ وە پەیوەندییەکانیان چییە؟

تیورە ئەو ساتەیە کە عەقڵ چەمکێکی جیهانی گرتووە و پرۆسەی «زانیاراندن»ـی بەسەردا سەپاندووە، واتە گۆرپوێتی بۆ بابەتی تەفسیر و تێگەیشتنی زانستی و جێگای دەرهێنانی مەعریفە و دیتنی شتگەلێکی زیاتر لەوەی بە ڕوکەش دەریدەخات. بەڵام مەنهەج نیشاندانی ئیرادەی ئەو عەقڵەیە بۆ چوونە ناو ئەو پرۆسە گەورەیەوە. لەڕێگای تیورەوە دەمانەوێت شتێک لەسروشت یان مرۆڤ یان مێژوو بخوێنینەوە، بەڵام لە ڕێگای مەنهەجەوە توانای عەقڵ تاقیدەکەینەوە. مەنهەج گووتار دەکات بە یەکەیەکی عەقڵانی و نزیکتریدەکاتەوە لەڕاستی. بەر لە مەنهەج گووتار لە گێژاوی «ناعەقڵانییەت» دایە، لێرەیە کە دەڵێم: هەموو ئایدۆلۆژیایەک بێ مەنهەج، هەموو سیاسەتێک بێ مەنهەج، هەموو تازەگەرییەک بێ مەنهەج بەشێک دەبێت لە پێکهات و بونیادی ناعەقڵانییەتی کوردی. لە ناعەقڵانییەتدا ناسینی جیهان بە ڕێگای زانیاریی و بە شێوەی مەنهەجی لەگۆڕێ نییە، بەڵکو تەنیا پەرچەکرداری خێرا و حوکمی خێرا و وێناکردنی پەلە لە مەیداندایە. مەنهەج تاقیکردنەوەی عەقڵە بۆ خۆی. ئەگەر لە گووتاری شیعری کلاسیکیدا زمان ئیرادەی خۆی تاقیکردبێتەوە، لە گووتاری مەنهەجدا عەقڵ تواناکانی خۆی تاقیدەکاتەوە.

لێرەدا جیاکارییەکی نوێ پیادەدەکەین لەنێوان «مەنهەج» و «مەنهەجییەت»دا ـ «میتۆد» و «میتۆدگەرایی». مەنهەجییەت بەمانا گشتییەکەی ئەو زانستەیە کە تاووتوێی «ئەو ڕێگایانە دەکات کە لە لێکۆڵینەوەی ئەدەب و مێژوو و ئابووری و دەروناسیدا... هتد دەگیرێتە بەر» «بڕوانە «المنهجية فى الادب و العلوم الانسانية. ص9» ». بنەماکانی ئەو ڕێگایانە لێکدەداتەوە و نرخ و کاریگەرییان دیاریدەکات، بەڵام من

لێرەدا مانایەکی تەواو جیاواز دەبەخشم بە مەنهەجییەت، مەنهەجییەت لەو مانایەی ئێمەدا ئەو حاڵەتەیە کە تیایدا یەک مەنهەج دەخەینەگەڕ بۆ کردنەوە و شیکردنەوەی زیاد لە مەبەستێک. واتە یەک ڕێگای کارکردن، یەک ڕێگای نیشاندانی کێشەکان، یەک ڕێگای وەڕووخستنی دیاردەکان لە هەموو بوارەکاندا دەخەینەکار، لێرەدا بەیەک شێوە هەموو مەسەلەکان ئەزموون دەکرێن، بەمجۆرەش کێشەکان ملکەچی یەک شێوازی زانیاراندن دەبن. «مەنهەجییەت ـ میتۆدگەرایی» لە زۆربەی ئاستەکاندا بەئایدۆلۆژیا دوابیدێت، مارکسیزمیش لەمڕووەوە باشترین نمونەیە.

ڕێگای دووەمیش، ڕێگای مەنهەج خۆیەتی بەمانا گشتییەکەی، کە تیایدا بە کۆمەڵێ کەرەستەی جیاجیاوە، یەک کێشە چارەدەکەین، واتە وزە و توانای زیاد لە مەنهەجێک بەکاردەهێنین بۆ ئاشکراکردن و چارەسەرکردنی یەک گرفت.

لێرەدا دەپرسین، کامە لەم دوو ڕێگایە بۆ خوێندنەوەی بونیادی ڕۆشنبیریی ئێمە کاریگەرترە؟ کامەیان چاکتر و پڕ ئەنجامترە؟ فرە مەنهەجی یاخود تاک مەنهەجی «مەنهەجییەت»؟

بەوەدا کە ڕۆشنبیریی ئێمە کایەیەکی تایبەتی نییە، بەڵکو بوارێکە لە ئەگەری چەندەها کایە دروستبووە. واتە نادیاری ئێمە زیاد لە دەرگایەک و زیاد لە کلیلێک و زیاد لە قفڵشکێنێکی دەوێت بۆ کردنەوەی، چونکە زیاد لە بوارێکی لەناو هەناوی خۆیدا بە پاسیڤی و خەوتوویی هەڵگرتووە. نادیاری ئێمە بونیادێکی مەعریفی «بەدینەهاتووە» کە ئاشکراکردن و بەدیهێنانی بەتەنیا مەنهەجێک ناکرێت. نادیاری ئێمە سندقێکی تاریکە کە لە چەندەها شوێنەوە داخراوە، هەزارپێچێکە تاریک، دەهلیزێکی پێچاوپێچە کە کردنەوە و بڕینی لەتوانای تەنیا کەرەستەیەکدا نییە، لێرەوە تازەگەریی ئێمە بەوەدا کە هەڵوێستێکە لەکۆی ئەو ڕۆشنبیرییەی کە ئێستا هەیە و کارکردنیشە لەناو سەرجەمی ئەو پانتاییە نادیارەی کە هەیە، بەناچاری تازەگەریی دەبێت پێچەوانەی «مەنهەجییەت ـ

میتۆدگەرایی» بێت، چونکە لەبەرامبەر ئەو ڕووبەرە گەورەیەدا و لە بەرامبەر ئەو ئەرکە ئاڵۆز و قورسانەدا، بونیادی ڕۆشنبیریی ئێمە بەیەک مەنهەج ناخوێنرێتەوە و لەیەک کاتدا پێویستیمان بەچەندەها کەرەستەی مەنهەجی هەیە، وە زیاد لە کەرەستەیەکمان دەوێت کە دەبێت لەزیاد لە بوارێک و شوێنێکەوە بیهێنین. سندوقێک کە بەچەندەها قفڵ داخراوە، بە چەندەها کلیلی جۆراوجۆر نەبێت ناکرێتەوە.

لێرەدا لێکچوونێک لە «کلود - لیڤی شتراوس» وەردەگرین، شتراوس بەراوردێک دەکات لەنێوان کەسێکی «ئەندازیار» و کەسێکی «هەمەکار»دا. ئەندازیار کەسێکی تایبەتمەندە و کەرەستەی گونجاوی هەیە بۆ تایبەتمەندێتییەکەی خۆی، بەڵام هەمەکار تایبەتمەند نییە، لەبەرئەوە کەرەستەی گونجاوی نییە بۆ «هەمەکاری»، لێرەوە کەرەستەکانی لە بوارە جیاجیاکانەوە قەرزدەکات، بواری دوور لە کارەکەی خۆی، کەرەستە قەرزکراوەکانیش دەخاتە خزمەتی ئیشەکەی خۆیەوە، وەکو ئەوەی دەتەوێت ڕادیۆیەک چاکبکەیتەوە، بەڵام دەرنەفیز نییە، دەچیت چەقۆیەک دەهێنیت و برغوەکانی پێ دەکەیتەوە. لەڕاستیدا چەقۆ بۆ ئەو کارە نەکراوە، بەڵام تۆ لەئیشەکەی خۆیەوە دەیگوازیتەوە و ئیشێکی تری پێ ئەنجامدەدەیت.«بڕوانە: المنهجیة فی الادب و العلوم الانسانیة. ص83».

لەڕاستیدا وەرگرتنی کەرەستەی مەنهەجە جیاجیاکان و بەگەڕخستنیان بۆ کاری زانستی شتێکی دێرینەیە و ڕێبازێکی دروستیشە. چونکە یەکەم/ لە یەک مەنهەجی دەمانپارێزێت کە لەتەک خۆیدا دەردی تاک مەرجەعیش دەهێنێت. دووەم/ بواری ئەوەمان پێدەدات کەلەیەک کاتدا زیاد لە ئەگەرێکی نادیار ببینین. سێیەم/ بواری ئەوەمان پێدەدات کە لە زیاد لە گۆشەیەکەوە بڕوانینە یەک دیاردە. ئەمە جگە لەوەی مەنهەج وەکو جۆرێک لە تاقیکردنەوەی ئیرادەی مەعریفی بۆ خۆی پتر دەتوانێت خۆی بسەلمێنێت، پتر دەتوانێت توانای خۆی لەگەڵ کەرەستە مەنهەجییە جیاجیاکاندا تاقیبکاتەوە. لەکاتێکدا مەنهەجییەت دیلکردنی عەقڵە لەیەک

شێوە کار و یەک شێوە بەرهەمهێنان و یەک شێوە ڕوانیندا.

یەکێ لە سیفەتەکانی «دیار» لەڕۆشنبیری ئێمەدا ئەوەیە کە دەرهاویشتنی مەنهەجی بەتەواوەتی ونە... هەتا مارکسیزم لێرە مەنهەجی خۆی دووبارەناکاتەوە و وەکو مەنهەج کارناکات، مارکسیزم بەوە لەدین جیادەبێتەوە کە «مەنهەجە» نەوەکو «بڕوا - عەقیدە»، بەڵام کاتێک وەکو مەنهەج لەکارکەوت ئەوکات وەک بڕوایەکی نەگۆڕ دەردەکەوێت، لێرەوەیە کە مارکسیزم لەواقعی کوردستاندا بەردەوام بەلۆژیکی دین کاریکردوە نەوەکو بە لۆژیکی زانست.

ئەگەر کایەی مەعریفی چێوەیەک بێت گووتارەکان کۆبکاتەوە، ئەوا مەنهەج کەناڵی یەکانگیری نێوان گووتارەکان و ڕاستییە. مەنهەج کەناڵی کۆکردنەوە و ئاڕاستەکردنی گووتارەکانە بە ئاڕاستەی ئیشکردن لەسەر دونیا. سەلماندنی کارکردی عەقڵە لە هەڵبژاردنی گووتارەکاندا، کۆکردنەوەیانە لە دەوری پنتی عەقڵانییەت. واتە مەنهەج ناوکۆییەکی عەقڵانی بۆ گووتارە پەرشوبڵاوەکان دروستدەکات، لە چەند پارچە کردارێکەوە دەیانگۆڕێت بۆ کۆمەڵێ گووتار لەناو فەرمانێکی گەورەتردا، کە ئەویش پرۆسەی ناسینی جیهانە، کە پرۆسەیەکە گووتارەکان پێڕستدەکات، پۆلێنیاندەکات و بەسەر کایەکاندا دابەشیاندەکاتەوە، بەڵام نەبوونی ئەمجۆرە دەرهاویشتنە بەئاشکرا لەیەکەیەکەی گووتارەکاندا ڕەنگیداوەتەوە. مەنهەجە کە گووتار دەکات بەخاڵێک لەناو زنجیرەیەک خاڵی دۆزینەوەی یەک لەدوای یەکدا. مەنهەجە وادەکات گووتارێک کاریگەری و ئەکتڤییەتێکی مەنهەجییانەی هەبێت لەسەر گووتارەکانی تر، نزیکیاندەکاتەوە لەیەکتر و لەیەکیان دووردەخاتەوە. مەنهەجە مێژوویەک بۆ گووتار دروستدەکات.

ئەو گووتارەی لە سنووری بەرتەسکی خۆی دەرچێت، لە زەمەنی خۆی تێپەڕێت و کاریگەری لەسەر گووتارەکانی تر هەبێت، مانای مێژوویەکی هەیە، هەر گووتارێکیش مێژووی هەبوو، واتە گووتارێکی تاک ڕەهەند

نییە، بەمانایەکی تر واتە لەگەڵ گووتارەکانی تردا لەناو کۆمەڵێک پەیوەندیی مێژوویی و فیکریدا دەژی ، ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی کە یەکەیەکەبوونی گووتار بەو مانایەی کە ئێمە دیاریمانکردووە لەکاربکەوێت و شێوەیەکی دی پەیوەندی و کارکردن جێگای بگرێتەوە.

## سیستمی ناکۆکی ناو گووتارەکان

## لە «نەرێکردنی چەمک»ەوە بۆ «نەرێکردنی کۆ»

بێگومان دەرخستنی سیستمی ناکۆکی ناو گووتارەکان لەناو هەر رۆشنبیرییەکدا، مانای دۆزینەوەی میکانیزمەکانی ناکۆکی و دیاریکردنی سروشتی دژایەتییەکان و چۆنێتی بەرێوەبردنی ئەو ناکۆکیانە. لەڕاستیدا هیچ سیستمێکی ناکۆکی بەبێ «نەرێکردن - نەفیکردن» نابێتە سیستەمێکی کاریگەر. کە نەرێکردن نەبوو گووتارەکان لەناو سیستمێک ناکۆکی رووکەشدا دەمێننەوە، هەر گووتارە و کۆنترۆڵی یەکەی تایبەتی خۆی دەکات و هیچ گووتارێکی دی ناتوانێت شوێنی پێ لەقبکات، یاخود لەڕووی مەعریفییەوە گومانی بخاتە سەر. کە نەرێکردن نەبوو گووتارەکان لەناو یەکەیەکەبوونی خۆیاندا بەردەوامدەبن و سیستمی ناکۆکی تەنیا دوور و نزیکیان لەیەکتر جیادەکاتەوە. لە سیستمێکی ناکۆکیدا گووتارەکان یەکتری نەرێ ناکەنەوە، بەڵام مەودای جیاواز جیاواز لەیەکتر وەردەگرن، گووتاری ناسیونالیستی لەگەڵ گووتاری مارکسی و گووتاری دینیدا ناکۆکە، بەڵام دووری گووتاری ناسیونالیستی و ئەو مەودایەی کە لە گووتاری دینی وەریدەگرێت بە ئەندازەی دووری نێوان گووتاری دینی و مارکسی نییە لەیەکتر، بەڵام سیستمی نەرێکردن سیستمێکە تیایدا لۆژیکێکی تر ئیشدەکات. ئەگەر ناکۆکی دیاریکردنی ئاستی دوور و نزیکی گووتارەکان بێت لەیەکتری، سیستمێک بێت هەر گووتارە و شوێنی خۆی

و یەکەی خۆی و هێزی خۆی تیادا پاراستبێت، هەر گووتارە و کاراکتەری تاک ڕەهەندی خۆی هەبێت و بەکۆ سیستمێکی مەعریفیان پێکهێنابێت، ئەوا پرۆسەی نەرێکردن ئەو پرۆسەیەیە کە تیایدا ڕۆشنبیرییەک گووتارە بێکەڵکەکان و گووتارە نازانستییەکان دەخاتەلاوە. واتە نەرێکردن بریتییە لە کاریگەریی کۆمەڵێک گووتار بۆ دیاریکردنی ئیفلیجی ڕستێک گووتاری تر.. بریتییە لە دەرکەوتنی کۆمەڵێک گووتار کە شوێنەوارێک بەجێدەهێڵن و کۆمەڵێک پرسیار و کێشەی مەعریفی دەخەنەوە کە لەودیویانەوە هەموو کێشە درۆزن و وەهمییەکان لە شوێنی خۆیان دەوەستن و توانای کارکردن و تازەبوونەوەیان نامێنێت. نەرێکردن بوارنادات گووتارەکان لە ڕووی مەعریفییەوە بەسروشتی پێشوویانەوە دووبارەببنەوە، بۆخۆی پرسیارێکە گووتارێک لە گووتارەکانی دیکەی دەکات و نەدەتوانن وەڵامیبدەنەوە، نەدەشتوانن لەڕووی مەعریفییەوە بازی بەسەردا بدەن. سیستمی ناکۆکی سیستمی پێکەوە ژیانی گووتارەکانە، لەکاتێکدا سیستمی نەرێکردن بریتییە لە نەخشەیەکی هەمیشە گۆڕدراو کە لۆژیکی پرسیارکردن، لە کارکەوتن، دەرکردنی گووتارەکان تیایدا باڵادەستە... لە کاتێکدا سیستمی ناکۆکی سیستمی دیاریکردنی مەودای دوور و نزیکییەکانە لەناو یەک بونیاددا، سیستمی نەرێکردن گۆڕینی مەعریفەی دیارە بۆ مەعریفەیەکی بەسەرچوو، سیستمی پاڵاوتنی ئەو گووتارانەیە کە لەڕووی مەعریفییەوە بەسەرچوون و لە بونیادەکانی دیکەدا جێگەیان نابێتەوە. لە سیستمی ناکۆکیدا هەریەک لە دوو گووتاری ناکۆک لە گۆشەگیری خۆیاندا دەوەستن و دەژین دوور لەیەکتر، هەریەک خۆی بۆ جیهان ئاشکرادەکات، بێ ئەوەی لەگەڵ یەکتردا بچنە ناو هیچ دایەلۆگێکەوە، چونکە لە سیستمی دیاردا دایەلۆگێکی مەعریفی، نەرێکردن و هەڵسەنگاندنی زانستی لە گۆڕێ نییە، گۆشەگیری ئامادەیە، هەر گووتارە و پانتایی خۆی پڕدەکاتەوە، بێدەنگ بەرامبەر ئەوانی تر دەوەستێت، لێرەدا نەرێکردن نەبۆتە پرۆسەیەکی زانستی و سەرتاسەریی.
ڕەنگە لێرەدا یەکێک بپرسێت کە ئایا لەم سیستمەی ئێستادا بە هیچ شێوەیەک نەرێکردن نییە؟ ئایا ئەو هەموو پرۆسەی یەکدی ڕەتکردنەوەیە

چییە؟ ئایا ئەو هەموو جەنگ و دان بەیەکدانەنانە ئەگەر نیشانەی نەرێکردن نەبن چین؟ لەڕاستیدا بۆئەوەی نەرێکردن وەکو هێزێکی داهێنەرانە و خولقێنەرانە لە هەموو شێوەکانی نەرێکردنی سەلبی جیابکەینەوە کە هەڵبەت کۆمەڵێ ڕێگان سیستمی دیار و کولتووری سەلەفی بەرهەمیدەهێنێت تا لەڕێگایانەوە بەردەوامی خۆی زامنبکات، پێویستە سێ ئاستی سەرەکی لە ئاستەکانی نەرێکردن جیابکەینەوە کە بە ١ـ نەرێکردنی بێدەنگ ٢ـ نەرێکردنی چەمک ٣ـ نەرێکردنی کۆ ناویاندەبەم.

شێوەی یەکەم و دووەم دووجۆرن لە پرۆسەی نەرێکردن کە تایبەتن بە بونیادی دیارەوە، واتە تایبەتی ئەو سیستمە مەعریفییەن کە ئەمرۆ تیایدا دەژین و باڵادەستە، نەرێکردنی کۆش، جۆرە پرۆسەیەکە تەنیا لەتوانای تازەگەرییدایە پیادەیبکات. نەرێکردنی بێدەنگ پرۆسەیەکە هەوڵدەدات لە ڕێگای بێدەنگییەوە ئەوی دی بخاتە کەنارەوە. لە سیستمی دیاردا، بێدەنگی گووتار بەرامبەر بە گووتار مانای دانپیانەنان... گووتارەکان لەم ئاستەدا ناتوانن نەرێکردنێکی مەعریفی بن، ناتوانن خوێندنەوەیەکی زانستی بن هەر لەبەرئەوەش کە «چییەتی - ماهیەتی» مەعریفی هیچ یەک لەوانە لەوی دی باڵاتر نییە، هیچیان لە شێوازی دانپیانەنان و پشتگوێ خستنەوە ناتوانن بەرەو نەرێکردنێکی زانستی بچنە پێشێ. نەرێکردنی بێدەنگ ئەوەیە لێگەڕێیت گووتارە دژەکان لە گۆشەگیریی خۆیاندا بمرن، هیچ گووتارێک نەبێت بە مایەی بەرزکردنەوە و دەرخستن و ئاشکراکردنی گووتارەکانی دیکە... لێگەڕێیت بەرامبەرەکەت فەرامۆشی بیکوژێت، فەرامۆشیبکەیت بۆ ئەوەی لەبیربچێتەوە و بیرچوونەوە بیکوژێت. بەڵام تازەگەریی گواستنەوەیە لە سیستمی ناکۆکییەوە بۆ سیستمی نەرێکردنێکی فیکری دەوڵەمەند بە وتە و لۆژیکی مەعریفی، نەرێکردنی ڕاستەقینەش فەرامۆشکردن نییە بەڵکو دواندن و پرسیار لێکردن و ئاشکراکردنە. تازەگەریی گووتارێک نییە لە گۆشەگیریدا دایمەزرێنین و دوور لە گووتارەکانی تر دانیشین سەیریبکەین. تازەگەریی

تەنیا ئەلتەرناتیڤی بونیادە تەقلیدییەکە نییە، بەڵکو ئەلتەرناتیڤێکە بەناو نەرێکردندا تێدەپەڕێت. تازەگەریی ئاشکراکردن و ڕووتکردنەوەی بونیادی پێشووە، بەڵام ئاخۆ نەرێکردن و تازەگەریی لە چ جومگەیەکی سەرەکیدا بەیەکەوە دەلکێن، نەرێکردن کاتێک ڕوودەدات کە «نەرێکەر ـ نەفیکەر» بەناو کۆی جەستەی «نەرێکراو ـ نەفیکراو»دا تێدەپەڕێت، نەرێکردن ئەوەیە خاڵ بەخاڵ جەوهەری میکانیزمی ئەزمونێک بخەیتە بەر خوێندنەوە و ئاشکراکردنەوە، واتە «نەرێکەر ـ نەفیکەر» ناتوانێت ببێتە هێزێکی نەرێکەر بەبێ «نەرێکراوێک ـ نەفیکراوێک».

لێرەوە شوناسی تازەگەریی مەحکومە بەوەی چۆن و چی نەرێدەکات «نەفیدەکات»، بەڵام بۆ ئەوەی ببێت بە نەرێکردن دەبێت بەناو بابەتەکەیدا بڕوات، لەکەڵککەوتنی مەعریفی، مێژوویی، ئایدۆلۆژیی «نەفیکراو» دەربخات. هیچ پرۆسەیەکی نەرێکردن لەگۆڕێ نییە، ئەگەر پرۆسەیەکی خوێندنەوەی بونیادیانە لەگۆڕێ نەبێت... واتە بەبێ دەستنیشانکردنێکی قووڵی بونیادی نەرێکراو پرۆسەیەکی ڕاستەقینەی نەرێکردن پیادەناکرێت، ئەو دەستنیشانکردنەش دەشێت لەم چەندین خاڵەدا بەرجەستەبکرێن:

١ـ دیاریکردنی بونیادی نەرێکراو، واتە میکانیزمی ئیشکردنی، چۆنێتی یاساکانی کارکردی بونیادەکەی، چۆنێتی دەرکەوتنی سیستمی گووتارە کانی.

٢ـ دیاریکردنی بابەت و وەزیفەی نەرێکراو.

٣ـ دیاریکردنی دەلالەتی مێژوویی نەرێکراو، واتە دیاریکردنی دوا سنووری ڕۆشنبیریی کە ئەو بونیادە نەرێکراوە دەتوانێت داگیربیکات و گووتارەکانی خۆی تێدا پیادەبکات بەمانایەکی تر، دوا سنووری «ئاشکرابوون»ـی بونیادەکە لەڕووی دەلالەتی مێژووییەوە.

٤ـ دیاریکردنی ئایدۆلۆژیا و ڕیشەی سۆسیۆلۆژیی نەرێکراو.

وەکو دیاریشمانکرد سیستمی نەرێکردن دووجۆرە ئاستی دیکەی هەیە: ئاستی یەکەم/ نەرێکردنی چەمک و ئاستی دووەم/ نەرێکردنی کۆ.

*نەرێکردنی چەمک* ئەو حاڵەتەیە کە تیایدا تاکە گووتارێک دەیەوێت تاکە گووتارێکی دی نەرێبکات، گووتارێک گووتارێک دەخوێنێتەوە، گووتارێک ئەوی دی دەخاتە بەر تیشک و توێژینەوەوە، فەرمانە ئایدۆلۆژییەکانی دیاریدەکات، دەقێکە و دەقێکی دی دەخوێنێتەوە. لەمجۆرە شێوازەی نەرێکردندا، پرۆسەیەکی نەرێکردن پیادەدەکرێت، بەڵام لە سنوورێکی دیاریکراو و بچووکدا وە زۆرجار ئەمجۆرە نەرێکردنەش لەناو یەک بواردا ڕوودەدات، واتە چەمکێک چەمکێکی دی نەرێدەکات، بێئەوەی هیچ یەک لەڕەگەزە سەرەکییەکان و مانا ستراتیژییەکانی و بونیادی هەڵگر بۆ چەمکی نەرێکراو زیانیان پێبگات. ئەمجۆرە دەربازبوون و سەلامەتییەی بونیادەکەش لە دوو ڕێگاوە دێت:

یاخود چەمکی نەرێکەر هەر لەڕاستیدا بەشێکە لە بونیادەکە و ئاستێکە لە ئاستە ئۆرگانییەکانی، لێرەوە ناکۆکی لەگەڵ گووتارێکی دیکەدا، ناگەڕێتەوە بۆ ڕۆحێکی تازەگەرییانە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ناکۆکییەکی سنووردار لەگەڵ چەمکێکی ناو هەمان بونیاد، یان بونیادی دیار و تەقلیدی دەتوانێت چەمکی نەرێکەر بگێڕێتەوە بۆ هەمان ئاستی گووتارەکانی خۆی.. واتە دەشێت چەمکی نەرێکەر بەشێک بێت لە ستراتیژێکی گەورەتر و کاریگەرتر، بەڵام هەوڵدەدرێت کە بخرێتە ناو هەمان پێکهاتەی گووتاری و وەکو چەمکێکی ناو بونیادەکە سەیربکرێت، لێرەوە نەرێکردنی چەمک بۆ چەمک وەکو جۆرێک لە مامەڵەی ئاسایی دەردەکەوێت کە نەرێکەر و نەرێکراو وەکو دوو بەشی ناو یەک پێکهاتە و ناو ئامێزی یەک بونیاد دەردەکەون. نەرێکەر و نەرێکراو هەردووکیان لە باوەشی یەک بونیاددا کۆدەبنەوە و یەک بونیاد ئارامییان دەداتێ... ئەوەی کە ئارامی نییە، ئەوەی لەگەڵ نەرێکراوەکەیدا لەیەک بۆتەدا کۆنابێتەوە نەرێکردنی تازەگەرییە. تازەگەرییە کە کۆی بونیادەکە نەرێ - دەکات، خوێندنەوەکانی سەرتاسەری بونیادەکە دەگرێتە خۆی، واتە

تازەگەریی تەنیا جۆرێک ناکۆکی نییە لەگەڵ بونیادی پێشوودا، بەڵکو گۆڕینی لۆژیکی هەموو ناکۆکییەکانیشە ـ منطق التناقضات ـ. کاتێک نەرێدەکات، چەمکێک نەرێناکات، لەگەڵ چەمکێکدا ناکۆک نییە، بەڵکو لە گەڵ کۆی بونیادەکەدا ناکۆکە... لەڕاستیشدا تازەگەریی ڕاستەقینە لەو ساتە دەستپێدەکات کە تازەگەر ئەو ڕاستییەی لا ئاشکرادەبێت کە لەگەڵ کۆی بونیادەکەدا ناکۆکە و بەناچاری دەبێت لە دەرەوەی ئەو بونیادەوە دەستپێبکاتەوە. واتە «تاراوگە ـ مەنفا» هەڵبژێرێت نەوەکو ناو بونیاد. تازەگەر بەناچاری دەبێت لە تاراوگەدا بژی، چونکە لەناو پێکهاتە مەعریفییە تەقلیدییەکەدا ناتوانێت و شوێنێکی بۆ نەماوەتەوە تیایدا نیشتەجێبێت. لەڕاستیدا تازەگەر لەسەرەتاوە لەگەڵ کۆی بونیادەکەدا ناکۆکە، بەڵام کاتێک بەئاگادێتەوە، ململانێکە خەریکە دەگۆڕێت بۆ ململانێیەک لەگەڵ چەمکە جیاوازەکاندا.. بونیادی سەلەف هەوڵدەدات تازەگەریی بکات بەچەمکێک و بیهێنێتە ناو خۆی، دەیەوێت کێشەی تازەگەریی بگۆڕێت بۆ ململانێی چەمکێک لەتەک چەمکەکانی تردا، یان گووتارێک لەگەڵ گووتارەکانی تردا. لەکاتێکدا تازەگەریی لەم ڕووەوە دەبێت زۆر زۆر وورپابێت. تازەگەریی بەپێچەوانەی سەلەفییەت و غەیبانییەتەوە دەبێت بەردەوام هەوڵبدات لەڕێگای نەرێکردنی چەمکەوە بۆ نەرێکردنی کۆ کاربکات. لە بێکەڵکی بەشەکانەوە، بێکەڵکی کۆ بخاتەڕوو. تازەگەریی کە مامەڵە لەگەڵ چەمکێکیشدا دەکات، بۆ ئەوەیە بونیادی کۆ ئاشکرابکات. بەڵام هەر لەڕێگای ئەو پرۆسەی نەرێکردنەوەیشەوە خۆی دروستدەکات. بۆیە دەبێت بەئاشکرا دەستبەرداری ئەو ئەفسانەیە ببین کە دەڵێت «تراژیدیای تازەگەریی لەوەدایە کە دەبێت بە کەرەستە کۆنە کان بونیادێکی نوێ دروستبکات». لەڕاستیدا تازەگەریی و بەتایبەت تازەگەریی کوردی بەحەتمی دەبێت بە کەرەستەکانی خۆی، واتە بە کەرەستەی تایبەتی خۆی ئیشبکات. ئەو کەرەستانە دابهێنێ یاخود هەندێکیان قەرزبکات، تواناشی هەبێت ئەو کەرەستە قەرزکراوانە لە فەرمانەکانیان جیابکاتەوە و فەرمانی نوێیان بداتێ کە لەگەڵ ستراتیژی کاری تازەگەرییدا بگونجێت. لێرەوە تازەگەر کە ناکۆکە لەگەڵ

بونیادەکەدا، ڕێگایەکی سەختی گرتۆتەبەر، ئەو ڕێگایەش ئەوەیە کە خۆی خۆی بێت، کەرەستەکانی کەرەستەی خۆی بێت و تەنیا پەیوەندیی لەگەڵ بونیادی تەقلیدیدا ئەوەیە نادیارەکانی ئاشکرابکات. تازەگەری کورد لە سنوورێکی زۆر تەسکدا نەبێت، ناتوانێت سوودێکی ئاشکرا و ئیجابی لە بەشەکانی پێش خۆی ببینێت، لەهەندێ حاڵەتی کەمدا نەبێت کەلەپووری ئێمە ناتوانێت هەڵوێستێک، یاخود تیورەیەک یان جیهانبینییەک بداتە تازەگەر... کە لەپووری ئێمە کەلەپووری عەرەب نییە تا بە لۆژیکێکی ئەدۆنیسیانە بەدوای «نەگۆڕ» و «گۆڕدراو»دا بگەڕێین. قەدەری تازەگەریی کورد ئەوەیە لەسەرەتاوە دەستپێبکاتەوە، کردەشی کردەیەکی دامەزراندن و جیاوازی بێت. واتە تۆ چەندە جیاوازییەکی مەعریفی ڕادیکالانەت لەگەڵ سەلەفدا هەبێت، هێندە زیاتر لەخودی خۆت نزیکدەبیتەوە. ئەمڕۆش یەکێ لە بەڵگەنەویستەکان ئەوەیە کە جیاوازییەک لەگۆڕێ نییە بەبێ دامەزراندنی ڕۆشنبیرییەکی ئەلتەرناتیڤ. نەرێکردنی کۆ مانای هەوڵدان بۆ دامەزراندنی ئەلتەرناتیڤێکی فیکری، ئەوەش دوا ستراتیژی هەموو تازەگەرێک و هەموو تازەگەرییەکانیشە.

## چۆنێتی کۆبوونەوەی گووتارەکان

### «زمانی داڕشتن وەکو پێکهێنێکی سەرەکی دەقی کوردی»

«بونیادی دیار، واتە بونیادی گووتارە لەیەکتر ترازاوەکان». ئەمە یەکێکە لەو ڕاستییە گشتییانەی کە ئەم لێکۆڵینەوەیەی لەسەر داڕێژراوە. لەبەشە کانی پێشووشدا بەشێوەیەکی بەربڵاو کارمان بەو گووتارە کرد، بەڵام هەر گووتارێکی لێکترازاو ڕێگایەکی بەرجەستەبوونی هەیە، هەڵگرێک هەیە کە بڵاویدەکاتەوە، زمانێک هەیە بەرجەستەیدەکات و فۆرمێک هەیە چێوەیەکی دیاریکراوی دەداتێ. گووتارێک بۆ ئەوەی لە شێوەی دەقێکدا بەرجەستەببێت، ڕێگایەکی تایبەتی بەرجەستەبوونی هەیە و ڕێگایەکی تایبەتی بەدەقبوونی دەبێت. هیچ گووتارێک تا سەر بەڕووتی نامێنێتەوە،

ئەو گووتارانە زۆر کەمن کە بەڕووتی لەدایکدەبن و هەر بەڕووتی دەمرن، واتە زەمینەیەک و کەناڵێکی ناوکۆیی وەکو دەق دروستناکەن بەرجەستەیانبکات و فراوانیانبکات و قسەیان لەسەربکات... تەنیا هەندێک گووتار نەبێت کە بەشێوەی دروشم دێنەپێشێ و لەو شێوەیەدا گیردەخۆن و ڕادەوەستن و دواتر هیچ دەقێک، هیچ کەناڵێکی زمانی دیکە نایانکات بەبابەت و لە بەرگێکی ڕازاوەتردا نایانخاتەڕوو. یەکێک لە کارەساتە گەورەکانی دەقی کوردی ئەوەیە کە زۆرجار تەنیا ناوکۆییەکی زمانیانەی گووتارێکن لە گووتارەکان، گووتارەکان دەقیان کردووە بە ڕووبەرێکی تایبەت بە دەرکەوتنی خۆیان، ڕاستە هەموو دەقێک بەرجەستە بوونی گووتارێک یان چەند گووتارێکە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە جەوهەری دەق «هیچ نەبێت لە ئاستی هوشیاریدا» ئەوەیە کە کەناڵی بەرجەستەبوونی گووتار بێت، کەرەستەی بەرجەستەبوون بێت و خۆی تەنیا هۆکارێک بێت بۆ دەرکەوتنی گووتارێک لە گووتارەکان و هیچی تر، بەڵام گووتاری کوردی زۆرجار کۆنترۆڵی خۆی بەسەر دەقدا سەپاندووە و دەق تەنیا هۆکارێکی دەرکەوتنی گووتارە، بەڵام گووتارێک کە دەرهاویشتی مەنهەج بێت، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی نەبێت بە دونیاوە، لەناو وێناکراودا بژی، سیستمێکی زاراوەیی نەبێت کاری پێبکات، ژێرخانێکی گووتاری نەبێت کە لەڕێگایەوە گووتارەکان دایەلۆگ لەگەڵ چەمکەکانی «ئەویدی یان بەرامبەر» دا بکەن، یان پراکتیکی ماناکانی خۆیان بکەن... دەبێت لەناو دەقی کوردیدا لەڕێگای چ شێوە زمانێکەوە دەربکەوێتەوە؟

ئاشکرایە دەرکەوتنی گووتار لەڕۆشنبیری ئێمەدا لەڕێگای زمانێکەوە نییە بارگاوییبێت بەفیکر و دەلالەتی فیکری، بارگاوییبێت بەمانای جیاواز و مەبەستی جیا و دایەلۆگ و نەرێکردن، لەبەرئەوەی ئەو جۆرە سیفەتانە هیچیان لەو ژینگە ڕۆشنبیریەدا نین کە زمانی ئێمە تیا کاردەکات، لێرەوە گووتار بۆ ئەوەی لە گووتارێکی ڕووتەوە بگوازرێتەوە بۆ جەستەیەکی بەرجەستەبوو لە دەقێکدا، پێویستی بەزمانێکی تایبەت هەیە، زمانێک کە

لە پشت ئەو هەموو کەموکورتییە مەعریفییەوە، لەناو ئەو بیابانە دەلالییەدا توانای هەبێت ببێتە هەڵگری گووتار و گەیەنەری گووتار... زمانێک ئەگەرچی زمانێکی مەعریفی نییە، بەڵام توانای ناساندن و گەیاندنی فەرمانە سۆسیۆلۆژی و ئایدۆلۆژییەکانی گووتاریی هەیە، واتە ئەو فەرمانانەی کە بونیادی سەلەف دەیخاتە ئەستۆی. ئەو ناوکۆییەی زمانیش «السیاق اللغوی» بە «زمانی داڕشتن ـ اللغة الانشائیة» ناودەبەین، کە خەسڵەتی سەرەکیی زمانی ئەو دەقانەیە کە تا ئەمڕۆ گووتارە سیاسی و ئەدەبییەکان بەرهەمیانهێناون.

زمانی داڕشتن ئەو زمانەیە کە گووتار لە دەقێکدا نیشتەجێدەکات، بەڵام بێگومان دەقێک کە گۆشەگیریی گووتارەکان نابڕێت و یەکەیەکەبوونیان ناشکێنێت، بەڵکو ئەستووورتریاندەکات. زمانی داڕشتنی زمانی زەخرەفەکردنی گووتارە تا بەجۆرێکی شیاوتر و کاریگەرتر لە نێرەرەوە بگاتە وەرگر، ئەو فێڵەیە کە نێرەر لە وەرگری دەکات بۆ ئەوەی ئەو بەرهوتەی ژینگەی گووتار داپۆشێت و ئەو ئیفلیجییە مەعریفییە مەکیاجبکات کەلەپشتێتی. داڕشتن ئامادەیی گووتار ئاسانتردەکات، هەوڵدەدات وای لێبکات زیاتر قبوڵبکرێت، هەموو گووتارەکان لەڕێگای زمانی داڕشتنەوە خەریکی جوانکردنی خۆیانن و هەوڵدەدەن لەکارکردندا بۆ بەجۆشهێنانی هەست بزوێنتر و بەهێزترین، چونکە ئاشکرایە لەڕووی عەقڵییەوە کاریگەرنین، بەڵام گرنگترین سیفەتی زمانی داڕشتنیش ئەوەیە کە نایەت بۆ ئەوەی بمێنێتەوە، بەڵکو دێت بۆ ئەوەی بمرێت، دەردەکەوێت و ونبوونێکی ئەبەدی وندەبێت، ناتوانین بیشونهێنین بە نەیزەکیش، چونکە زمانی داڕشتن هەڵگری ئەو تین و ڕووناکییە نییە، بەڵکو لە هاویشتنی بەردێک دەچێت کە دواجار دەکەوێتە ناو بیابانێکی لمەوە و هیچ شتێک لەدوای خۆی جێناهێڵێت.

دەقە ئینشاییەکان بوونێکی خێرا و کاتییان هەیە و ناتوانن نەمرین، چونکە نە لەڕووی مەعریفییەوە و نە لەڕووی ستاتیکییەوە «داڕشتن» خاوەنی خەسڵەتی نەمری و بەردەوامی نییە. داڕشتن گووتارێک دەخاتە

ئاو ناوکۆییەکی زمانییەوە، زەخرەفەیەکە گووتار بەکاریدەهێنێ بۆ دەرکەوتن، کە گووتار کشایەوە دواوە، ئیتر ئەو زەخرەفەیە نرخ و بەهایەکی نامێنێت، جارێکی دیش کە دەیەوێت دەرکەوێتەوە، لەڕێگای جۆرە دارشتنێکی ترەوە خۆی دووبارەدەکاتەوە. دارشتن گووتار دەخاتە ڕوو و خۆی دەمرێت، بەمجۆرە گووتارەکان بەزیندوێتی دەمێننەوە و دارشتنەکان دەمرن. «کوردستان یان نەمان» بەزیندوێتی دەمێنێتەوە و هەموو ئەو پەخشان و وتارانەی لەدەوری ئەو گووتارە وتراون مردون و بیرچوونەتەوە. دارشتن خۆکوشتنی زمانە لەپێناوی ئەرکە ئایدۆلۆژییەکاندا، پرۆسەیەکی بەردەوامە، هەموو ڕۆژێک دووبارەدەبێتەوە، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ دەینوسێت تا بەیانی ناژی، بەیانی پێویستە هەمان گووتار لە دارشتنێکی تردا دەریکەوێتەوە.. زمانی دارشتن پێویستە هەموو ڕۆژێ خۆی دووبارەبکاتەوە، بێئەوەی هیچ پارچە دارشتنێکی توانای مانەوە و گەیشتنی هەبێت بە نەمری، بۆ ئەو دووبارەبوونەوەیەش پەیڕەوی کۆمەڵێک کلێشەی تایبەتی دەکات، کۆمەڵێک کلێشەی ئامادە، کە لۆژیکێک و ڕێزمانێکی ڕەوانبێژی ئامادەیان هەیە و گونجاوترین شێوەی خۆدووبارەکردنەوەن... لە سێ ژمارەی یەکێک لەڕۆژنامە کوردییە کاندا حەوت وتارم ژمارد کە بەم کلێشەیە دەستپێدەکەن «لەدوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی ئازاری ساڵی 1991 و کۆڕەوی گەلەکەمانەوە...»، پێموایە ڕێژەی دووبارەبوونەوەکان لەوەش زیاترن. سەرجەمی ئەو وتارانەی کە دەربارەی ڕژێم نوسراون لە کۆمەڵێک کلێشەی دووبارەبووەدا دەنوسرێن کە لە باسکردنی بەیانی ئازارەوە پیادێت تا دەگاتە سەر ئێستا. ئەم چیرۆکەش هەموو ڕۆژێ لە هەموو کەناڵەکانی تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکانەوە دووبارەدەبێتەوە. سەرجەمی ئەو وتارانەی کە دەربارەی «یەکگرتن» نوسراون، کۆمەڵێک دارشتن بوون بۆ جوانکردنی یەکگرتنێک کە لەڕووی فیکرییەوە بنەما و بنچینەی نییە. ئاشکرایە لەم ڕووەشەوە دارشتنی کوردی چەندەها نوسەر و نیمچە قەڵەم بە دەستی خولقاندووە کە پێشەنگی ئەو کولتوورەی ئەمڕۆن، بەئەندازەیەکیش خوێنەری کورد لە داوەکانی ئەم جۆرە نوسینانەدا دەستبەسەرکراوە هیچ ئاسۆیەکی دوور و

نزیک نییە ئەم خوێنەرە لە داوەکانی ئەو شێوە نوسینە دەربازی ببێت، بەمجۆرە زمانی داڕشتن هەموو شەرم و شوورەیی سەلەفیەتی کوردی دادەپۆشێت و ئەو وەهمە گەورەیە سەوزدەکات کە ئێمەش زانستمان هەیە، جا لەئاستی سیاسیدا بێت یاخود ئەدەبی، هەر لێرەشەوەیە کە پێموایە ئەم کولتوورەی ئەمڕۆ ئێمە لەناویدا دەژین ئیمپراتۆرییەتێکی بێسنووری وەهمە .

لێرەدا پرسیارێکی ڕەوا سەبارەت بەڕۆڵی «نوسەر» دێتەپێشێ... لە ڕاستیدا جگە لە هەندێک نوسەری داهێنەر نەبێت کە توانای شکاندنی زمانی داڕشتنیان هەبووە، ڕۆڵی نوسەری ئێمە تەنیا لەیەکدان و کۆکردنەوەی «گووتار» و «داڕشتن»ـە. هەمیشە کۆمەڵێک گووتاری ئامادە هەیە لە دەرەوەی نوسەر، جۆرێک لە کلێشەی بەربلاوی داڕشتنیش هەیە.. لێرەدا کاری نوسەر دەبێتە کاری لەیەکدانی ئەو گووتارانە بەو کلێشە جۆراوجۆرانەوە، بەڵام داڕشتن پرد نییە لەنێوان گووتار و گووتاردا، چونکە ئەگەر وابوایە دەبوو بەپردێکی مەعریفی، داڕشتن پردە لەنێوان گووتار و وەرگر یاخود بەکارهێندا. گووتار خۆی بەتەنیا هێندە دەوڵەمەند نییە کەڕازیبوونی وەرگر بپچڕێت و قەناعەت بەخوێنەر بکات، بۆ نمونە گووتارێکی وەکو «ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و دیموکراتییەت بۆ عێراق» یان گووتارێکی وەکو «یەکگرتنەوەی چوار پارچەکەی کوردستان» ئەگەر ساڵانێکی دوور و درێژ بە چەندەها داڕشتنی سیاسی زەخرەفە نەکرابایە و تائەمڕۆش زەخرەفە نەکرێت، لەو بەرهووتە فیکرییەی کە لەتەک خۆیاندا پاراستوویانە، توانای ژیان و مانەوەیان نەدەبوو، لێرەوە داڕشتن دەبێت بەو قاپە زیوینەی کە گووتار پێشکەشیدەکات. هەوڵی داڕشتن ئەوەیە کاریگەرێکی وا لەسەر هەستی خوێنەر جێبهێڵێت کە چ بەرگریی و مقاوەمەتێکی کاریگەر لەلا نەهێڵێت، بەمانایەکی تر داڕشتن بۆ ئەوەی گووتاری خۆی پیادەبکات دەبێت توانا عەقڵییەکانی وەرگر لاوازبکات... ستراتیژی زمانی داڕشتن، بەهێزکردنی سۆز و لاوازکردنی عەقڵە، ئەمەش ستراتیژی هەموو گووتارێکە کە

ژێرخانێکی مەعریفی گەورەی نەبێت، لەم ڕووەشەوە گووتارەکانی ناو فەرهەنگی کوردی گووتاری بێوێنەن. بەکورتی زمانی داڕشتن ئەو شەپۆلەیە کە لەم ساتەدا گووتارێک هەڵدەگرێت و دەیگوازێتەوە و دەیگەیەنێت و دوای ئەوە ئیتر دەمرێت... زەخرەفەی زمانێکی تاک ڕەهەندە، زمانێک کە ئاسۆ و ئازادیی نییە، ئاسۆی نییە بەو مانایەی هیچ وشەیەک ناتوانێت هەڵگری زیاد لە دەلالەتێک بێت، ئازادیش نییە، چونکە لە ئازادیدا وشەکان لەمانا دێرینەکان ئازاددەبن و بەرەو دامەزراندنی دەقی نوێ هەنگاودەنێن. هەر لێرەوەیە کە دەتوانین بڵێین زمانی ئێمە لە ئێستادا و لەڕووبەرە سەرەکییەکان و لە وەزیفە جەوهەرییەکانیدا زمانێکی تاک ڕەهەندە کە لە زەخرەفە زیاتر کاری تری نییە. گووتاری سیاسی لەبەرئەوەی زمانێکی زانستییانەی سیاسی نییە قسەی پێبکات، لە داڕشتندا بەرجەستەدەبێت، هەروەها گووتاری ڕەخنە و ئەدەب و دین و لەکەکانی دیکەش، لەداڕشتندا ڕێگاکانی سەفستەکردن دەگرنە بەر، لێرەدا ڕاکردن لە هەڵوێستی کۆگیر و ڕادیکال بەمانا گەورەکەی ونە و ئەوەی کە ئامادەیە هەندێک کڵێشەی سیاسییە کە بەخواستی تیژکردنەوەی ململانێ بچوک و ڕووکەشەکانی ناو بونیادەکە کاردەکەن. واتە بەکورتی ئەو سیستمە سیاسی و مەعریفییەی ئەمڕۆ ئێمە لە ناویدا دەژین، تەنها زمانی داڕشتن بەکاردەهێنێت تا لەڕێگایەوە هەڵوێستە ڕووکەشەکانی خۆی بگۆڕێت، بێئەوەی ئامادەگی خۆی ونبکات.

زمانی داڕشتن بەرەنجامێکی سروشتی نەبوونی زمانی زانستییە، هەر لەسەرەتاوە کە نوسین لەدایکدەبێت، زمان لەناو دووڕیانێکدا دەجوڵێتەوە: یان دەبێت زمانێکی زانستی بێت کە هەر کایەیە و هەر جێگایە، شێوەزمانی تایبەتی خۆیانی تێدا پیادەدەکەن، یان دەبێت داڕشتن و زەخرەفە بێت و زمانێکی سەتحی و گشتی بێت. ڕۆشنبیریی ئێمەش ڕێگای دووەمیانی هەڵبژاردووە.

دوا ڕستە کە بشێت لێرەدا بوترێت ئەوەیە کە زمانی داڕشتن ئاشکراکردن و پەردە لەڕوو هەڵماڵینی هەموو جۆرە نوسینێکی سەلەفە. لەهەر

شوێنێکدا داڕشتن هەبێت، بەشێک لە سەلەف و غەیبانییەت بەجێماوە، ئەمڕۆ بەداخەوە لەکۆمەڵێک نوسینی نوێشدا کە بەڕووکەش بە سەرچاوە و زاراوەی فیکری نوێ پڕچەک دیارن، هەمان کارکردنی سیستمی داڕشتن بە زەقی دەبینینەوە و هەستدەکەین ئەمجارە سەلەفییەتی نوێ لەبری گووتارە تەقلیدییەکانی خۆی بەگۆڕینی بابەتە فیکرییە هاوچەرخەکان بۆ زمانی داڕشتن دەیەوێت ڕۆحی هەر پرۆسەیەکی فیکری نوێ لەباربەرێت. لەسەر هەمان ڕەوتیش بە ئاشکرا کۆمەڵێ نوسەری لاو دەخوێنینەوە، کە جگە لەڕیزکردنی ناوی کۆمەڵێ زانا و فەیلەسوف و ڕێبازی فیکری هیچی تر نین و نەیانتوانیوە هەرگیز نزیکبوونەوە لەو ئاستانە بگۆڕنە سەر پرۆسەی فیکری بەرهەمهێن و لەتەکیشیدا تەمومژاویکردنێکی درۆزنانەی دەقەکان هەیە، کەلەبنەڕەتدا بۆش و بەتاڵییەکی مەعریفی دەشارێتەوە. دواجار زمانی داڕشتن یارمەتی ئێمەدەدات کە بیگۆڕینە سەر پێوەرێکی تایبەت تا لەڕێگایەوە هەموو تازەگەرییە درۆزنەکان بناسینەوە. داڕشتن لەو گیاندارە بەردینانە دەچێت کە تەمەنی چینە بەردینەکان دیاریدەکەن، هێندەی دەرکەوت بونیادێک ئاشکرادەکات، کە هەڵبەت بونیادی «دیار»»ـە، لێرەوە تازەگەریی بریتییە لە گۆڕینی ستراتیژی زمان و فەرمانەکانی زمان کە ئەوەش بۆ خۆی کردەیەکە ڕاستەوخۆ دژ بە «داڕشتنگەرایی»ـە .

*پرسیار: پتر وەک ڕەخنەگرێکی بونیادگەر ناسراوی، واز لەو ساویلکانە بهێنە کە پتر ناوی بونیادگەریان لە ڕۆژنامەیەک یان نامیلکەیەکی بچوکدا بینییوە و بێئەوەی لە ماناکەی تێبگەن خێرا وەک بەرچەسپێک دەینێن بەم و بەوەوە، دوور لەمانە بە ڕاستی هەمیشە لای تۆ ئەو زاراوە و چەمکانە دەبینینەوە کە مۆری بونیادگەرییان هەڵگرتووە، ئەمڕۆ دەمەوێت قسە لە سنووری پەیوەندی تۆ بکەین بە بونیادگەرەکانەوە، ئەم پەیوەندییە لە کویادا دەستپێدەکات و لەکویادا کۆتاییدێت؟ بەڵام بەر لەوەی بچینە سەر ئەوە سەرەتا حەزدەکەم کەمێک لەسەر میتۆد و ترس لە میتۆد قسەبکەین... بە ڕای ئێوە لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا چۆن سەیری میتۆد دەکرێت؟*

بەختیار عەلی: بۆئەوەی ئەم پرسیارە وەڵامبدەمەوە ڕێگایەکی زۆر درێژ دەگرمە بەر، ڕێگایەک پێموایە ڕێگایەکی ناچارییە بۆ ئەوەی بە ڕاستی و قووڵی وەڵامی پرسیارەکەتان بدەمەوە، لەبەرئەوە هیوادارم تەحەمولی ئەو ڕێگا درێژەبکەیت کە ناچارین پیابڕۆین. بۆ وەڵامدانەوەیەکی ڕاستەقینەی ئەو پرسیارەی بەڕێزتان، دەبێت وەڵامی کۆمەڵێک پرسیاری دیکە بدەمەوە کە بەمجۆرەی خوارەوە دەیانخەمە پێشدەم :

1. ئایا سروشتی ئەو ترسەی لە مەنهەج «میتۆدی» نوێ هەیە، چ جۆرێکە... ترسێکی مەعریفییە یاخود ترسێکی سایکۆلۆژی؟

2. ئایا سروشتی ئەو توهمەتانەی دەدرێنە پاڵ ئەو میتۆدانە، تا چ ڕادەیەک مەنتیقی و دارێژراون؟

3. ئایا ئەمڕۆ چ ڕێگایەکمان لەبەردەمدایە بۆ تەماشاکردنی کێشەی میتۆد؟

4. ئایا گۆڕینی مەنهەجیانە لە ڕۆشنبیریی کوردیدا هەڵقووڵاوی پێداویستییە ناوخۆییەکانی ناو ڕۆشنبیریی کوردییە، یاخود هەڵقووڵاوی ویستی لاساییکردنەوەی هەندێ لە نوسەرانە؟

5. ئایا چی شتێک ڕێگربووە لەوەی هەوڵەکانی نوێکردنەوە لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا درەنگ بگاتە ئاستی تازەکردنەوەی مەنهەجەکانی بیرکردنەوە؟

لە ڕاستیدا بەبێ وەڵامدانەوەی ئەو پێنج پرسیارە ناتوانم وەڵامی پرسیارەکەی سەرەوەت بدەمەوە

واتە پێش وەخت دەبێت سروشتی ئەو فۆبیایە لە میتۆدە تازەکان دیاریبکەم. دواتر لە سروشتی ئەو توهمەتانە ڕابمێنم کە دەخرێنە پاڵ ئەو میتۆدانە، نیگای تایبەتی خۆم بۆ کێشەی مەنهەج باسبکەم، لەپەیوەندی نێوان گۆڕانی مەنهەج و تازەگەریی بدوێم، کەمێکیش لەئاست پێویستی تازەگەری و کۆسپە مێژووییەکانی بەردەمیدا ڕابوەستم .

سەرەتا حەزدەکەم لە لۆژیکی ئەوجۆرە بەرچەسپانە بڕوانم کە ئیشکردن بە میتۆدێک، وەک جۆرێک لە گوناه تەماشادەکەن، وەک ئەوەی کاتێک چەمکێکی دەرونشیکار یا چەمکێکی بونیادگەر یا پۆستمۆدێرنانە یا هێرمۆنتیکیان بەدەستەوە گرتی وەهابێت وەک زەرفێ حەشیش، خەنجەرێک یا چەکێکی قاچاغیان پێگرتبیت. پرسیارەکە لەوەدایە بۆچی لە ناکاو ڕۆشنبیرێک یان چەند ڕۆشنبیرێک تەنیا لەبەرئەوەی هەمان ئەو چەمکانە بەکارناهێنن کە ئەوانی دی بەکاریاندەهێنن دەبنە گوناهبار، بێگومان ڕەتکردنەوەی هەر میتۆدێک یان هەر ئایدۆلۆژیایەک یان هەر ڕێبازێکی فەلسەفی، دوو هۆکاری گەورەی لە پشتە 1 ـ یاخود ئەو میتۆد و ئایدۆلۆژیاو ڕێبازانە حاڵەتێک دروستدەکەن کە کۆی سیستەمەکە پێی ڕانەهاتووە، واتە دۆخێکی نائاسایی لە فەزاییەکی کولتووریدا دروستدەکەن پێشوەخت پێکهاتی کولتووری و فیکری ئامادەگی وەرگرتنی نییە، تەواو وەک هاتنی دژە تەنێک بۆ ناو لەش... لێرەوە تەواوی سیستمەکە ئاژێرەکانی ترس لێدەدات، تەواوی سیستمەکە بەها و نرخەکانی خۆی

دادەپۆشێت و دەیەوێت لەو مەترسییە تازانە بیانپارێزێت، دیارە ئەم ترسە هێندەی ترسێکی سایکۆلۆژییە و پەیوەندی بە دەست لەرزینی ئەوانەوە هەیە کە لەسەرمایە ڕەمزییەکەی خۆیان دەترسن کە بە حیساب خەزێنی ڕۆشنبیرییان پێشکەشیاندەکات پەیوەندی بە ترسێکی مەعریفییەوە نییە.

لە نێوان مەعریفە و مەعریفەدا ترس نییە، بەڵکو جیاوازی هەیە کە لە میتۆد و چەمک و دەرەنجامگیرییەکاندا دەردەکەوێت، لەنێوان مەعریفەو مەعریفەدا تەنیا دادگاییکردنی مەنتیقی هەیە، کاتێک تاوانبارکردن، شوێنی دادگاییکردنی مەنتیقی گرتەوە، کاتێک توهمەت فرێدان، شوێنی خوێندنەوەی ناوەکی تێکست و نوسینی گرتەوە، لێرەدا لە بەرامبەر جەنگی فیکردا نین، لە بەرامبەر سیستمێکداین کە لە بەرگری مەعریفییانەوە گواستوێتیەوە بۆ شێوازەکانی دیکەی بەرگری، بۆ بەرگریکردنی ئایدۆلۆژیانە، بۆ بەرگری دینی و ئەخلاقی. لە دیالۆگی مەعریفەو مەعریفەدا، لە دروستبوونی جیاوازی مەعریفییدا لە نێوان دوو بۆچووندا، هەموو بەڵگەیەک پشت ئەستوور بە کۆمەڵێک بەڵگەی تر دەردەکەوێت، هەموو بەهەڵەدانانێک چەندە بچوکبێت پێویستی بە ئیشی گەورە هەیە بۆ سەلماندنی... هیچ یەکێک لە ئێمە ناتوانین هیچ ڕێبازێک یان هیچ موفەکیرێک ڕەتبکەینەوە لەبەرئەوەی حەزمان پێی نییە، لەبەرئەوەی قسەکانی جیاوازن لەوانەی فێریانبووین و بیستوومانە، بەڵکو لەبەرئەوەی لە سنووری بابەتەکانی ئەودا، لە سنووری تێگەیشتنماندا لەو بابەتانە دۆزینەوەی تر، ئەرگومێنتی داڕێژراوتر و خوێندنەوەی ترمان پێیە. بەڵام لە حاڵەتی ترسدا توانای سەلماندن، توانای داڕشتنی ڕەخنە، توانای چەسپاندنی سەرەتا تیورییەکانی گفتوگۆ تەواو وندەبێت... جیاوازی لە نێوان «مەعریفە» و «فۆبیادا لە مەعریفە»، ئەوەیە لە جیاوازی مەعریفیدا تۆ دەتەوێت جیاوازی خۆت بۆ بۆچوونێک دەربڕیت، دەچیتەوە سەر هەمان بابەت و بەکەرەستەی تر جیاواز لەو فەلسەفەیەی قبووڵت نییە ئیشدەکەیت، دەشیسەلمێنێت هەمان بابەت لە دیدێکی تر و لە خوێندنەوەیەکی ترەوە ڕوونتر دەبینرێت و ئاشکراتر دیوە

شاردراوەکانی دەردەکەوێت ... «فۆبیاش لە مەعریفە» تەواو بە پێچەوانەوە ڕاکردنێکی بەردەوامە لە ئیشکردن لەسەر بابەت، لەسەر چەمکەکان «المفاهیم»، لەسەر شیکاری ناوەکی تێمەکان و تەوەرەکان، بەرەو شتە لاوەکییەکان، بەرەو ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بەبابەتەکانەوە نییە، بەرەو ستراتیژی خۆشاردنەوە، ڕووبەڕوونەبوونەوە لەگەڵ تەوەرە سەرەکییەکاندا، سیاسەتی پەلاماری پەلە لە ڕێگای هەندێ توهمەتی خێراوەو ڕاکردنەوە بۆ ناو تاریکی. ئەم ترسە یان ترسێکی سایکۆلۆژیی ڕووتە، ترسێکە پەلاماری نوسەرەکان دەدات نەوەک بابەتەکان. واتە بە کورتی جۆرێک لەشەڕی چەتەگەری لەگەڵ زانستدا دەکات، ئەمە لەکاتێکدا «شەڕی چەتەگەری» لەزانستدا بوونی نییە .

*پرسیار: پێتوایە ئەمە پەیوەندی بە سیستمەکەوە هەیە؟*

بەختیار عەلی: تا سیستمەکان لاوازتر و لەرزۆکترین، توانایان لەسەر بەرگری نامەعریفییانەتر دەبێت... کێشەکە لێرەدا ئەوە نییە تۆ بونیادگەری یان چیبیت، بەڵکو ئەوەیە هەموو چەمکێکی نوێ هاوسەنگی سایکۆلۆژی ئەو ناوەندانە تێکدەدا... بەڵام ئەم ترسە سروشتێکی سەیری هەیە، ئەم ترسە ناوێرێت دەست لە خودی فیکرەوە بدات، ناوێرێت نوسینەکانی تۆ هەڵگرێت و لە ناوەوە بیانێنێتە بەر دادگایەکی مەنتیقی، ئەم ترسە هەمیشە تێکستەکان بە ساغی وەک خۆی جێدەهێڵێت، نوسینەکانت سەلامەتن لەبەردەمیدا، نوسینەکان هەمیشە دەمێننەوەو بەدووردەبن لە دەستکاری، بەدوور دەبن لە پەلامار، بەدووردەبن لە ئیستیفزازکردنی ناوەڕۆکەکانیان. لەم ڕووبەڕووبوونەوەدا یاسایەکی سەرەکی باڵادەستە، ئەویش یاسای بیربردنەوەی بابەتەکانە، بیربردنەوەی ئەوەی تۆ چیت گووتووە، بیربردنەوەی ئەوەی تۆ لە چی قسەتکردوە و چۆن قسەتکردوە... ستراتیژی ئەم جۆرە عەقڵییەتە ترسنۆکە ئەوەیە سەرەنجی خوێنەر لە بابەتەکان دوورخاتەوە، ئەگەر وێراشی و دەستی بۆ

ناوەوەی تێکستەکان برد، ئەوا دەست بۆ هەندێ ئاستی دەبات کە بە فرسەخ جەوهەری ئەو بابەتانە لە مەسەلە جەوهەرییەکە دووردەخاتەوە. کێشەی بەئەندازەی عەقڵی خۆیت بۆ دروستدەکات، کێشەی ئەوەی ئەم وشەیە بە واوێک دەنوسرێت یان دوو واو، کێشەی ئەوەی بۆ کردارەکەت بە زەوقی ئەو لە دواوە یان پێشەوە نەنوسیوە. تادوایی لەمجۆرە نمونانەی کە بینیوتن. ئەمجۆرە ترسە سیستماتیکییە، ناتوانێت بیر لەوە بکاتەوە ئایا تۆ شیکارەکەت هەڵەیە یان ڕاست، ئەرگومێنتەکانت تیوریزەکراون یان نا، بەڵکو بیر لەوە دەکاتەوە ڕێگایەک بۆ خوێنەر پێکوڵبکات، لە بابەتەکەی دووریخاتەوە... لە پرسیارە سەرەکییەکانی دووریخاتەوە و دواجاریش نوسەرەکان بەرەو مەیدانی لاوەکی ڕابکێشێت و لەویادا شەڕیان لەگەڵدابکات... پرسیارەکە ئەوە نییە کە ئایا من کاتێک «کۆمەڵگای پرسە» دەنوسم، بە ڕاست کۆمەڵگای پرسە هەیە؟ ئایا ئەرگومێنتەکانم لۆژیکیان تیایە؟ ئایا بە ڕاست لە نێوان سیاسەت و دیندا پەیوەندییەک هەیە کە لە پشت جیاوازی ئایدۆلۆژییەوە لێکچوونێکی میکانیزمییانەی دروستکردووە؟ ئایا ئەو چەمکانەی من بەکاریدەهێنم هێز و لاوازییان لە کویادایە؟ هیچ یەکێک لەمانە نابنە کێشە، بەڵام بەرامبەر ئەوانە کۆمەڵێک کێشەی لاوەکی دروستدەکرێت، کۆمەڵێک پرسیار کە کەم تا زۆر پەیوەندی بە بابەتەکانەوە نییە. بۆ نمونە ئەوە دەبێتە کێشە ئایا من ڕێنوسم بە پێوەدانی فلانە ڕێزماننناس یان ڕێزماننەناس تەواوە؟ ئایا من عەرەبییەکەم تەواوە؟ ئایا من کوڕی باشم یان شەڕفرۆشم؟ ڕێزی فۆلکلۆری کوردی دەگرم یان نا؟ ئایا بونیادگەرییەکەی من لە بونیادگەری فەرەنسییەکان دەچێت؟ ئایا من خێزانەکەم شەهیدی هەیە؟ ئایا من بۆ ڕەخنەدەگرم و ستایشناکەم؟ ئایا من «مارشی سەربازییم» کردووە!!؟ ئایا هەڵوێستم بەرامبەر فلانە حیزب چییە؟ ئایا باوەڕم بە خودایە؟ ئایا فلانە سیاسی دەناسم؟ . دیارە بۆ هەر یەکێک لەم پرسیارانەش وەلامی خەیاڵی خۆی هەیە کە هەر خودی ئەوەی پرسیارەکە دادەنێت خۆی دروستیدەکات. ئایا ئەمجۆرە پرسیارانە، ئەمجۆرە ستراتیژی گومان دروستکردنە چییە، جگە لە ڕاکردن لە نوسین بەرەو نوسەر؟ هەموو ئەو

پیاوانەی کە ناوێرن بچنە ژێر چەتری خوێندنەوەی دەقەکانەوە دەچنە ژێر چەتری گوناهبارکردنی نوسەرەکان... ئاسانە تۆ بە پەراوێزەکان بوێریت، بەڵام گرانە بە جەوهەر بوێریت؟ سیستمێک کە مۆراڵی خۆی لەسەر تەکتیکی شێواندن بونیادنابێت ئاسانە بە نوسەرەکان بوێریت، بەڵام زۆر سەختە دەرەقەتی دەقەکان بێت. لە مشەڕەدا تۆ بریندار دەکرێیت و دەقەکانت هەمیشە لەودیوی ئەو پەلامارە ڕوکەشانەوە سەلامەتن. سیستمی ترسنۆک کاتێک دەزانێت هێز و توانای دەرکردنی تێکستەکانی نییە، لەبری تێکستەکان هەوڵی دەرکردنی نوسەرەکان دەدات. کاتێک دەزانێت دەقەکانی پێ تێکناشکێت، هەموو هێزەکانی خۆی لە هەموو کەناڵەکاندا موبیلیزەدەکات، تا شەرعییەتی مەعریفی، ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی لە نوسەر بستێنێتەوە... بەڵام نوسەر دواجار مرۆڤە، من و تۆ بەدەر لە هەموو شتێکمان قابیلی تێکشکانین، من و تۆ قابیلی ئەوەین ئەوان بە هەموو هێزە سیستماتیزکراوەیانەوە، بە هەموو ئەو تەکنیکە گەشەکردووەوە لە شێواندندا، بەهەموو ئەو لێشاوە لە بۆهەڵبەستن و درۆ، بە تەکنیکەکانی بڵاوکردنەوەی ئەو درۆیانەش بمانشکێنن. لەوانەشە بیکەن. بەڵام ئەوەی جوانە و هەرگیز تا کۆتایی ئەوانە پێیناوێرن خودی دەقەکانە، ئەوەی جوانە قایمی دەقەکانە لەبەردەم مردندا، قایمی دەقەکانە لەبەردەم تەکنیکەکانی شێواندندا... داهێنان کاتێک سەردەکەوێت کە دەقەکان لە مرۆڤەکان بەهێزتربن... کە دەقەکان دەچنە جێگایەک هیچ دەستێ «تەنیا دەستی ئەوانە نەبێت کە خۆشیاندەوێت، یان تەواو تێیدەگەن یان تەواو توانای بەرزبوونەوەیان هەیە بۆ ئاستی ئەو» پێیاننناگات... بەهەرحاڵ دەمەوێت بڵێم کاتێک ترسێکی سایکۆلۆژی باڵادەست دەبێت، بیرکردنەوە وندەبێت و تەکنیکەکانی شێواندن دێنە سەرەوە، ڕۆشنبیریی کوردی یەکێکە لەو ڕۆشنبیرییە دەگمانانەی دونیا کە توانای شێواندن تیایدا دەیان جار لە توانای تێگەیشتن گەورەترە، توانای ڕاکردن لە ڕووبەڕووبوونەوەی فیکری دەیان جار لە توانای ڕاوەستان و قسەکردنی فیکریی گەورەتر .

واتە لەسەرەتاوە بۆ ئەوەی بتوانین تێبگەین، دەبێت ترسی سایکۆلۆژی سیستمێک لە کۆنبوون و لە کارکەوتنی چەمکەکانی لە دیالۆگی فیکری جیابکەینەوە.

*پرسیار: ئەگەر لەم سیستمەدا توانای نزیکبوونەوە لە تێکستەکان «وەک تۆ دەڵێیت» هێند لاواز بن، ئەی لۆژیکی ناولێنان لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا چۆن ئیشدەکات؟ بۆ نمونە ئێمە بەچی دەڵێین بونیادگەر و چۆن؟*

بەختیار عەلی: سەرەتا حەزدەکەم ئەوە ڕوونبکەمەوە، ئەو تێکستانەی بەگشتی خراونەتە ژێر ئەو ناوەوە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە؟.... ئایا بەڕاستی خوێنراونەتەوە؟ ... ئایا بە ڕستی خودی تێکستەکان خوێنراونەتەوە و دادگاییکراون، یاخود لە بری ئەوان قسە لە بونیادگەرییەکی گشتی کراوە؟ ئەگەر سەرەنجبدەیت ئەمڕۆ شێوازی ڕەتکردنەوەی هەموو ئەوانەی کە بە بونیادگەر دانراون، لەوەوە دەستپێناکات وتارەکان وەربگیرێت، قسە لەسەر جەوهەر، چەمک، بابەت، شێوازی خوێندنەوە، سیستمی زاراوەیی و میکانیزمی بەرهەمهێنانی فیکر بکرێت تیایاندا، بەڵکو قسە لەسەر بونیادگەریی دەکرێت، بونیادگەرییەکی گشتی، بونیادگەرییەکی غەیبی کە لەدەرەوەی تێکستەوەیە..لەدیدی ئەم تێڕوانینەوە وتارەکەی تۆ دەبێتە وتارێکی خراپ لەبەر ئەوەی وتارێکی بونیادگەرە، وتارەکەی منیش دەبێتە وتارێکی جوان و کوردانە لەبەرئەوەی بونیادگەر نییە... واتە خودی بونیادگەریی دەبێتە توهمەت... واتە ئەوەی قسەی لەسەر دەکرێت نوسینەکەی من نییە، ئەوە نییە کە من لە کوێوە دەستم پێکردووەو لە کویادا دواییم پێهێناوە.. چۆن ئیشم بە زاراوەکان کردووە... لە کویای کێشەکاندا وەستاوم... بەڵکو ئەوەی قسەی لەسەر دەکرێت بونیادگەرییە... بونیادگەرییش بەپێی حوکمی دادگا عورفییەکانی ڕۆشنبیریی کوردی تاوانە، زەرفێکە لە حەشیش و

پۆلیسە بلیمەتەکانی ڕۆشنبیریی کوردی لە گیرفانتدا گرتوویانە. لەبەرئەوە ئەوەی جارێک ناوی بونیادگەریی لێدرا، ئیتر ئەمە ڕاست بێت یان درۆ... «چونکە لە ڕاستیدا لە بنەڕەتدا کەس خۆی بەوەوە ماندووناکات ئایا ئەمە ڕاستە یان درۆ، کێشەی سەلماندن کێشەی ناو ڕۆشنبیریی کوردی نییە» ئەوا مەحکومە بە لیستێکی درێژ لە تاوان کە تاوانبارەکانی تری پێش خۆی کردویانە، بونیادگەرەکانی تر، بکەرە غەیبییەکانی ناو فەنتازیای ڕۆشنبیرە تەقلیدییەکان، تێکستە غەیبی و بێناو و نادیارەکان.

ئایا ئەوە چ گاڵتەجارییەکە کاتێک من لە کۆی ژیانی ڕۆشنبیریمدا، بەدرێژایی پتر لە سی وتاری درێژ لەسەر بابەتی جیاواز، تاکە جارێکیش نەمگوتووە بونیادگەرم، ئێستا دەبێت بێم قسە لەوەبکەم ئایا من بونیادگەرم یان نا؟ ئایا ئەمە وەزیفەی منە قسەی لەسەربکەم؟... یا وەزیفەی ئەوانەیە کە ئالای ئەم تێزەیە بەرزدەکەنەوە؟... من نەمگووتوە کە بونیادگەرم، ئەی ئەوەی دێت و بە من دەڵێت تۆ بونیادگەری، لە رووی ئەخلاقییەوە یەکەم مەرجێک بۆ ئەوەی بتوانین گوێی لێبگرین، ئەوە نییە پەیوەندی مەنهەجی لە نێوان من و بونیادگەرییدا بدۆزێتەوە و بیسەلمێنێت کە من بونیادگەرم؟ ئایا ڕەوایە ئەم پرسیارە لە من بکەیت؟ ئایا ڕەوا نییە ئەم پرسیارە بەریتە لای ئەوانەی بە من دەڵێن بونیادگەرم و لێیان بپرسیت: ئەم نوسەرە چۆن بونیادگەرە؟ بونیادگەری چییە و بە پێی پێناسەکەی جەنابتان چۆن دەقەکانی دەبن بە بونیادگەر؟ بەهەر حاڵ بەر لەوەی بێمە سەر مانای مەنهەج و چۆنێتی سەیرکردنی من بۆ پرۆسەی بەرهەمهێنانی فیکری ...

با هەندێ لەو توهمەتانەت بخەمە بەرچاو کە دەدرێتە پاڵ ئەو دیاردەیەی کە بە بونیادگەریی کوردیی ناودەبرێت...

1ـ توهمەتی یەکەم ئەوەیە کە «بونیادگەری لە خۆرئاوا مردوە»

دیارە من تا ئێستا تێکستێکی ئەم کەسانەم نەخوێندۆتەوە تێبگەم مەبەستییان لە مردن چییە؟ بە مانایەکی دی هەندێ لەوانە چۆن قسە لە

مردنی دراوسێیەکیان دەکەن بە هەمانشێوەش لە ئاستی کولتوور و مەعریفەدا قسە لە مردن دەکەن... بە گشتیش ئەم عەقڵییەتە لێرەشدا وەک هەموو جێگاکانی تر، توانای خۆ ڕونکردنەوەی نییە، واتا ناتوانێت خۆی تەفسیربکات. لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا ڕەنگە زیاد لە کەسێک و لە زیاد لە شوێنێکدا گووتبێتیان بونیادگەریی مردوە، تەفکیکییەت مردوە، مۆدێرنە مردوە، پۆستمۆدێرنە مردوە و تادوایی لەم قسانە، بێئەوەی یەکێکیان یەکجار بوەستن و پێمانبڵێن مەبەستیان لە مردن لە دونیای مەعریفەدا چییە؟

دیارە مردن لە دونیای مەعریفەدا تەواو جیاوازە لە دونیای سیاسەت. لە سیاسەتدا ژیان و مردنی بیروبۆچوون و ئایدۆلۆژیاکان بەوە دەپێورێن چەندە هێزیان لە ئاستی کۆمەلایەتیدا هەیە و چەندە مۆبیلیزەی خەڵک دەکەن. هەرکات دیدێکی ئایدۆلۆژی یان فەلسەفی توانای مۆبیلیزەکردنی خەڵکی نەما، توانای داگیرکردنی جێگایەکی گرنگی نەما لە سەر نەخشەی ململانێ سیاسییەکان لێرەدا قسە لە مردن دێتە پێشێ. بەڵام لە دونیای فیکردا بایەخی فەلسەفەیەک بە هێزی مۆبیلیزەکردنی ناپێورێت، «بەمەرجێک پێشوەخت خودی ئەو فەلسەفەیە وەک مارکسیزم کۆی پرۆژەی فیکری و کۆمەلایەتی خۆی بە ڕەهەندە سیاسییەکانییەوە نەبەستبێتەوە».

ژیانی فیکر بە ئامادەگی دەپێورێت لەناو کێشە و پرسیارە فیکرییەکانی ئەمڕۆدا .

ئەفلاتوون تائەمڕۆ زیندووە لەبەرئەوەی بەشێک لە ئەفلاتوون لەم سەردەمەدا دەژی، «کانت» ئەمڕۆ زیندووە لەبەرئەوەی لەوەلامی پرسیارە فەلسەفییەکانی ئەمڕۆدا پێویستیمان بە کانت هەیە. وەک دریدا دەڵێت هیچ شتێک نامرێت و ئەوەی دەگۆڕدرێت ناوکۆییەکانە «سیاقات». بەڵام بەدەر لەم ڕەهەندە فەلسەفییە. قسەکردن لە مردنی بونیادگەریی بە پێوانە ئەکادیمییەکان و پێوانەی بازاڕی کتێبیش درۆیەکی گەورەیە،

ساڵانە سەدان تێروحات لەسەر بارت و شتراوس و فۆکۆ دەنوسرێن، ڕۆژانە و هەفتانە وتار و کتێب لەسەر ئەوانە دێنەدەرێ. دیارە هەندێ لە نەخوێندەوارەکانی ناو واقیعی ڕۆشنبیریی ئێمە هەموو ئەوانە لەیاددەکەن و فەرامۆشیدەکەن، چونکە پێویستییان بەو فەرامۆشکردنە هەیە... ڕۆشنبیریی ئێمە هێشتا ئەرستۆ ناناسێت کەچی دڵی خۆی بە مردنی بونیادگەریی و پۆستمۆدێرنە خۆشدەکات. هێشتا سادەترین چەمکیان لە توێکاری دونیای کورددا بەکارنەهێناوە، دەیانەوێت دەیان میتۆدی گرنگ کە شوێنی گەورەیان لە مێژووی فیکر و خوێندنەوەی دونیادا هەیە، بخەنە تەنەکەی زبڵەوە. لە ڕاستیدا هیچ ڕۆشنبیرێک لە دونیادا کە بیەوێت ڕووبەڕووی میتۆدێک بێت و ڕەتیبکاتەوە ناتوانێت بڵێت ئەم میتۆدە مردوە و تەواو، چونکە بەو جۆرە هێندەی ڕووی نەخوێندەواری خۆی دەردەخات هیچی تر ئاشکراناکات، کاتێک دەتەوێت میتۆدێک ڕەتبکەیتەوە دەبێت قسەکردنت پڕبێت لە نیشانەی تێگەیشتن لەو میتۆدە و دواتر قسە لە هۆکان و بەهانە زانستییەکانی ئەو ڕەتکردنەوەیە. بەڵام ڕێکەوت نییە زۆربەی ئەوانەی قسە لە مردنی بونیادگەریی دەکەن، ئەوانەن بۆ جارێکیش لە ژیانیاندا هیچ میتۆدێکی دیکەیان نە بونیادگەر و نە غەیرە بونیادگەر لە شیکردنەوەی هیچ تێزەیەکدا بەکارنەهێناوە... کێشەی ڕاستەقینەی ئەوانە ئەوە نییە کە بونیادگەریی مردوە، چونکە زۆربەیان لە بنەڕەتدا بە زمانی بەر لەدایکبوونی ڕەخنەو فەلسەفە ئیشدەکەن، ئیدی ئەم غەمە کوتوپڕە چییە بۆ مردنی بونیادگەریی یان بۆ ڕۆشنبیریی کوردی کە پەیوەندی لەگەڵ مردوەکاندا دروست نەکات .

کێشەی ڕۆشنبیری کوردی ئەوە نییە بونیادگەریی مردوە، بەڵکو ئەوەیە کە ئەو دەستە بێبەرهەمانە کە هێشتا لە قۆناغی بەر لە دایکبوونی زانست و زانینەکاندا دەژین کۆنترۆڵیانکردووە، دوائەوە باوادابنێین کە فۆکۆ و بارت و دریداو دۆلۆز و بۆردیۆ و لیوتارد و شتراوس... هتد هەموو مردون. ئەی ئەم برادەرانە کە هێند نوێگەرن و بەتەنگ ئەوەوەن کە ڕۆشنبیریی کوردی بە تازەترین میتۆدی خۆرئاوایی ئیشبکات، بۆ هەتا

ناوی ئەو میتۆدانەش نازانن کە ئەمڕۆ لە خۆرئاوا هەیە. کە ناشیانەوێت میتۆدی خۆرئاوایی بەکاربهێنن کامەیە ئەو میتۆدە کوردییانەی ئەمانە کاری پێدەکەن؟... ئاشکرایە تا زیاتر شۆڕببینەوە پتر ئەو جەهلەمان بۆ ئاشکرادەبێت کە لەپشت ئەو جۆرە ڕستانەوە ڕاوەستاوە.

2. توهمەتی دووەم ئەوەیە کە بونیادگەریی کوردی لە بونیادگەریی عەرەبی یان فارسی وەرگیراوە .

پێش ئەوەی قسە لەوەبکەم ئایا ئەمە ڕاستە یان هەڵە؟ بەرلەوەی ئەو تێزەیە بخەمە بەر کۆمەڵێک پرسیار کە هەر ڕۆشنبیرێک حورمەتی تێز و بۆچوونی خۆی بگرێت دەبێت وەڵامیانبداتەوە... لەوە دەپرسم ئایا دەشێت ئەمە توهمەت بێت؟ یان لە چ حاڵەتێکدا ئەمە دەبێتە توهمەت؟

باوا فەرزبکەین شتێک هەیە ناوی بونیادگەریی کوردییە کە گومانم لە بوونی جۆرە شتێکی واهەیە... با بشپرسین ئایا ڕەوایە ئەم بونیادگەرییە لە عەرەب یان فارسەوە وەربگیرێت، ئایا وەرگرتنی بونیادگەریی لە عەرەب و فارس هێندە کوشندە و کافرمەزەبانەیە وەک سوکایەتی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت؟ بۆ نزیکی حەفتا ساڵە مارکسییەکانی کورد مۆدێلی حیزبی مارکسی بە دروشم، ستراتیژ، تەکتیک، زمان و دیالێکتی ناوچەییشەوە لە مارکسیستە عەرەب و فارسەکان کۆپیدەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کۆپیکردنە نەبووە مایەی ئەوەی مارکسیزم لەبەرئەوەی کۆپییەکی شێواوی مارکسیزمی عەرەبی و فارسییە ڕەتبکرێتەوە... سەیر لەوەدایە هەندێ لە مارکسییەکانن کە ئەم توهمەتە دەدەنە پاڵ من و تۆو چەندانی تر، بەجۆرێک قسەدەکەن، یەکێک لەدەرەوەی ڕۆشنبیریی کوردی تەماشابکات واتێدەگات وەکو ئەوەی ئەم بەڕێزانە ڕاستەوخۆ مارکسیزمییان بە «نقل المباشر» لە مارکسەوە بۆ هاتبێت و بە کەناڵی عەرەب و فارس و تورکدا تێنەپەڕیبێت.

لە مارکسی یاخود مارکسیاوییەکان بگوزەرێیت، هەندێ لەوانەی باس لە ئیسلام و تەسەوف دەکەن، توهمەتی ئەوە دەدەنە پاڵ بونیادگەریی کە

لە عەرەبەوە وەرگیراوە!!!. بیهێنە پێشچاوی خۆت، یەکێک باس لە تەسەوف بکات، خۆی بە سۆفیزم و عیرفانەوە سەرقاڵبکات، ئەو تاوانەش کە دەیداتە پاڵ تۆ ئەوەبێت لە عەرەب و فارس شتت وەرگرتووە!!! وەکو ئەوەی بە درێژایی مێژوو لە بابەتایەرەوە تا ئەمڕۆ سۆفیزم دیاردەیەکی ڕۆشنبیریی و کولتووریی نەبێت کە لە فارس و عەرەبەوە وەرگیراوە و ئەم بەڕێزانە ڕاستەوخۆ لە خوداوە ئیلهامیان بۆ هاتبێت... بیهێنە پێش چاوی خۆت یەکێک لە بچوکترین یەکەی ئیمانییەوە تا گەورەترین سەرچاوەی بۆ تەفسیری دونیاو مانابەخشین بە ژیان، هەڵقوڵاوی کولتووری عەرەبی و فارسی بێت، دوایی بێت ڕەخنەکەی لە تۆ ئەوەبێت کە عەرەب و فارس سەرچاوەی ڕۆشنبیریی تۆن... وەکو ئەوەی جەلالەدینی ڕۆمی، شەمسی تەبریزی، ئیبن عەرەبی خەڵکی شارەزوور یان دەشتی هەولێربووبن «بۆ ئەوەی بزانیت باسی چی دەکەم بچۆرەوە سەر ئەو چاوپێکەوتنەی ڕامان لەگەڵ فەرهاد شاکەلی کردویێتی... دیارە کەمێکی تر زیاتر دێمەوە سەری».

لە ڕاستیدا دەکرێت ئەم لیستەیە درێژبکەینەوە، بەڵام باواز لەوەبێنین... بابێینە سەر ئەوەی ئایا بونیادگەریی عەرەبی یان فارسی چییە؟ ئایا بونیادگەریی لە عەرەب وەریبگریت یان لەفارس وەریبگیرێت مانای چی؟

مەرجی یەکەم بۆ ئەوەی ئەمجۆرە ڕەخنانە مانایەکییان هەبێت ئەوەیە خاوەنەکەی بیسەلمێنێت «بونیادگەریی» دەکرێت بەپێی شوناسە ناسیونالییەکەی پۆلێنبکرێت؟ واتە بیسەلمێنی بونیادگەرییەکی فەرەنسی، بونیادگەرییەکی ئەنگلۆسەکسۆنی، بونیادگەرییەکی فارسی، بونیادگەرییەکی عەرەبی، بونیادگەرییەکی یابانی و هیندی و تادوایی هەیە. واتە بە کورتی بیسەلمێنێت ئێمە لەبەردەم یەک بونیادگەریدا نین بەڵکو لەبەردەم کۆمەڵی ڕوخساری بونیادگەرییداین کە هەریەکەیان، کۆمەڵێک جیاوازی لە بونیادگەرییەکانی تر هەیە، بە کۆمەڵی چەمک و زاراوەو دەستەواژە و تەکنیکی میتۆدی لەوانی تر جیادەکرێتەوە ... بەبێ ئەم سەلماندنە هەموو ئەو قسانە دەبنە قسەی بێناوەڕۆک، بەڵام هەموو

ئەو برایانەی ئەم جۆرە بۆچوونانە دەهێننە پێشێ دوو دێڕ ئیجتیهادیشیان لە مرۆوە نییە، لێرەوە بوون و نەبوونی ئەم قسانە لە ڕووی زانستییەوە وەکو یەکە. بونیادگەریی میتۆدێکی زانستییە و ناسیونالییەتی نییە .

3- ڕەخنەی سێهەم بە پێچەوانەی ڕەخنەی یەکەمەوەو دژ بە هەموو ناوەڕۆکی ڕەخنەی یەکەم دەڵێت بونیادگەری کوردی لە بونیادگەرییەکانی دی ناچێت.

ئەم ڕەخنەیە لەوی پێشوو زۆر بێماناترە، لەبەرئەوەی ئەو کەسەی ئەم ڕەخنەیە دەگرێت دڵنیایە لەبەردەم شتێکی تردایە جیاواز لە بونیادگەریی، بەڵام سوورە لەسەر ئەوەی خۆی بەهەڵەدا ببات و شوناسێک بداتە پرۆسەیەکی فیکری کە دڵنیایە شوناسی وا هەڵناگرێت. واتە ئەم دۆستانەمان دڵنیان ئەوەی دەیبینن و دەیخوێننەوە بونیادگەریی نییە، کەچی سوورن لەسەر ناونانی بە بونیادگەریی. ئەمە وەکو ئەوەیە بە چۆلەکە بڵێیت کەروێشک، دواتر بڵێیت بە خوا عەجیبە دەشفرێت. هەر بگەڕێوە سەر چاوپێکەوتنەکەی شاکەلی دەبینی سەری لەوە سوڕماوە کە ئەو ڕەخنە ئەدەبییانەی ڕەهەند بڵاویکردوونەوەتەوە لەو بونیادگەرییە ناچێت کە لای فەرەنسییەکان خوێندویێتییەوە. ئەوەی مایەی پێکەنینە ڕەهەند لە هەموو ژمارەکانیدا تەنیا جارێکیش لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی بونیادگەرانەی بڵاونەکردۆتەوە، تەنیا دوو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی بڵاوکردۆتەوە و هەردووکیان میتۆدی شیکردنەوەی دەروونی زاڵبووە بەسەریاندا، ئەمە ئەوە دەسەلمێنێ ئەو برادەرە نەوەکو ڕەهەند بەڵکو فەهرەستەکەشی نەخوێندۆتەوە، کەچی بێباک لە بچوکترین ڕۆحی ئەمانەتی زانستی قسە لە لێکۆڵینەوە ئەدەبییە بونیادگەراکانی ناو ڕەهەند دەکات. ئەوەی جارێکی تر شوێنی سەرەنجە ئەوەیە شاکەلی دوایی ئەوەی ئەو لێکۆڵینەوە ئەدەبییە خەیاڵیانەی ناو ڕەهەندی خوێندۆتەوە، بۆی دەرکەوتووە کە لە ڕەخنەی ئەدەبی بونیادگەریی فەرەنسی ناچێت، لێرەوە بەڕێزیان لەبری ئەوەی بیربکاتەوە و بگاتە ئەو دەرەنجامەی ئەمانە شتێکی ترن، ڕەخنەکەی پێچەوانە دەکاتەوە و دەڵێت لە بونیادگەری

فەرەنسی ناچن !!؟

4. ڕەخنەیەکی دی دەڵێت «بونیادگەریی میتۆدێکی نامۆیە».

ئەمجۆرە ڕەخنەگرانە پێیانوایە میتۆدی بونیادگەریی وە تەواوی ئەو میتۆدانەی تریش کە خۆرئاوا بەرهەمیاندەهێنێت بۆ ئێمە نامۆن، چونکە دواجار بەرهەمی کۆمەڵگایەکی پیشەسازی و تەکنیکی گەشەسەندون .

یەکەم بەدیدی من هیچ میتۆدێکی نامۆ و نانامۆ بوونی نییە. بەڵام ئەمەیان بابەتێکی دییە هەڵیدەگرم بۆ جێگایەکی دی و دێمەوە سەر ئەوەی هەندێ ڕاستی سەرەتایی بیر ئەو برادەرە ئازیزانە بخەمەوە.

یەکەم ـ بونیادگەریی میتۆدێکە لە شیکردنەوەی کۆمەڵگا زۆر سەرەتاییەکانەوە دەستپێدەکات. واتە وەک زانست مانا و هێزی خۆی لە تەفسیری کولتوورە سەرەتایی و سروشتییەکانەوە وەردەگرێت. لێرەوە بونیادگەریی لەسەرەتادا میتۆدی شیکردنەوەی کۆمەڵگا پیشەسازییە گەشەسەندووەکان نییە، بەڵکو میتۆدی شیکردنەوەی کۆمەڵگا سەرەتاییەکانە. هەر لێرەوە یەکەم و گرنگترین زانست کە ئاشنایی لەگەڵ بونیادگەرییدا پەیدادەکات «ئەنسرۆپۆلۆژیایە».

دووەم ـ بونیادگەریی هێندەی میتۆدێکی ئەبستمۆلۆژییە، واتە کار لەسەر سەرهەڵدان و ستراکتور و گەشەی مەعریفی دەکات، میتۆدێک نییە تایبەت بە ژینگەیەکی مێژوویی دیاریکراو. بواری کارکردنی لەناو خسوسییەتەکانی مرۆڤ و زەمینە گشتیی و هاوبەشەکانی زانست و کولتووردایە، نەوەک لە خاسییەتە زۆر تایبەتییەکانی ناو کۆمەڵگاکاندا، لێرەوە قسەکردن لەسەر ئەوەی بونیادگەریی بۆ ئەمریکای لاتینی دەستدەدات و بۆ هیند دەستنادات، بۆ فەرەنسا دەستدەدات و بۆ ڕوسیا دەستنادات، بۆ عەرەب دەستدەدات و بۆ کورد نامۆیە. هەڵەیەکە پابەندی نەناسینی بونیادگەرییە. دیارە ئەمە بەو مانایە نییە کە بونیادگەریی وەک میتۆدێکی تایبەت بۆ خوێندنەوەی خسوسییەتە سۆسۆلۆژییەکان

دەستنادات، بەڵکو بەو مانایەیە کە بونیادگەری خۆی هەڵگری جۆرە خسوسییەتێکی ژێنگەیی نییە کە بیکاتە میتۆد بۆ ژێنگەیەکی دیاریکراو. هەندێک پێیانوایە ئەو میتۆدەی لە کایەیەکی کۆمەڵایەتیدا کاری پێدەکرێت ناگوازرێتەوە بۆ کایەکانی تر... بەڵام هەمان ئەو میتۆدەی کە فۆکۆ بۆ خوێندنەوەی خۆرئاوا بەکاریدەهێنێت، ئەدوراد سەعید بۆ خوێندنەوەی پەیوەندی خۆرهەڵات و خۆرئاوا بەکاریدەهێنێت، میتۆد بە پاراستنی کۆمەڵێک مەرج لە هەلومەرجی بەگەڕخستنیدا لە نێوان کایە و زانستەکاندا دەتوانێت هاتوچۆبکات. میتۆد هەمیشە کەرەستەی تەفسیرە، کەرەستەی ئیشکردنە، نەوەک خودی تەفسیر بێت. وەک چۆن دەتوانین بە یەکجۆر کەرەستەی بیناکردن خانووی جۆراوجۆر دروستبکەین، دەتوانین بە یەک میتۆدیش خوێندنەوەی جۆراوجۆر ئەنجامبدەین .

میتۆد واتە ڕۆحی زانستەکان، گەڕان لە دوای جنسییە و ڕەگوڕەچەڵەکی میتۆد واتە گەڕان لە دوای جنسییە و ڕەگوڕەچەڵکی زانستەکان. هەموو میتۆدەکان دواجار لەدەرەوەی ئێمە دروستبوون، ئیدی ناونانی تاکە میتۆدێک لەناویاندا بە نامۆ، رووی فۆبیایەکی زانستی و سیاسی و کۆمەڵایەتی لەم میتۆدە بەرجەستەدەکات و هیچی تر... ترس لە میتۆدی نامۆ، مانای ترس لە هەموو زانست، مانای داخستنی دەرگای ئەکادیمیا و زانکۆکان. ئەگەر ئەو بەڕێزانە ترسیان لە میتۆدەکانی خۆرئاوا هەیە، چاکترە دەرگای زانکۆ و ئەکادیمیاکان داخەن و بڕۆنەماڵەوە، چونکە ئەگەر حەرفێک لە زانست بەرهەمهاتبێت و بەرهەمبێت بەو میتۆدە نامۆیانە بەرهەمهاتووە و بەرهەمدێت .

دیارە گەر پیاوێکی دینی فەندەمەنتال ئەم قسانە بکات ئاساییە، بەڵام سەیر لەوەدایە بە ناو مارکسییەک یان بەناو سۆسیال ـ دیموکراتێک ئەم قسانەبکات، سەیر لەوەدایە مامۆستایەکی زانکۆ، کە کۆی کتێب و کەرەستەی زانستی ناو زانکۆکەی بەرهەمی زانستە خۆرئاوایەکانن ئەو قسەیەبکات، مامۆستایەکی زانکۆ کە دکتۆرای هێناوە و بە میتۆدە زانستییەکانی خۆرئاوا کاریکردووە و تاسەر ئێسقان قەرزاربارى ئەو

میتۆدانەیە. ئەمە شایەنی تێڕامان و تێفکرینە، ئەمە شایەنی ئەوەیە کە لەو فۆبیایە وردبینەوە کە لە پشت ئەم جۆرە بیرکردنەوەوەیە. ئەوەی ئەمجۆرە بەڕێزانە سڵی لێدەکەنەوە خودی میتۆدەکان نییە، بەڵکو ئەو مەعریفە جیاوازەیە کە کارکردن بەم میتۆدانە بەرهەمیدەهێنێت. ئەوەی ئەوان لێیدەترسن خودی میتۆدەکان نییە، بەڵکو ئەو ڕۆشنبیر و نوسەرانەن کە دەتوانن بەکاریانبهێنن.

*پرسیار: ئەگەر دەرفەتم بدەیت لێرەدا پرسیارێکی دیکە بکەم... ئایا لێرەدا پێویست نییە شتێکی زیاتر و قسەیەکی زۆرتر لە مەسەلەی میتۆد بکەین ؟ ئایا ئەمڕۆ کە قسە لە میتۆد دەکەین مەبەستمان لە چییە؟ یان تۆ کاتێک قسە لە میتۆد دەکەیت مەبەستت چییە؟*

بەختیار عەلی: سەرەتا دەبێت دوو جۆر لە میتۆدی مەعریفی جیابکەینەوە، یان وەک لیوتارد دەڵێت دووجۆر لە حیکایەت جیابکەینەوە، حکایەتە گەورەکان و حکایەتە بچوکەکان، یان میتۆدە مەعریفییە گەورەکان و میتۆدە مەعریفییە بچوکەکان... میتۆدی مەعریفی گەورە مەبەستم هەموو ئەو میتۆدە تۆتالیتار و سەرتاپاگیرانەیە کە لە ڕوانگەی دیدێکی تایبەتییەوە دەیانەوێت هەموو دونیا تەفسیربکەن، واتە بنەمایەکی تیوری دیاریکراویان هەیە، ژێرخانێکی تەفسیری یەکگرتوویان هەیە، سیستمێکی دیاریکراوی زاراوەیان هەیە، دەرەنجامی دیاریکراویان هەیەو هەمیشە دونیا لە چوارچێوەی ئەو زاراوانەدا و لە چوارچێوەی مەنتیقی ئەو پەیکەرە ئایدۆلۆژییەدا دەخوێننەوە. بۆ نمونە دین، هیگلییەت، مارکسیزم، هەندێ لە فەلسەفە ڕاسیستییەکانی وەک ئەنترۆسوفیزم، فرۆیدیزم، هەندێ گوتاری بونیادگەرانەش، وەک هەوڵەکانی شتراوس بۆ دۆزینەوەی بونیادە یۆنیفرسال و سەرتاسەرییەکانی کولتوور لەژێر کاریگەری مارسیل مۆس و ئەو یاسا

گشتییانەی زماندا کە دۆسۆسێر دەریخستبوو ... لەو جۆرە فەلسەفانەن کە لە ڕێگای شاندادەنە سەر کۆمەڵێک بنەمای سەرەکییەوە دەیانەوێت بخزێنە کۆی هەموو کایەکانەوە، بخزێنە ژینگە کۆمەڵایەتییە جیاواز جیاوازەکان، بخزێنە زەمەنە جیاواز جیاوازەکان. بۆ ئەوەی قسەکانم ڕوونتر بێت با کۆمەڵی نمونەت بۆ بهێنمەوە.

مارکسیزم، سیستمێکی فەلسەفییە کە هەوڵدەدات دونیا لە دروستبوونی مرۆڤەوە واتە لە پرۆسەی گۆڕینی مەیمونەوە بۆ ئینسان تا هەموو مێژووی نوێ لەسەر ڕۆشنایی کۆمەڵێک تەفسیری دیاریکراو تەفسیربکات، کە پەیوەندی بەهەلومەرجی بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکانییەوە هەیە... ئەمجۆرە تەفسیرە لەسەر کۆمەڵێک بنەمای نەگۆڕی فەلسەفی، زانستی و سیاسی دروستبووە... لێرەدا مارکسیزم کە ڕووبەڕووی هەر کێشەیەکی کۆمەلایەتی دەبێتەوە، یەک شێوە تەفسیری پێیە، لەبەرامبەر کۆمەڵگا جیاواز جیاوازەکان و قۆناغە جیاوازەکانی مێژوودا هەمیشە یەک تیوری هەیە کە تیوری ململانێی چینایەتییە، ململانێی چینایەتی بزوێنەری مێژووە، ئیتر هەموو هەمەڕەنگی مێژوو، هەموو ململانێ جیاوازەکان، هەموو ئەو وەقائیعانەی کە لەگەڵ ئەم تیورییە موتڵەقەدا ناگونجێن لە مێژوودا دەبێت بخرێتە ناو ئەو تیوەرەیەوە و لەویادا جێگایان بکرێتەوە، ئیتر تۆ وەک مارکسی ناچاریت خوێندنەوەی مێژوو بە شێوەیەک ڕێکبخەیت ئەو تیورییە بسەلمێنێت و نەهێڵێت بە درۆبکەویتەوە. بۆئەوەی ئەمەش ئەنجامبدەیت ناچاریت، ڕوخانی کۆمۆنە پاریس، ڕوخانی ئیمارەتی بابان و میرنشینی ئەردەلان بەیەک سیستمی یاسا تەفسیربکەیت، ئەو یاسایەی کە دەڵێت «ململانێی چینایەتی بزوێنەری مێژووە». ناچاریت بە یاسای ململانێی کار و سەرمایە هەموو دونیا بخوێنێتەوە لێرەوە ئەگەر لە جێگایەکدا پرۆلیتاریا نەبوو، دەبێت خۆت پرۆلیتاریایەکی غەیبی دروستبکەیت بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە ململانێی کار و سەرمایە سەرتاسەرییە. دیارە ئەم موتڵەقگەراییە لە سنووری خوێندنەوەی مێژووی سیاسییدا ناوەستێت، بەڵکو بە هەمان یاسا تەفسیری مێژووی ئەدەب،

فەلسەفە و زانستیش دەکات، لەم ڕوانگەیەوە ئەدەب و فیکر مێژوویەکی ناوەکییان نییە پڕبێت لە ئەگەری ئازاد بۆ گەشە، بەڵکو پابەندی ململانێی چینایەتیین، ئیدی یەک یاسای جەوهەری هەموو خوێندنەوەکان جڵەودەکات، ئەویش یاسای تەفسیری چینایەتییە بۆ ئەدەب. پشت ئەستوور بەم لۆژیکەدا تێکستەکانی هۆمیرۆس، آمروء القیس، نالی، شێخ ڕەزا، شکسپیر بەهەمان یاسا دەخوێنرێنەوە کە گۆرکی و نازم حیکمەتی پێدەخوێنرێتەوە... بە کورتی هەموو شتێک لێرەدا کە لە نێوان سەرخانی کۆمەڵ و ژێرخانیدا بجوڵێتەوە پابەندی ململانێ چینایەتییەکانە و ڕەگوڕیشەی لەویادایە.

هەموو مەنهەجییەتە سەرتاپاگیرەکان ئەوجۆرە کێشانەیان هەیە، دیارە لێرەشدا میتۆد تا میتۆد دەگۆڕێت، ئەو جۆرە میتۆدانەی دواجار ستراتیژی سیاسییان لەپشتە و ئەمشێوەیە لەتەفسیری سەرتاسەری وەک سیاسەتی دەوڵەت و ڕژێم دەسەپێنن بە جۆرێکی ترسناک گەشەدەکەن و تێزەکانیان هەموو قووڵاییەکی مەعریفی دەدۆڕێنێت و لەوە دەکەوێت تێزی زانستی بێت، دەبێتە ڕێبازێکی ئیرشادی کە شێوە، قاڵب، بابەت و ماناکانی ئەدەب بۆ نوسەران دیاریدەکەن و سنوورێک بۆ پرۆسەی داهێنانی ئەدەبی و فیکری دادەنێن کە دەکەوێتە پێش پرۆسەی نوسین خۆیەوە. مارکسیزم و سیاسەتی ئەدەبی دەوڵەتە کۆمۆنیست و حیزبە کۆمۆنیستەکان تاکە نمونەی ئەمجۆرە لە تۆتالیتاریەت نیین. ئیستا لەسەر هەمان ڕەوتی تەفسیری مارکسییانە قسەگەلێک دەربارەی ئەدەبی ئیسلامی، چیرۆکی ئیسلامی، ئابووری ئیسلامی، مێژووی ئیسلامی دەبیستین... دیارە تا ویستی سیاسی گەورەتربێت، تا فەلسەفە پتر خۆی وەک هێزێکی سەرتاسەر و بێهاوتا نیشانبدات، ئەو هەڵەیەش پتر سنووری هەڵەی مەعریفی دەبەزێنێت و دەبێتە پرۆگرامێکی سیاسی جەبرییانە کە تیرۆر و پاکسازیی فیکری دەبێتە تاکە ستراتیژی... بۆ نمونە لە فرۆیدییەت یان هیگلیزمیشدا هەمان مەیلی تۆتالیتارییانە هەیە بۆ خزانە هەموو جێگاکان، بۆ تەفسیرکردنی هەموو شتەکان، بۆ ترنجاندنی کۆی

دونیا و کۆی مێژوو بۆ ناو یەک سیستمی تەفسیرکردن. ئەوە لە هیگلیزمدا تەواو ئاشکرایە، بەڵام لە فرۆیدییەت و ڕێباز و بەریانە هاوتەکەکانیشیدا هەمان مەیل بەرچاودەکەوێت، مەیلی ڕاکێشانی تەفسیری دەرونشیکار بۆ هەموو جێگایەک، بۆ ناو مێژوو، بۆ ناو زانست، بۆ ناو زمان، بۆ ناو ئاین، بۆ ناو خوێندنەوەی ئەدەبی، بەڵام بەحوکمی ئەوەی فرۆیدیزم و هیگڵیزم ڕاستەوخۆ نەبوونەتە فەلسەفەی سیاسی، ڕاستەوخۆ لە شێوەی پرۆژەی ئایدۆلۆژی و لەبەرگی حیزبیدا قاڵبرێژ نەکراونەتەوە و کێشەکانیان وەک کێشەی زانستی کەوتوونەتەوە، دیالۆگیش لەگەڵ گرفتەکانیاندا دیالۆگێکی مەعریفی بووە، کێشەکانیان تایبەت بووە بە بازنەی کەسانی زاناو دەرونناس و نەبۆتە کێشەی پەیوەندی سیاسییانەی نێوان ئەدیبێک و سیاسەتمەدارێک. لەکاتێکدا مارکسیزم دادەبەزێتە ئاستی سانسۆری سیاسییانەی ئەدەبەوە. کێشەکانی بزاوتێکی وەک فرۆیدیزم تایبەت بووە بە کایەی دەرونشیکار و پرسیارە ناوخۆییەکانی، واتە لە جەوهەریدا قەیرانێکی زانستی بووە، ئەمە جگە لەوەی کە فرۆیدیزم جیاوازیی گەورەی لەگەڵ مارکسیزمدا هەیە، جیاوازیگەلێک پاراستوێتی لەوەی ببێتە ئایدۆلۆژیا، بۆ نمونە هیچ وەخت فرۆیدیزم ڕێنماییکەر نەبووە، وەعزی سیاسی و مێژوویی پێنەبووە. هیچ وەخت فرۆیدیزم ئامۆژگاری کەسی نەکردووە بۆ نوسین بە جۆرێکی دیاریکراو، هیچ وەخت کلێشەیەکی ڕێنماییکەر نەبووە بۆ ئەدەبیات، هیچ وەخت نەبۆتە هێزێکی سانسۆرکار، بەڵکو سەرتاپاگیرییەکەی بریتییە لە ئارەزووی گەشەدان بەتەفسیری سایکۆلۆژیی و پەلکوتان بۆ ناو هەندێ کایە کە تەنیا بە میتۆدی دەرونشیکار ناخوێنرێنەوە... واتە بە گشتی لە ناو میتۆدە تۆتالیتار و سەرتاپاخوازەکانیشدا جیاوازی هەیە، بەڵام بەگشتی ڕۆحی سیستمی مەعریفییانەی تۆتالیتار، ئەوەیە کە تەفسیری دونیا بە یەک میتۆد و بەیەکجۆر سەرچاوە دەکاتە ئامانجی سەرەکی... بەهەرحاڵ هیچ میتۆدێکی زانستی لە سەرهەڵدان و دروستبوونی خۆیدا سەرتاپاگیر نییە، بەڵکو کاتێک چەمکەکانی دەچەسپێ، کاتێک توانای زاراوە و میتۆدییانەی خۆی تاقیدەکاتەوە، دوائەوەی خۆشی وەک

چوارچێوەیەکی گشتی سەقامگیردەکات، ئینجا بیر لە گەشە و کشان و پەرینەوە دەکات، مارکسیزم لەسەرەتادا تێکەڵەیەکی هەڵاوێردگەرایە «انتقائی» یە لە فەلسەفەی ئەڵمانی، کۆمەڵناسی فەرەنسی و ئابووری ئینگلیزی. بەڵام کاتێک چوارچێوە ئایدۆلۆژییەکانی خۆی سەقامگیردەکات، بە توندی دەکەوێتە شەڕ و دژایەتیکردنی میتۆدە ئینتقائییەکانی تر و بە هەڵاوێردگەرایی تاوانباریاندەکات و ئەوە لە یاددەکات کە خۆشی لە جەوهەردا هەڵاوێردگەرایە.

ئیسلام هەمان شێوە پەیوەندییەکی نەپساوی بە مێژووی دین و مەعریفەی پێش خۆیەوە هەیە، بەڵام کە سەقامگیردەبێت، ئیدی خۆی وەک کۆتایی هەموو ئاین و ڕێسایەک نیشاندەدات.

هیچ میتۆد و فەلسەفەیەک نییە وەک قاچک خۆی هەڵتۆقیبێت، هەموو میتۆدە گەورەکانی دونیا میتۆدی هەڵاوێردگەران، لە پەیوەندیدا بە کولتووری پێش خۆیانەوە دروستبوون، ئەستەمە لە ئەرستۆ بگەین بێ تێگەیشتن لە ئەفلاتون، ئەستەمە لە فارابی بگەین بێ تێگەیشتن لە ئەفلاتوون، ئەستەمە لە فۆکۆ بگەین گەر نەچینەوە سەر ڕەچەڵەکە دوورەکانی لەلای نیتشە و باشلار و هایدگەر، ئەستەمە بێ نیتشە و فۆکۆ لە دۆلۆز بگەین. هەر میتۆدێک کە لە دایکدەبێت بەرەنجامی کارلێکە لەگەڵ فیکری تردا.

لە میتۆدە تۆتالیتارەکان بگوزەرێت، هەموو ئەو هەوڵدانە ئازادانەیە کە لە سنووری کایەکدا، یاخود لە ناو کێشەیەکدا ئیشدەکەن... دیارە گەشەی بەردەوامی زانست، فراوانبوونی ژمارەی کایە زانستییەکان، وردبونەوەی بێئەندازەی کێشەکان و دروستبوونی پردی نهێنی و گرنگ لە ناو هەموو کێشە فیکرییەکاندا، هەموو ئایدۆلۆژیاو میتۆدە گەورەو تۆتالیتارەکانی ئیفلیجکردووە. ئەمڕۆ مومکین نییە بگەڕێینەوە بۆ فەلسەفەیەکی سەرتاسەری کە میتۆدی خوێندنەوەی بۆ هەموو زانستەکان پێبێت، هەموو کێشەکان تەفسیربکات، بۆ هەموو دیاردەیەک چارەسەری لە گیرفاندا

بێت... ئەمڕۆ لە قۆناغی هەرەسی ئەو جۆرە میتۆدانەداین، لەبەرئەوەی ئەو پرسیارانەی هەر کایەیەک لە کایە فیکرییەکان دەیکات بەتەنیا سیستمێکی زاراوەیی و بە تاقە میتۆدێکی خوێندنەوە وەڵامنادرێنەوە .

تازیاتر ڕوکارە ئاڵۆزەکانی ژیانمان بۆ ڕونببێتەوە، زیاتر تێدەگەین یەک مەنهەج نەک بەتەنیا ناتوانێت دونیا تەفسیربکات، بەڵکو ناتوانێت یەک دیاردەش تەفسیربکات، بۆ نمونە بۆ ئەوەی لە زاراوەی دەسەڵات بگەین چەند پێکەنیناوی دەردەچێت گەر بڵێین دەسەڵات بە تەنیا سیستمی باڵادەستی چینێکە بەسەر چینێکی تردا، یاخود سیستمی پاراستنی باڵادەستی چینێکە بەسەر کەرەستەکانی بەرهەمهێنانەوە، کاتێک دەبینین، دەسەڵات دیاردەیەکە لە هەموو شوێنێکدا هەیە، بێئەوەی خودی ئەو دابەشبوونە فەرعییانەی دەسەڵات پەیوەندییان بە دەسەڵاتی چینایەتییەوە هەبێت، بۆ نمونە، چۆن دەکرێت پرۆسەی لە دایکبوون و سەقامگیربوونی جۆرێک لە سیستمی دەسەڵات لە شێتخانەیەکدا کورتبکەینەوە بۆ دەسەڵاتی چینایەتی؟ چۆن سەقامگیربوونی جۆرە میتۆدێکی فیکری لە زانکۆییەکدا دەگێڕییتەوە بۆ دەسەڵاتی چینایەتی؟ چۆن شەڕی کۆنترۆڵکردنی زانستەکان، شەڕ لەسەر سامانی فیکری بە لۆژیکی ڕووتی چینایەتی تەفسیردەکەیت؟ چۆن ستراکتوری دەسەڵات لە ماڵدا، لە پێکهاتی دەرونیدا، لە ناو زێکتێکی دینیدا... تەنیا بە دەسەڵاتی چینایەتی تەفسیردەکەیت؟. دیارە تەفسیری ئایدۆلۆژی و دۆگمایی بەجۆرێک لە جۆرەکان هەوڵدەدات هەموو ئەو شێوە جیاوازانەی دەسەڵات بە زۆر بخزێنێتە ناو تەفسیرێکی ئابورییەوە و کورتیانبکاتەوە بۆ کێشەی سەرخان و ژێرخان .

بێگومان لەگەڵ گەشەی ژیاندا پێناسەکانی دەسەڵات و ماناکانی دەگۆڕێن، ناکرێت لە پێناوی سەپاندنی مەفهومێکی تایبەتی دەسەڵاتدا هەموو مێژووی تیوری فرێبدەینە ئاوەوە، لەگەڵ گۆڕینی کۆمەڵگادا فۆرمەکانی دەسەڵات، شێوەکانی پراکتیککردنی دەگۆڕێن، ناکرێت دەسەڵات بەیەک ڕەنگ و بەیەکچاو ببینین، لەبەر ئەوەی خودی ژیان و خودی دیاردەکان

تەنیا بەیەک ڕەنگ و بەیەکچاو نابینرێن، ئەمە جگە لەوەی کاتێک زانستێک توڕدەدەین فرسەتی لەدایکبوونی زانستێکی دیکە دەکوژین.

لە دەسەڵات بترازێت، نمونەیەکی دیکە دەهێنمەوە، باسی یۆتۆپیا دەکەم... ئایا دەکرێت یەک مانا بدەینە یۆتۆپیا؟ یەک ڕەنگ و یەک پێناسەی بدەینێ؟ بەیەک میتۆد دیاردەیەک بخوێنینەوە کە چەمک و لایەنی بێسنووری هەیە؟. ئەمڕۆ کێشەکان لەناو یەک کایەدا ناژین، لەناو یەک تەفسیردا گیرناخۆن... مەرجی یەکەمی بیرکردنەوەی زانستی، زانینی سنووری ئەوشتانەیە کە دەیڵێیت... لەو شوێنەوە کە پێتوایە تۆ بەیەک ڕێگادا دەتوانیت بگەیتە جەوهەری کێشەیەک، ئیدی لەوێوە دەرگاکانت لەخۆت داخست... ئەمڕۆ شتێک نییە ناوی میتۆدی تاک سەرچاوەبێت، زانستەکان و کایەکان و کێشەکانیان دەریایەک لە زاراوە و تەکنیکی میتۆدی و کەرەستەی ڕاڤەکردن و ئاسۆی شیکار دەکەنەوە، لە دونیایەکی وادا چەقبەستن و گیرخواردن لەناو جوغزی یەک شێوە ڕاڤەکردن و خوێندنەوەدا، یان بەرەنجامی تەسکبیرییەکی ئایدۆلۆژییە یاخود بەرەنجامی بێئاگایی مەعریفییە، لێرەوە مانای میتۆدو مەنهەجییەت خۆشی گۆڕانی گەورەی بەسەرداهاتووە، لە میتۆدە گەورەو تۆتالیتارەکاندا میتۆد پێشوەخت بۆت دیاریدەکات، تۆ بە چ ئاست و ئاڕاستەیەک دەبێت بجوڵێیت و کامە ڕەگەز دەبێت بدۆزیت و ماڵی کامە دەرەنجام دەبێت قایمبکەیت، بەڵام ئەمڕۆ هەر کێشەیەک وەردەگریت، مەنهەجییەت پێشوەخت ئاڕاستەیەکی ئایدۆلۆژی دیاریکراوت بەسەردا ناسەپێنێت... ئەمڕۆ کە دەڵێین میتۆد مەبەستمان لە کۆمەڵێک یاسا نییە کە دەبێت پراکتیکیبکەین، بەڵکو مەبەستمان لە سیستمێکی زاراوەیی دیاریکراوە کە لە ڕێگایەوە ئازادییەک لە بیرکردنەوەدا وەردەگرین، ستاتیکای و جوانی فیکر مۆدێرن و هاوچەرخ لەناو خودی ئەو گەشتە ئازادەدایە کە وادەکات بیرکردنەوە ڕاکردنێک نەبێت بەیەک ئاڕاستە، بەڵکو بیرکردنەوە پرۆسەیەکی جوڵان بێت بەزیاد لە ئاڕاستەیەک... بەمانایەکی تر لە ئێستادا ئەوە میتۆد نییە جڵەوی بیرکردنەوە دەگرێت و ئاڕاستەیدەکات،

بەڵکو بیرکردنەوەیە جڵەوی مەنهەج دەگرێت و ئاڕاستەیدەکات. کەسی بیریار ئەو کەسە نییە میتۆدێک پراکتیکدەکات، بەڵکو ئەو کەسەیە میتۆد لە خودی پرۆسەی بیرکردنەوە جیاناکاتەوە، ئەو کەسەیە میتۆدەکان بۆ مانای تر، شێوەی ترو وەزیفەی تر دەستەمۆدەکات، ئەو کەسەیە کە هەمیشە لە میتۆدە کۆنەکان میتۆدی تر دروستدەکات، حەقیقەتە ڕەهاکانیان لێدەستێنێتەوە، قودسییەتیان لێدەستێنێتەوە، تاکڕویی و تاکڕەوییان لێدەستێنێتەوە و تێکەڵ بە کەرەستەی تر و چەمکی فیکری تریان دەکات... مەنهەجییەتی ڕاستەقینە ئەو مەنهەجەیە کە هەمیشە ئامادەی موتوربەکردنی کەرەستەکانە. «موتوربەکردنی مەنهەجی» تەواو جیاوازە لە «کۆلاجکردنی ئایدۆلۆژی». کۆلاجی ئایدۆلۆژی بە ئەستەم هارمۆنییەت دروستدەکات... بۆ نمونە ئەو کۆلاجە ئایدۆلۆژییەی ناسونالیزمی کوردی لە دین و مارکسیزم و هەندێ دروشمی لیبرالییەت کردویەتی، هەرگیز نەبۆتە مایەی دۆزینەوەی شتێکی بایەخدار، بەڵکو دەرگای لەسەر نیفاقێکی سیاسی کردۆتەوە، هەمیشەش مایەی ونبوونی فیکر بووە نەوەک لەدایکبوونی. بەڵام موتوربەکردنی میتۆدەکان واتە دەوڵەمەندکردنیان بە زاراوەی یەکتر، دوڵەمەندکردنیان بە تەکنیکی یەکتر و بە حەقیقەتی یەکتری. بەگشتی دەتوانم بڵێم میتۆد قاڵبێک نییە بیری پێبکەینەوە، بەڵکو بیرکردنەوەیەکە نەرمی و سووکبزاڤییەک دەداتە هەموو قاڵبەکانی خۆی و پێشخۆشی... مەنهەج ئەوە نییە هەمیشە بە کۆمەڵێک یاسا هەمان حەقیقەت بەرهەمبهێنینەوە، بەڵکو ئەوەیە بە سیستمێکی تێکەڵاو لە تەکنیک و زاراوە کۆمەڵێک حەقیقەتی جیاواز و کۆمەڵێک شوێنی جیاواز کەشفبکەین. لێرەوە میتۆدێک نییە بۆ هەموو شوێن و زەمانێک بخوات، بۆ خوێندنەوەی هەموو دەقێک دەستبدات، بۆ هەموو بابەتێک باشبێت، میتۆدێکیش نییە بتوانین بە تەواوەتی دەریبکەین و بڵێین هەموو کەرەستە و مانا و ڕەهەندەکانی ئیفلاسیکردووەو مردووە... سەردەمی ئەو غرورە فەلسەفییە بەسەرچوو مەنهەجێک بتوانێت قسە لەوە بکات دەتوانێت دونیا تەفسیربکات و بۆ هەموو پرسیارێک وەڵامی هەبێت. ئێستا پتر لە کەرەستەیەکمان بۆ

دارشتنی هەموو پرسیارێک دەوێت، پتر لە کەرەستەیەکیشمان بۆ گەیشتن بە هەموو وەڵامێک دەوێت. لەواقیعێکی وادا هەموو میتۆدێک ئیشی خۆی لە سنوورێکی دیاریکراودا دیاریدەکات، هەموو میتۆدێک دەزانێت ئەوە ئەو نییە گرفتەکان هەڵدەبژێرێت بەڵکو کێشە و گرفتەکانن میتۆدی خۆیان هەڵدەبژێرن.

من هەمیشە واتێگەیشتووم ئیرادەی بیرکردنەوە، ئیرادەی دروستکردنی هارمۆنییەتە لە ناو تەفسیردا... بۆ نمونە یەکێ لەو ئەزمونانەی من لەگەڵ نوسیندا ئەوکات بوو کە لەسەر ئەنفال شتێکم نوسی، لەویادا دەبایە لە دونیای قوربانی و جەلادیش بڕوانم، لە جەوهەری ئەو سیستمەش کە دەسەڵات لە نێویدا سروشتی دڕندەیەکی ترسناکی وەرگرتبوو، لێرەوە تووشی کێشەیەک دەبووم کە دەمزانی ئارەزووی کوشتنی ناو جەلاد بەهەمان سیستم و زاراوە تەفسیرناکرێت کە ئارەزووی فەرامۆشکردنی قوربانی جڵەودەکات... لێرەوە لە ناو یەک دیاردەدا، دوو سیستەمت هەیە هەر یەکەیان بەسەر فەزای خۆیدا دەڕوانێت، دوو سیستم ڕەفتاری جیاوازیان لێکەوتۆتەوە... بۆیە کاتێک دەتەوێت قسە لە ڕیشەی کوشتن بکەیت، کەرەستەگەلێکت دەوێت جیاوازن لەو کەرەستانەی ڕیشەی یادچوونەوەی پێدەخوێنێتەوە... ئالێرەدایە هەستدەکەیت تاک مەنهەجی لێکچوون و وەکیەکییەکی درۆزن دەسەپێنێت، زۆر لە ڕوخساری قووڵی دیاردەکان وندەکات و بەزۆر لەناو یەکدا دەیانتوێنێتەوە، بەڵام بەودیویشدا کۆڵاجکردنی کەرەستە مەنهەجییەکان دەشێت بەرەو پچڕانمان ببات، بەرەو دروستبوونی ناهارمۆنییەت، بۆیە کێشەی هەرە گەورەی ئەو هەمەڕەنگییە فیکرییەی ئەمڕۆ، سەرهەڵدانی فیکرێکی ئازادە کە خاوەنی هارمۆنییەتی خۆی بێت.

لێرەشەوە جیاوازی نێوان ڕۆحی داهێنەر و ڕۆحی ئەکادیمی دەردەکەوێت... کەسی ئەکادیمی زۆربەی کات کەسێکە پراکتیک دەکات، مەنهەجەکانی پێشخۆی دەخاتەوە کار، بەڵام بابەتەکان و سنووریان دەگۆڕێت... بۆ نمونە کەسی ئەکادیمی کە مەنهەجێتیەکی دیاریکرا

وەردەگرێت ئیتر گۆڕینی زەحمەتە، بەڵکو جار دوای جار، هەمان میتۆد بە شێوازی جیاواز دووبارەدەکاتەوە. بۆ نمونە ئەکادیمییەکانی ئێمە ساڵەهای ساڵە بەیەک شێواز شیعری کلاسیکی دەخوێننەوە، بەیەک شێواز شیعر دابەشدەکەن و تەوەرەکانی پۆلێندەکەن، ئەوەی لەم میتۆدەدا دەگۆڕێت خودی میتۆدەکە نییە بەڵکو ئەو شاعیرانەیە کە بەسەریاندا پراکتیککراوە. میتۆد هەمن میتۆدە، بەڵام شاعیرەکە جارێک مەولەوییە، جارێک پیرەمێردە، جارێک حاجی قادرە. لەم دۆخەدایە کە بەبێ گۆڕینی مەنهەجییەت زانست زیندووناکرێتە، لێرەشدایە پێویستمان بە شکاندنی بەربەستەکانی پێشدەم هێنان و بەکارهێنانی کەرەستەکان هەیە. لێرەوەیە هەموو شوناسێکی مەعریفی نەگۆڕم پێ شتێکی خراپە، بونیادگەربوون، یان مارکسیبوون مانای ئەوەی تاسەر دڵسۆزی یەک میتۆد بیت، تاسەر بەیەک دیدەوە تەماشابکەیت، تاسەر لە ناو هەمان ئەو بابەتانەدا بسوڕێیتەوە کە باوکانی ئەو میتۆدە بۆیان دیاریکردویت، بەڵام من خولیای ئەوەم هەیە لەسەر ئەو بابەتانە بنوسم کە بابەتی منن، وەک کەسێکی کورد لە کێشەکانی منەوە هاتوون، بۆیە دڵنیام نە مارکس، نە بونیادگەرەکان، نە فرویدییەکان و نە نیتشەوییەکان بەتەنیا ناتوانن من دروستبکەن. ئیدی من تاسەر دڵسۆزی هیچ کەس نیم، کە سوود لە بونیادگەرێک وەردەگرم مانای ئەوە نییە بۆ هەموو شتەکان دەچمەوە سەر هەمان سەرچاوە و سەر هەمان کانگا. میتۆد ئەمڕۆ نزیکبوونەوە و لێکجودابوونەوەیەکی بەردەوامە، ئێمە کەرەستەکان قەرزدەکەین بەڵام دواجار ئەو سەرمایەیەی لەو قەرزکردنانە دروستدەبێت سامانی ئێمەن. هیچ کەس بە وەرگرتنی چەمکێک لە مارکس نابێتە مارکسی، بەڵام دەتوانین چەندەها چەمک لە مارکس قەرزبکەین بۆ بیناکردنی شتێکی تر کە مارکسیزم نییە. مارکس هەموو ڕۆحی هیگلییەت وەردەگرێت بۆ دروستکردنی شتێک کە هیگلییەت نییە، شتراوس سۆسێر وەردەگرێت بۆ بیناکردنی شتێک کە تەواو لەدەرەوەی زانستی زمانە، فیکر هەمیشە دیالۆگێکی درێژە لەگەڵ فیکرەکانی تردا، زانست تێکەڵاوبوونێکی گەورەی کۆی دۆزینەوەکانە بەیەکتر... وەرگرتن لە بونیادگەری مانای بوونە

بونیادگەر ناگەیێنێت. دریداو لێکترازانسازەکان کە دەشێت ڕادیکالترین میتۆدی ئەمڕۆبن، ئەوان لەژێر کاریگەرییەکی گەورەی کانت، ڕۆمانسییە ئەڵمانەکان، هیگڵییە گەنجەکان و نیتشەدا بوون، تێگەیشتنیان لە میتافیزیک و زمان و حەقیقەت و جوانی و عەقڵانییەت لە جەوهەردا دووبارەکردنەوەی ئەو بۆچوونانەیە بە جۆری تر، ئەم نوکتەیە تەنیا لە ڕۆشنبیریی کوردیدا بوونی هەیە کە گەر چەمکت لە فیکرێک خواست ببیتە ئەوە. ئەم عەقڵییەتە لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا جۆرە عەقڵییەتێکە کەم و زۆر پەیوەندی بە فیکرەوە نییە، عەقڵییەتێکە چونکە خۆی لەناو دۆگماتیزمێکی مەنهەجیدا دەژی، هەموو تێکستێکی دی لە دیدی دابەشکردنێکی دۆگماتیستانەوە دەخوێنێتەوە... ئەم عەقڵییەتە چۆن سەیری ئینتیمای سیاسی دەکات، بەهەمان مەنتیق سەیری ئینتمای فیکری دەکات، چۆن قسە لە یەکێتی بوون، پارتی بوون، کاژیک بوون، شیوعی بوون دەکات، بەهەمان شێوە باس لە بونیادگەربوون، وجودی بوون، سوریالی بوون دەکات. چۆن لە سیاسەتدا دەبێت هەموو یەکێک لە ژێر شوناسێکی سیاسی دیاریکراودا پۆلێنبکات، لە فیکریشدا پێویستی بە هەمان سیستمی پۆلێنی بنەبڕ و قەتعی هەیە. لێرەوە تەنیا خودی پرسیارەکە هەڵە نییە، بەڵکو کۆی ئەو سیستمە هەڵەیە کە میکانیزمی دروستبوونی ئەمجۆرە پرسیارانە کۆنترۆڵدەکات.

کێشەی میتۆد کێشەیەکە وابەستەی ڕۆحی تازەگەرییە، جارێکی تر بەر لەوەی قسە لە بونیادگەریی بکەم، قسە لەوەدەکەم بۆ لە ساتێک لەساتەکاندا گۆڕینی میتۆد لە ڕۆشنبیریی کوردیدا دێتە پێشێ، ڕەگوڕیشەی ئەم پرسیارانەی ئێستا ئێمە دەیکەین و ئەو هەوڵانەی کە دەیدەین بۆ دۆزینەوەی ماناو ڕوبەری تر لە کوێوە هاتوون؟ واتە بۆ ئەوەی لە کۆی ئەو شتە تازانە تێبگەین کە لەم دەساڵەی دواییدا لە ڕۆشنبیریی کوردی ڕویداوە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەو فەزایەی دۆخی ڕۆشنبیریی کوردی لە کۆتایی هەشتاکاندا تیادەژیا .

یەکێک لەو پرسیارانەی تر کە شەرعییەت و ناشەرعییەتی گۆڕان دەسەپێنێت، ئەو پرسیارە گرنگەیە کە ئایا ئەو فەزا رۆشنبیرییەی کە تیا دەژیین فەزایەکی دروست و تەندروستە، واتە بە ئاراستەی دەوڵەمەندبوون یاخود بە ئاراستەی پوکانەوە دەڕوات. بە ئاقاری گەشەی رۆشنبیرەکانی دونیا دەجوڵێتەوە، یان نوقمی هەندێ وەهمی بچوک و هەندێ وێنەی درۆزنانەیە بۆ خۆی؟ ئایا گۆڕین و تازەکردنەوەی رۆشنبیریی لە دونیای رۆشنبیریی کوردیدا پێویست بوو یاخود ئەم بزاوتەی ئەمرۆ هەیە تەنیا هەواو هەوەسی هەندێ رۆشنبیر دروستییانکردوە کە حەزیان لە کولتووری بێگانەیە و لاساییدەکەنەوە؟ ئەمە پرسیارە جەوهەرییەکەیە، هەر کەسێک بیەوێت قسە لەم پرۆژەیەی ئەمرۆ بکات، دەبێت لەم پرسیارەوە دەست پێبکات، هەر کەسێکیش باز بەسەر ئەو پرسیارەدا بدات، کەسێکە پرسیار ناکات، بەڵکو پاسەوانی سیستمە تەقلیدی و عەقڵە بێبەرهەمەکانە. پرسیاری گەورە ئەوە نییە من یان تۆ یان کێ و کێی دی بونیادگەرن یان بونیادگەر نین، ئەمە پرسیارێکی درۆزنە، یان پرسیارێکە لە دواتردا دێت دوای ئەوەی تۆ وەڵامی کۆمەڵێک پرسیاری تر دەدەیتەوە، پرسیاری گەورە ئەوەیە ئایا رۆشنبیریی ئێمە لە کوێی رۆشنبیرییەکانی تری دونیادایە، لەکوێی کێشە ناوخۆییەکانی کۆمەڵگای کوردیدایە؟ ئایا ئەم رۆشنبیرییە پێویستی بە خۆ تازەکردنەوە هەیە؟ ئایا پێویستی بە کۆدێتایەکی مەنهەجی هەیە یان نا؟ ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانە ناداتەوە و قسە لەسەر هەندێ بابەتی ئەملاولا دەکات کە پێشتر ئاماژەمپێدا کەسێکە خۆی لە ئێستا دەدزێتەوە و ئامادەیە لە ناو مردووەکان و مۆمیاکاندا بژی.

بۆیە حەزدەکەم لە دید و نیگای تایبەتی خۆمەوە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەمەوە، دواتر بگەڕێمەوە سەر پەیوەندییم بە بونیادگەرییەوە.

لەبەرئەوەی پێکهات و سیستمی رۆشنبیریی پێشووتر لە ئاسمانەوە نەکەوتۆتەخوار بەڵکو « گەر هەژارە یان دەوڵەمەند» بەرەنجامی میتۆدێکی دیاریکراوە. لێرەدا پرسیاری یەکەم کە لە رۆشنبیریی

پێشووتری بکەین ئەوەیە ئایا تا چ ئەندازەیەک توانیویێتی خەلاقییەتی ئەو میتۆدانە بەرجەستەبکات کە کاری پێکردوون؟ لێرەدا بۆ نیشاندانی هەژاریی ڕۆشنبیریی ئێمە و ئەو قەیرانە قووڵەی تیا دەژی وەک نمونە بەهێزترین و شاهانەترین بواری کە شیعرە وەردەگرم، چونکە هەموو قورسایی ڕۆشنبیریی ئێمە لەسەر شیعر بووە. لاوازی ئەم ڕۆشنبیرییە لە مامەڵەکردنی لەگەڵ شیعردا، نیشانەی لاوازییەتی لە هەموو ئاستەکانی تردا.

گەر ئەو میتۆدە خراپە وەربگرین کە تا ئەمڕۆش لای هەندێ کەس باڵادەستە سەبارەت بە خوێندنەوەی شیعر لە ڕێگای دابەشکردنییەوە بۆ شیعری کۆمەڵایەتی، سیاسی، دڵداری، دینی و تادوایی، دەبینین لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا میتۆدێکی موبتەزەل باڵادەستە، کە میتۆدیکی ڕوکەشبینە و توانای بینینی تێکستی نییە، کوێربوون لە ئاستی نهێنییەکانی تێکستدا، کوێربوون لە بەرامبەر فۆرمدا، کوێربوون لەو یاسا ناوەکییانەی شیعری پێدەخوێنرێتەوە، کوێربوون بەرامبەر جەوهەری زمان، بەرامبەر میکانیزمی دروستبوون و ونبوونی ماناو لادانی و لاچوونی، واتە لەبیرکردنی خودی تێکست و سەیرکردنی تەنیا لە ڕێگای هەندێ مانای کۆمەڵایەتی عومومییەوە، ئەمە جەهەری سەیرکردنی تێکستە لە ناو ڕۆشنبیریی ئێمەدا. واتە سەیرکردنی وەک سیستمێکی بینراو و یەک دیو و یەک ئاڕاستە لە مانا کە ئەگەر کێشەمان هەبێت لە تێنەگەیشتندا لێی ئەوا ئەو کێشەیە لەوەوە نەهاتووە کە دەشێت جەوهەری شیعر جەوهەرێکی بزۆک بێت و پابەندی ئەو بۆشایی و جیابوونەوە گەورانە بێت کە لە نێوان زمانی شیعر و زمانی قسەدا هەن، بەڵکو پابەندی تێنەگەیشتنمانە لە زمانی کۆنی شاعیرەکە و ئەو وشە عەجەمی و بێگانانەی بەکاریهێناون یان نیشانەی کەم شارەزاییمانە لەو تێکستە دینییانەی کە دواتر پیاوێکی ئایینناس دەبێت بۆمان تەفسیربکات. لێرەوە شەرحی شیعر لە ڕۆشنبیریی کوردیدا دراوەتەوە دەست پیاوانی ئاین، نەوەک ڕەخنەگران، باشترین جۆری تەفسیریش هەر پیاوانی ئاین

پێشکەشییانکردوە. بەمجۆرە یاساکانی تەفسیری دەقی دینی و تێگەیشتنی حوجرەییانەی دین گوازراوەتەوە بۆ ناو کولتووری فیکری ئێمە. ئەگەر سەیربکەیت تا کۆتایی هەشتاکانیش شیعری کلاسیکی ئێمە بە مەنتیقی شیکردنەوەی تێکستی دینی لە حوجرەکاندا تەفسیرکراوە. سەیر لەوەدایە ئەوە مارکسیستەکانی کوردبوون ئەوەیان کردووە، ئەوان بوون تەفسیری کولتووری شیعری ئێمەیان داوەتە دەست مەلا دینییەکان و دیفاعیان لەو تەفسیرەش کردووە. مامۆستا محەمەد مەلا کەریم باشترین نمونەیە، ئەگەر بروانین ئەو کتێبانەی بەرێزیان لەگەڵ باوکیدا راڤەیانکردوون، ئاوێنەیەکی گەورەن بۆ تراژیدیای میتۆد لە رۆشنبیریی ئێمەدا، بچۆرەوە سەر ئەو دیوانانە دەبینیت هەمیشە پێشەکی کتێبەکان مارکسیانە و شەرح و راڤەی قەسیدەکان دینین. رەخنەگری ئێمە تا ئێستا لەبری خوێندنەوەی پێکهات و کیمیای ناوەکی تێکستەکان، لە بری ئەوەی ئەو سامانە زانستییەی زانستە جۆراوجۆەکان دەیخەنە بەردەستمان بۆ بینین و خوێندنەوەی تێکست بخاتەکار، تا ئەمڕۆ لەسەر وەرگێرانی تێکست دەژی لە زمانی شیعرەوە بۆ زمانی قسە، واتە تێگەیشتن لە شیعر لای ئەم عەقلییەتە، پابەندی شەرحی شیعرە بەو ئەندازەیەی مانا روکەشەکانی شیعر خۆی پێشکەشیدەکات. ئەم مەنتیقە لەبنەڕەتدا پەیوەندی بە ئەدەبەوە نییە، ئەم لۆژیکە لە سەیرکردنی ئەدەبدا پابەندی نەخوێندەواری و غیابی رەخنەیە لەناو رۆشنبیریی کوردی خۆیدا، چونکە ئەم میتۆدە و بەمجۆرە سەرەتاییە نزمە لای هیچ میللەتێکی تر نابیسترێتەوە و نابینرێتەوە، ئەم میتۆدە پەیوەندی بە زانستی رەخنەوە نییە کە سەرەتاکانی بە شەرمنی لە حەفتاکان و دوایی ئەو تەکانەی روانگە دروستیدەکات دێتە مەیدان. ئەمجۆرە سەیرکردنەی شیعر کە لەسەر شەرحی مەعنا بەندە پەیوەندی بە زانستی شیعرییەتەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بەو رۆحە دینییەوە هەیە کە جۆرە تێڕوانینێکی دیاریکراو بەسەر تێکستدا دەسەپێنێت. چۆن دەقی دینی لە گوندەکانی کوردستاندا دەبایە وشە وشە روونبکرێتەوە و ماناکانی دیاریبکرێت، ئاواش دەبێت دەقی شیعری وشە وشە ماناکانی بگەێنرێت، چۆن لە دەقی دینیدا

گرنگە لە مانای حەرفی تێکستەکە تێبگەین تا بزانین خودای گەورە چیمان لێ داوادەکات، ئەم سەیرکردنەی پەیوەندی نێوان دەقی پیرۆزی دینی و گوێگر گوازراوەتەوە بۆ پەیوەندی نێوان دەقی شیعری و وەرگر. لێرەوە ئیشکردن لەسەر شیعر هەمان شێوە دەبێتە تەفسیری مانای وشەکان، دۆزینەوەی میتافۆرەکان، دیاریکردنی پردی نێوان تێکستی شیعری و تێکستی دینی. بۆ نمونە هەوڵەکانی مامۆستا عبدالكريمی مودەرس باشترین نمونە و گەورەترینییانە. لەم دیدەدا ڕەخنەگر و خوێنەر کار لەسەر شیعرەکان ناکەن، بەڵکو کار بۆ ڕونکردنەوەی مانایەک دەکەن کە دەشێت دەقەکە خۆی بە ڕوونی نەیگەیاندبێت. ئیشی ڕەخنە ڕونکردنەوەی ئەوەیە کە گووتراوە. بەم پێیە ئەوەی لەسەرمانە دەرهێنانی «نائاشکرایە» لە «ئاشکرا»، کە دیارە ئەمە تەواو جیاوازە لە دەرهێنانی «نادیار» لە «دیار». وەک پێشتر بە درێژی لە ئیمپراتۆرییەتی وەهمدا ئاماژەم بەو جۆرە جیاوازییانەدا. لەم تێڕوانینەوە شیعر خۆی یەکجار هەموو ماناکانی خۆی پێیە و هەموو ئەم مانایانەش بینراون، هێندە هەیە هەندێکمان کەرەستەی بینینمان بەهێزترە و چاومان باشتر دەیبینێت، هەندێکی تریشمان ئەو چاوەمان نییە و نایبینین. ڕەخنەگریش کەسێکە لە دروستکردنی ئەو چاوەدا کۆمەکمان پێدەکات، ئیدی شیعر لە ڕێگای ڕەخنەگرەوە بە یەکجار دەبێتە موڵکی هەموومان و پرۆسەی تەفسیر و ڕاڤەکردن لە جێگایەکی دیاریکراودا دەوەستێت و کۆتاییدێت .

تاکە ڕێگای گێڕانەوەی حورمەت بۆ شیعر ئەوەیە پرۆسەی ڕەخنە لەو تابۆ و حەرامانە ڕزگاربکەین کە لە پێشدەمییایەتی. تێگەیشتن لە شیعر پابەندی گێڕانەوەی وشەکان نییە لە سیاقی شیعرەوە بۆ سیاقی زمانی ڕۆژانە، بەڵکو پابەندی تێگەیشتنە لە شیعر بەو پێیەی وشەی شیعریی بوونێکی جیاواز و تایبەتمەندتریی لە وشەی ڕۆژانە هەیە، وشە لە شیعردا هەمان وشە نییە لە «قسە» دا، تەفسیری شیعریش وەرگێڕانی مانای وشەکان نییە لە زمانی شیعرەوە بۆ زمانی قسە

میتۆد تا ڕادەیەکی زۆر پابەندی ئەو شێوەیەیە کە کێشەکانی پێ دەبینیت، واتە میتۆد جۆرە هۆشەمەندییەکی تایبەتییە کە بۆ پراکتیک دەگەڕێت. ئەو قەیرانەی سەرەوە نمونەیەکی بچوکی کێشەکانن لە ڕۆشنبیریی کوردیدا. لە جۆرە دۆخێکی وادا تۆ ناتوانێت بەبێ بیرکردنەوە لە میتۆدێکی ئەلتەرناتیڤ بژیت. ئێمە لە ڕۆژێکدا هاتینە ناو ڕۆشنبیریی کوردیی کە ئەم ڕۆشنبیرییە جگە لە بیرکردنەوە لە خۆ تازەکردنەوە ڕێگایەکی تری لە پێشدەمدا نەبوو... واتە تازەگەری خەونێک بوو ساڵ دوای ساڵ دەخەسێنرا، دوا دەخرا، دەمامکی تری لەسەر دەنرا. لێرەوە تازەگەری وەڵامدانەوەی پێویستییەکی ناوەکی ناو ڕۆشنبیریی کوردی بوو، تا ئەم ساتەش هەروایە و پێشموایە تا چەندین دەیەی تر هەر بەوشێوەیە دەمێنێتەوە. هەرکاتێک دەڵێین تازەگەری لاساییکردنەوەیەکی خۆرئاواییە، لاساییکردنەوەی عەرەبە، لاساییکردنەوەی فارسە. واتە پێمانوایە، تازەگەری پێویستییەکی ناوخۆ بەرهەمی نەهێناوە و تەنیا ڕەنگدانەوەی هەواو هەوەسی هەندێ کەسە، کە بە قانونی هەواو هەوەسی شەخسی دەڕۆن.... واتە هەموو شتێک لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا جوانەو تازەگەر تەنێکی نامۆو لەشێکی غەریبە بەو ڕۆشنبیرییە.

بەڵام باپرسین ئایا شاعێرێکی وەک گۆران لە ژێر جەبری پێویستییەکی ڕۆحی و ئینسانی خۆیدا بیری لە تازەگەری دەکردەوە یان تەنیا لە ژێر زەبری هەواو هەوەس و کاریگەری شیعری بێگانەدا. ئایا گۆران لاساییکەرەوەیەکی شیعری تورکی و ئینگلیزییە یاخود شتێکی دیش لە ڕۆحییایەتی کە فۆرمی تازە دەسەپێنێت؟ ئایا ڕوانگە وەڵامدانەوەیەکی ڕادیکال نییە بە ئیفلاسی سیستمەکانی تەعبیر لە پێش ڕوانگەدا؟ ئایا ڕاتەکاندنێکی توندی بونیادی زمان نییە بۆ درکاندنی ئەو شتانەی کە زمان وەک توانای شاراوە لە خۆیدا هەڵیگرتوون؟ ئایا هێنانە سەرەوەی ئەوە نییە کە چەندین سەدەیە دەبرێتە ژێرەوە؟ بەڵام بۆ پرسیاری گۆران و خواستی ڕوانگەییەکان لە جێگایەکدا دەوەستێت؟ چی پڕۆژەی تازەگەری گۆران لە سنووری شۆڕش لە کێشی شیعر و زمانی شیعردا

دیلدەکات و ناهێڵێت ئەو سنوورە ببەزێنێت و ببێتە هوشیارییەکی تیوریی، ببێتە کرانەوەیەکی ڕۆشنبیریش بەسەر دونیادا؟ ئەمە یەکێکە لەو گرنگترین پرسیارانەی دەبێت وەڵاممان بۆی هەبێت. چی وادەکات ڕوانگە نەبێتە بزاوتێکی ڕەخنەیی ڕادیکاڵ و ناتوانێت لە پیاچوونەوەی موفرەداتی زمانەوە بگوازێتەوە بۆ پیاچوونەوەی موفرەداتی هوشیاریی؟

تێرامان لەو دوو خاڵەی کە گۆران و ڕوانگە تیاوەستاون جەوهەریین بۆ تێگەیشتن لەو هەموو قەیران و گومانەی دواتر ئێمە لە کۆتایی هەشتاکاندا تیادەژین. پێموایە گۆران پرۆژەی تازەگەریی و دونیاگۆڕینی لەیەک یەکەدا کۆکردەوە و هەردووکیشیانی خستە ناو مارکسیزمەوە. هوشیاری مارکسیزم لای گۆران ئەلتەرناتیڤی هوشیاری تازەگەرانەیە. مارکسیزم لای گۆران و لای هەموو مارکسیزمەکانی دیکە خۆی گۆڕینی سەرتاسەریی دونیایە و هێنانی دونیایەکی تازەیە تێیدا مرۆڤ هەموو خەونەکانی خۆی لە یەکسانی و تێری و ئازادی بەدیدەهێنێت، بێگومان خەونی مارکسییانە ڕۆڵی یۆتۆپیایەکی سلبی گەورە دەبینێت، چونکە خەونێکە نزیکەی نیو سەدە بیرکردنەوەی ئێمە دەکوژێت... کاتێک تۆ پێتوابێت ئەو مەنهەجە سیحراوییەت دۆزیوەتەوە کە هەموو دونیات بۆ تەفسیردەکات و دواتر هەموو بەشەرییەتیش لە دونیای زەرورەتەوە بەرەو دونیای ئازادی بۆ دەبات، ئەمە ئیدی هەموو پرسیارە وردەکان لە ژیان، مێژوو، کۆمەڵگا دەکاتە پرسیاری پەراوێزیی و بێمانا. گۆران لە فەزایەکی ئایدۆلۆژی و فیکریدا ژیاوە کە کێشەی بۆرژوازییەت و سۆسیالیزم کێشەی هەرە گەورەبووە، لێرەوە کێشەی تازەگەریی و تەقلیدییەت کێشەیەکی گرنگ نەبووە، لە ڕووی تیورییشەوە ئەم کێشەیە ئامادەگی نەبووە. ئیدی ئاساییە ئەم پیاوە نەیتوانی بێت لەگەڵ پرۆژەی تازەگەرییدا هەنگاوی ڕادیکاڵانەتر بنێت و تەنیا وەک یەکێک کە عاشقێکی گەورەی جوانی و ژیانە شوێنی خۆی گرتبێت.

ئەگەر مارکسیزم ئەو بەربەستەیە کە خەونی تازەگەری لای گۆران بچوک و هێور دەکاتەوە و سنوورێکی بۆ دیاریدەکات، بەدیوی ئەودیودا

ناسیونالیزم، شۆڕشی ڕزگاریی نەتەوەیی و کوردایەتی ئەو بەربەستە سیاسییانەن کە سنووڕێکی دیاریکراو بۆ ڕوانگە دادەنێن. هەنگاوی ڕوانگەییەکان لە گۆران قووڵتر و ڕادیکالترە، بەڵام چۆن گۆران هەموو خەونەکانی دەخاتە ناو سەبەتەی شۆڕشی سۆسیالیزمەوە، ڕوانگەیی و لاساییکەرەوەکانیان تەواوی خەونەکانیان یان دەخەنە ناو سەبەتەی بزاوتی ناسیونالیزمی کوردەوە یان دەیبەستنەوە بە چارەنوسی هەندێ بزاوتی سیاسی تر وەک بزاوتی چەپ یان حیزبی شیوعییەوە.

ئەوەی جەوهەرییە، ئەوەیە لەسەردەمی گۆرانەوە مەیلێکی قووڵ لای ڕۆشنبیری کورد هەیە هەموو شتێک بە چارەنوسی بزاوتە سیاسییەکانەوە گرێبداتەوە. لە دیوێکدا سەرکەوتنی سۆسیالیزم لەبری تازەگەرییە و خۆی مۆنتۆپۆڵکەری تازەگەرییە، لەسەرێکی تریشەوە، سەرکەوتنی بزاوتی کوردایەتی دەبێتە ئەلتەرناتیڤی تازەگەریی. ئەم دوو هەڵەیە هەڵقوڵاویی سەیرکردنێکی هەڵەی تازەگەرییە. لەهەر دوو ئەم بۆچوونەدا تازەگەریی وەک پرۆژەیەکی تیوریی فیکری مەعریفی سەیرنەکراوە کە دەشێت لەبەرابەر هەموو پرۆژە سیاسییەکان سەربەخۆ بێت، ئامانج و پرسیار و کاراکتەری خۆی هەبێت، پرۆژەی ڕۆشنبیران بێت نەوەک پرۆژەیەکی سیاسی ڕووت. ئەم کێشەیە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە مەعریفە فێرنەبووە لەدەرەوەی سیاسەت خەون ببینێت. سنووری خەونەکانی سیاسی سنووری خەونەکانی ڕۆشنبیریش بووە. خەونی سیاسەت دەبێتە ئەلتەرناتیڤی خەونی هەموو مەعریفە، بەهەموو تایبەتمەندی و خسوسییەتەکانی خۆیەوە. بۆئەوەی لە دیکتاتۆرییەتی سیاسەت ڕزگارمان بایە دەبایە باوەڕمان بەهەموو ئەفسانەکانی لەق بێت و بەوردی لە درۆکانی تێبگەین، درۆکانی چەپ و درۆکانی ڕاست... وەهمی دۆگمایی چەپگەرایانە و ڕووی نانەتەوەییانەی بزاوتی ناسیونالیزمیش. دەبووایە لەهەموو ئومێدە درۆزنەکان پاکببینەوە، ئەو پرۆسەی پاکبوونەوەیەیە ئێمە تا ئەمڕۆ کاری تیادەکەین.

*پرسیار: بەڵام جگە لەو هۆیانەی تایبەتن بە پێکهات و بونیادی مەعریفی، چی ماندەرێکی دیکە هەبوون بۆ تازەکردنەوە... بۆ بیرکردنەوە لە گۆڕینی میتۆدو گەڕان بەدوای زەوییەکی تازەدا؟*

بەختیار عەلی: کۆتایی هەشتاکان گۆڕانکاری گەورەی لەگەڵ خۆیدا هێنا، بەڵام بڕوا لەقبوون بە مارکسیزم و بزاوتی ناسیونالیستی کوردی وەک دوو هێز کە لە حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکاندا بێ چەندوچوون دەبایە یەکێکیان هەڵبژێرین تا بیسەلمێنین خۆمان دۆزیوەتەوە و وننەبووین، ڕیشەی دوورتری هەیە. مارکسیزم پێشوەخت لەبەر ڕۆشنایی ئاشکرابوونی سیمای دیکتاتۆرییانەی ئەزمونی کۆمۆنیزم و هەرەسی ئەو ئایدیایەنەدا کە ئیدیعای دەکرد زۆربەی ڕەونەق و بریقەی خۆی دۆڕاندبوو... ئاشکرابوونی حەقیقەتی سیستمە سۆسیالیست و کۆمۆنیستەکان، لەگەڵ خۆیدا کۆتایی بەو خورافەتە ئایدۆلۆژیانە هێنا، فەلسەفەیەک کۆنترۆڵی پرۆژەی ئازادی مرۆڤ بکات، ئەوەشی ئاشکراکرد ئەو فەلسەفانەی هەڵگری ئەو جۆرە موتڵەقگەراییەن نەوەکو ئازادی ناهێنن بەڵکو جۆرێکی سەرسەخت لە چەوساندنەوە و بەکۆیلەکردن بەرهەمدەهێنن. بزاوتی ناسیونالیزمی کوردیش لەبەر ڕۆشنایی نوشوستی، شەڕی ناوخۆ و تەحالوفاتی ناوچەی ناشیریندا ڕووە موبارەکەکەی خۆی دۆڕاند و تائەمڕۆش بەردەوامە لە دروستکردنی وێنەیەکی ناشیریندا بۆ خۆی و بۆ سیاسەتیش. ئەمە جگە لەوەی کە پرۆژەی ناسیونالیستی لە خۆرهەڵاتدا بەگشتی و لە ستراکتوری دەوڵەتی پۆستکۆلۆنیالدا ڕوویەکی بەربەری، شۆڤێنی و دژە کولتووری هەبوو. ئەنفالیش لە کۆتایی هەشتاکاندا بەرەنجامێکی گەورەی ئەو دوو هەرەسە ئایدۆلۆژییە گەورەیە بوو. من پێموایە سەدەی بیست بۆ ئێمە لە ساڵی 1988 دا و لەگەڵ ئەنفالدا تەواودەبێت و لە دوای ئەوەوە پێدەخەینە سەدەیەکی ترەوە... لەبەرئەوەی لەدوای ئەنفالەوە چ گەڕانەوە بۆ مارکسیزمی تەقلیدیی، چ گەڕانەوە بۆ دین، چ گەڕانەوە بۆ ناسیونالیزم بەو شێوەیەی ئێستای مانایەکی نامێنێت. دیارە واقیعی سیاسی ئێمە

ناتوانێت ئەو حەقیقەتە قبووڵبکات، لێرەوە لە دوایی ڕاپەڕین و ئەنفالەوە تا ئەمڕۆش ئێمە لە سیاقاتی تردا و لە سەر ئاستی تر هەموو ئەو کێشانە دەژین کە کێشەی پێش ئەنفال و ڕاپەڕینن. بەڵام لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە، ڕۆشنبیریی ئێمە لە کۆتایی هەشتاکانەوە دەبێتە دووکەرتەوە، ئەو دووکەرتبوونە تا ئەم ساتە بەردەوامە و بەردەوامیش دەبێت... ئەو دوو کەرتبوونەیە ئەمڕۆ ناوی دەنێین شەڕی تەقلید و نوێگەریی. واتە شەڕی ئەوانەی لە دونیایەکدا دەژین گۆڕانکارییەکانی نابینن و دەیانەوێت هەروەک جاران ببینن و بیربکەنەوە لەگەڵ ئەوانەدا کە ئیفلاسی ئەو جیهانە دەبینن و ئەلتەرناتیڤێکی فیکریی نوێ دادەمەزرێنن .

لە کۆتایی هەشتاکانەوە سیاسەت ئەو سیحرەی لەسەر ئێمە نەما. دەشێت دواجار ئێمە گرووپێکی بچوک بین کە بەقووڵی هەستمان بەو ئیفلاسەی سیاسەت کردبێت و وێرابێتمان بیر لە دروستکردنی ڕووبەرێکی مەعریفی بکەینەوە لەدەرەوەی سیاسەت، بەڵام هەرچییەک بێت، ئەو بڕوا لەقبوونە مەرجی یەکەمی بیرکردنەوە بوو لە ڕێگای تر، لە بەخشینی ژیانێک بە فیکر لەدەرەوەی کۆنترۆلی تەکتیک و ستراتیژەکانی سیاسەت. ئەو کزبوونەی مۆراڵی سیاسی باو، هەرەسی ئەو وێنە موقەدەسەی حیزب و ئایدۆلۆژیاکان بۆ خۆیان دەکێشا بۆ سەرەتایەکی تازە مەرجی یەکەم بوون .

لە کۆتایی هەشتاکاندا ئەو ڕێگرانەی دەستی کەسانی وەک گۆران و ڕوانگەییەکانیان دەبەست لەوەی هەنگاوێک زیاتر بچنە پێشێ بوونیان نەما. سۆسیالیزمی لینینی ستالینی هەرەسیهێنا و هەرەسەکەشی بەرلەوەی هەرەسێکی سیاسی بێت هەرەسێکی ئەخلاقی و ئینسانی بوو. بزاوتی کوردیش کە عەقڵییەتی حیزبپەرستی سروشتی «خێڵی مۆدێرنی» پێبەخشیبوو، لەگەڵ هەموو ئەو زەخمەشدا کە ڕاپەڕین پێیبەخشی، نەیتوانی قەیرانە ئەخلاقییەکانی خۆی تێپەڕێنێت و سیحرێکی نوێ بۆ خۆی داتاشێت، بە پێچەوانەوە سەرەتای ڕاپەڕین سەرەتای سەرهەڵدان و گۆڕینی وێنەی خەباتگێڕە دێرینەکان بوو بۆ جۆرە کاراکتەرێکی مافیایی

کە کۆمەڵگا وەک مەیدانێکی تاڵانی تەماشادەکەن، ئیدی لە تاڵانکردنی سەروەت و سامانی کۆمەڵایەتییەوە بیگرە بۆ تاڵانکردنی ئافرەت و تاڵانکردنی دەسەڵات. لە دوای راپەرینەوە جیلێکی دی لە رۆشنبیران دێت گەمەکانی سیاسەت ناتوانێت بیکاتە کویلەی دروشمەکانی، ئەو هوشیارییە دروستدەبێت کە نوێکردنەوە بە حەتمی بەناو رەخنەگرتندا لەو عەقڵییەتەی لە پشت ستراکتوری سیاسیەوەیە وەستاوە تێدەپەرێت... لێرەوە رەخنەگرتن لە سیاسەت دەبێتە بەشێکی گرنگی هوشیاربوون بە تازەگەریی «بەشێکی نەوەکو هەمووی».

بە کورتی بەبێ تەڵاقدانی سیاسەت، لە فۆرمە کۆنەکانیدا تازەگەر لەدایکنابێت. هەموو ئەوانەی واقیعی سیاسیان پێقبووڵە و پێیانوایە ئەو نوخبە سیاسییەی ئەمرۆ دەتوانێت بچوکترین گۆران دروستبکات، یان روکارە کۆنخواز و مردووەکانی ناو سیاسەتی ئەمرۆ نابینن، ناتوانن هەڵگری سەرەتاکانی ئەو گومانە بن کە تازەکردنەوەی کۆمەڵایەتی و فیکری پێویستی پێیەتی. ئەمە بەرای من قانونی زێرینی تازەگەری ئەمرۆیە.

چونکە بەبێ رەخنەگرتن لە سیاسەت و دەرچوون لێی، بەبێ دروستکردنی چاوێکی تر لەدەرەوەی مەنتیقی سیاسییەکان، وەهمەکانییان، هیوا درۆزنەکانیان، خوتبە بۆشەکانیان، پەیمانە بەتاڵەکانیان و سیحرە پوچبووەوەکانیان، ئەستەمە بۆ پرۆژەیەکی تازەگەر کە لەسەر رەخنە لە موقەدەسات بەندە دەستبکەیتە کارکردن. دیارە ئەمە بەو مانایە نییە کە باس لە نەمانی سیاسەت یان وازهێنان لە سیاسەت، یان قسە لە کۆمەڵگایەکی بێ سیاسەت بکەین، ئەمە منداڵانەترین تەفسیرە بدرێت بەو قسانە، بەڵکو لێرەدا باس لەمردنی سیاسەتێک دەکەین پێیوایە دەبێت ئەو واجبات بۆ کایە زانستییەکانی تر دیاریبکات، رۆژنامەنوسە نەخوێندەوارەکانی هەڵسەنگێنەری ئەدەب و مۆراڵ و نیشتیمانپەروەری خەڵک بن، بەرپرسە نەرجسییەکانی مەرجەعی فیکرین.

ئەم واقیعە تازەیە، شکاندنی کۆی ئەو بەربەستانەیە کە لە ساتە وەختی «گۆران»ـەوە بە شاردراوەیی و ناوەکی و پەنهانی لە بەردەمی تازەگەرییدا بوون، کرانەوەی مێژوویەکی دیکەیە لە واقیعی ئێمەدا، بەرەڵابوونی کۆسپەکانە لەبەردەم دینەمۆیەکی دیکەدا کە دەتوانێت دووبارە سەرتاسەری شتەکان لە چاوێکی دیکەوە بخوێنێتەوە. ئالێرەدایە دووبارە پرسیاری مەنهەج و مەرجەعییەت دەبێتەوە بە پرسیاری سەرەکی و گەڕان بۆ جۆرە فۆرمێکی نوێ کە بە دونیای ڕۆشنبیرییەوە گرێمانبدات، دەبێتە جەوهەری هەموو تازەگەرییەک. لە سیاقێکی وادا ئێمە بەسەر کۆمەڵێک میتۆدی تردا دەکرێینەوە کە بە ڕۆشنبیریی تەقلیدی نامۆیە. ئالێرەوەیە ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات کە ئایا من وەک مارکسیست نیم، بەو هەموو مانا شێوازەی کە بە سەر فەلسەفەی مارکسدا سەپێندراوە، وەک ئەکتیفستێکی سیاسی نیم، وەک حیزبییەک نیم، وەک پیاوێکیش کە بێدەنگ نابم و قسەدەکەم... چیم؟ لێرەشەوە بونیادگەریی وەک توهمەتێک وەک دۆزینەوەی شوناسێکی نهێنی کە لێتکەوتبێت و ناحەزێک دۆزیبێتییەوە دێتە سەرەوە.

*پرسیار: بەڵام دواجار دەمەوێت، بە کورتی نزیکی و دووری خۆت لە بونیادگەریی ناوبنێیت... واتە لەدەرەوەی توهمەت و قسە بێبناغەکان، قسە لە پەیوەندی خۆت بکەیت لەگەڵ بونیادگەریدا؟*

بەختیار عەلی: ئەوەی ئێستا قسەی لێدەکەم دەشێت بەهەمان لۆژیک قسە لەسەر پەیوەندی خۆم بە ڕێباز و بەریانەکانی تریشەوە بکەم. دیارە من حەزدەکەم کەسانێکی دیکە لە ڕێگای خوێندنەوەی سەرجەمی کارەکانەوە ئەو دوور و نزیکییە دەستنیشانبکەن، بە تایبەت من هەڵگری خەمێکی ئایدۆلۆژی نیم تا دوور و نزیکیم لە بونیادگەرییەوە مەراقێکم لادروستبکات، یان هەوڵبدەم نزیکیم یان دووریم پەردەپۆشبکەم، جیاوازیی

نێوان کەسی ئایدۆلۆژیی و کەسانی دیکە ئەوەیە کە پیاوی ئایدۆلۆژی هەمیشە لە نیگەرانی دوور و نزیکیدا دەژی لە مەرجەع، چەند سەختە بە کەسێکی دینی یان مارکسی بڵێیت تۆ لە ئاین یان مارکسیزم دوور کەوتویتەوە، زاراوە گەلی وەک «کافر» یان «تەحریفی» ئاشکراکەری ئەو نیگەرانی و نارەحەتییە ویژدانییە قووڵەیە کە پیاوی ئایدۆلۆژی تیا دەژی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەبەردەم دووبارەبوونەوەی بەردەوامی پرسیارەکەدا حەزدەکەم هەندێ سەرەقەڵەم بڵێم .

حەزدەکەم کۆی نزیکبوونەوە و جیابوونەوەکان لە کۆمەڵێک خاڵدا کۆبکەمەوە. سەرەتا کۆمەڵێک تەوەر لە بونیادگەریدا لای من زۆر پۆزەتیڤن.

1- بونیادگەری هەوڵدانێکە بۆ دۆزینەوەی سیستەمێک لە پشت کۆمەڵێک ڕەگەزەوە کە لە ئاستی ئاشکرادا نارێک و پڕ لە فەوزا دەردەکەون. واتە بونیادگەری بە جۆرێک لە جۆرەکان هەوڵدانی دۆزینەوەی ڕێکییە لە ناو نارێکیدا، دۆزینەوەی سیستمە لە ناوفەوزا و نارێکیدا. کورتکردنەوەی کۆمەڵێک ڕەگەزی زۆرە بۆ چەند پێکهاتێک و ڕەگەزێکی دیاریکراو و دووبارە.

ئەم تێزە جەوهەرییە لە مەنهەجییەتی بونیادگەراییدا بۆ ئێمە بایەخێکی گرنگی هەیە... لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا بەرابەر بە فەوزایەکی بێسنوور دەوەستین، بەرامبەر نارێکییەک، چ گووتارەکان و چ تێکستەکان لە نەسقی ماناداردا ڕیزبەست نەبوون. لەپشت ئەم نارێکییەوە مەنتیقێک هەیە، کۆمەڵێک یاسا کاردەکات، لە بەشێکدا ئیشی من گەڕان بووە بەدوای ئەو لۆژیکەدا کە ڕۆشنبیریی ئێمە لە پشت فەوزا و نارێکییە ڕوکەشەکەیەوە هەڵگرێتی. دیارە ئەم گەڕانە بۆ ڕێکی لە پشت نارێکییەوە، بۆ مەعقول لە پشت نامەعقولەوە بە تەنیا سیفەتی بونیادگەریی نییە، بۆ نمونە مارکسیزم و ڕێکخستنی چینایەتی خۆی

دۆزینەوەی سیستمی کارکردنی کۆمەڵایەتییە لە پشت ڕوکارێکی پڕ فەوزای وەک کۆمەڵگاوە، بەڵام لەم ڕەوتەدا لە مارکسیزم گرنگتر فرۆیدە، فرۆید لە تەفسیری خەوندا لەو لۆژیکە قووڵ و یاسا ئاسنینانە ئاگاداریکردینەوە کە لە پشت ڕوکاری نارێک و نامەعقولی خەونەوەیە، دواتریش لۆژیکی پشت فەوزای هیستریا و نەخۆشییە دەروونییەکانی بۆ شیکردینەوە. دواتر شتراوس ئەم مەنتیقە دەگوازێتەوە بۆ بونیادگەریی «لێرەدا نابێت ڕیشە مارکسیستییەکانی شتراوسمان بیربچێت». کاتێک لە کۆی کۆمەڵگا بەشەرییەکاندا لۆژیکێکی هاوبەش دەبینێت کە پرۆسەی «زینا بە مەحرەم» کۆنترۆڵدەکات و لە کۆی ئەو فەوزایەی کە لەو دیو خوێندنەوە ئەنترۆپۆلۆژییەکانەوە هەیە یاسای جیهانی و سەرتاسەریی دەبینێت، کۆمەڵێک یاسا دەبینێت کە بونیادی گواستنەوەی مرۆڤایەتی لە «سروشتەوە» بۆ «کولتوور» کۆنترۆڵدەکەن. دۆزینەوەی بونیادی هاوبەش و ئەو مەنتیقە جیهانییەی لە پشت کۆی زمانەکانەوەن ئەوە خولیای سەرەتایی بونیادگەرەکان بوو کە پێیان وابوو زانستە ئینسانییەکانیان گەیاندۆتە ئەندازەیەک لە وردەکاری ئیدی دەتوانن بەرابەرێن و ململە لەگەڵ زانستە سروشتییەکاندا بکەن. خولیای بینینی ڕێکی لەناو فەوزادا، خۆنەدانە دەست ڕوکاری یەکەم و بینینی ڕوکەشناسا ڕۆحی ئەم ساتەشە کە ئێمە تیایدا بیر لە چییەتی ڕۆشنبیریی خۆمان دەکەینەوە. لەم دۆخەدا هەموو ئەو سیستەمانەی لە دروستکردنی ڕێکیدا لە پشت نارێکییەوە یاریدەدەرن هێزێکی کاریگەرییان لەسەر کارەکەمان هەیە. بەڵام جیاوازی گەورە لەوەدایە بوارەکانی ئیشکردنی ئێمە وەک کۆمەڵێک ڕۆشنبیری کورد سەد دەر سەد لە بواری ئەو فەیلەسوفانە جیاوازە. هێندە هەیە لە هەردوو دۆخەکەدا خولیای دۆزینەوەی بونیادێکی کۆکەرەوە لە پشت ئەو شتانەوە دەبینرێت کە زۆر خۆڕسک و عەفەوی دیارن. دیارە ئەم کاریگەرە مەنهەجییە، هەرگیز نەبۆتە مایەی دروستبوونی پردێکی ڕاستەوخۆ لە نێوان ئەو فەلسەفانە و وتارەکان و هەوڵەکانی مندا، دواجار من لە مانای دوو شت دەگەڕێم کە تەواو جیاوازە لە سنوور و بابەتی بونیادگەرەکان، من لە «لۆژیکی پشت بیابانی

مەعریفی» و «لۆژیکی پشت پرۆسەی بەرهەمهێنانی مەعریفی» و «ئەو جومگە سەرەکییانە دەڕوانم کە جڵەوی بیرکردنەوە و ڕەفتاری سیاسی و کولتووریی کوردی کردوە» . ئەو بونیادانەی لێرەدا دەیدۆزینەوە، ئەو ڕێگایانەی لێرەدا پیادەڕۆین، تەواو جیاوازن لەوەی بونیادگەرەکان کاریان لەسەر کردوون.... ئەمە دۆخێکی تەواو دروست و مەنتیقیشە کە تۆ لە بوارێکی جیاوازدا ئیشتکرد واتە بونیادی تر دەدۆزیتەوە... کە بەرامبەر کێشەی تایبەتی بوویت، واتە سیستمی ڕێکخستنی تایبەتی دەدۆزیتەوە. ئیدی نامەعقولەکان هەموو بەیەک شێوە نابنە مەعقول، هەر شێوەیەکیش لە شێوەکانی فەوزا، بە جۆرێکی ترو بە سروشتێکی تر دەبێت ڕێکی .

گەر بگەڕێیتەوە سەر «ڕۆشنبیریی تاک ڕەهەند»، «ئیمپراتۆرییەتی وەهم»، «یادەوەری و زەمەن» و کۆی کارەکانی تریش هەوڵێک و ئارەزوویەک دەبینیت بۆ دۆزینەوەی ڕێکی لە پشت فەوزاوە، بەڵام ئەوەش دەبینیت کە ئەوە تایبەتمەندێتی نامەعقولە کە هەموو ئەو جیاوازییانە دەسەپێنێت. دواجار خودی کێشەکانن ئێمە بەرەو خۆمان دەگێڕێتەوە.

ئێمە لەبەردەم بونیادێکی تردایین، کەواتە لەسەر پرسیاری تر کاردەکەین، یاسای ترمان پێویستە، دۆزینەوەی ترمان هەیە. بونیادگەری لە نوسخە ئەسڵییەکەیدا دەتوانێت لە ڕووی بەخشینی هەندێ چەمکەوە یارمەتیمانبدات، زاراوەی تایبەتیمان بخاتە بەردەست. بەڵام دواجار ئەوەی بەو کەرەستانە دەیبینین و ئەو بەرەنجامانەی بەدەستی دەهێنین تەواو شتێکی دیکەیە... ئێمە لەگەڵ بونیادگەرەکاندا خولیای لەیەکچوومان هەیە، بەڵام ماهییەتی خولیاکان و ماناکانیان و ئەو ژینگە ڕۆشنبیرییەی تیا هەڵقوڵاوە و ئەو دەرەنجامانەی پێیدەگەین سەر بە جیهانێکی ترە، جیهانێک نەوەکو قابیلی بەیەکچواندن نییە، لەگەڵ دونیای بونیادگەرە ئەوروپییەکاندا، بەڵکو قابیلی بەراورد نییە. من و تۆ کوڕی سەردەمێکی تر و زادەی میللەتێکی ترین، لەبەرئەوە چاوێکی ترمان هەیە .

2. خاڵێکی تر کە لە کولتووری بونیادگەریدا بۆ من زۆر گرنگ بوو. ئەو تەوەرەیە کە دەتوانم بە «خوێندنەوەی سپێتی» و «خوێندنەوەی بێدەنگی» ناویبنێم. بونیادەگەرەکان فێریانکردین لە پشت هەموو بیرکردنەوەیەکەوە ڕوبەرێکی چەپێنراوی دەنگ هەیە، لەپشت هەموو قسەیەکەوە کۆمەڵێک نەگوتراو هەیە، لەو دیو هەموو ڕستەیەکەوە ڕستەیەکی تری نەنوسراو ئامادەیە. من بەر لەوەی بونیادگەرەکان بخوێنمەوە لە بێدەنگی و سپێتی و کەمدوویی ڕۆشنبیریی کوردی سەرسام بووم... مێژوویەکی درێژ لە بێدەنگی دونیای ئێمەی تەنیوە، ئەم بێدەنگییە تەنیا تایبەتمەندێتی سەدەکانی دیکەو سەردەمە دێرینەکان نییە، بەڵکو بەهەموو قەدو قەوارەی خۆیەوە ڕوبەرێکی گرنگی سەدەی بیستیشی گرتۆتەوە، لە دواتریشدا مۆدێلی «قسەی سپی» واتە قسەی بەدوور لە بەرهەمهێنانی فیکر، هەر درێژکراوەیەکی دیکەی بێدەنگییە. ئەمە ئێجگار سەیرە هەندێ جار لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا سەدان لاپەڕە دەخوێنیتەوە بەڵام دوای ئەو خوێندنەوانە هەستێکی قووڵ بە سپێتی بە بۆشی و فەراغ و هیچ نەخوێندنەوە داتدەگرێت، ڕەنگە ئەمجۆرە هەستە تەنیا لە فەزای ڕۆشنبیریی کوردیدا مابێت.

گومان لەم بێدەنگییە و خوێندنەوەی ئەم سپێتییە وەک سپێتییەک کە تەعبیر لە بێدەنگکردن دەکات، کە تەعبیر لەجەوهەری غەیبکردنی عەقڵ دەکات، تەعبیر لە ئیرادەیەکی کولتووریی تایبەتی دەکات، زمانحاڵی بونیادێکە کە بە بێدەنگی خۆی لە گومان دەدزێتەوە، بە بێدەنگی هەموو ئەو پرسیارانە دەچەپێنێت کە دەشێت لەبەردەمیدا دروستببن. واتە وەزیفەی ئێمە ئەوەیە ئەم بێدەنگییە لە ڕوانگەیەکی ترەوە جیاواز لەو ڕوانینەی لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا باڵادەستە سەیربکەین .

ئاشکرایە تەفسیری تەقلیدی ئەم بۆشایی و فەراغە گەورەیە بەوە دەکرێت کە زمانی کوردی لەژێر فشاری دیندا درەنگ خۆی دۆزیوەتەوە، دەیگێڕنەوە بۆ دواکەوتوویی کورد بە هۆی داگیرکەرانەوە، دیارە دەشێت ئەم هۆیانە بەشێوەیەکی ڕێژەیی دروست بن، بەڵام ئەم قسانە ناتوانن

پاساوی ئەو ئیفلیجییە بدەنەوە کە ڕۆشنبیریی کوردی لەسەدەی بیستدا تیاژیاوە. سەیرکردنی ئەم بێدەنگییە وەک شێوەیەک لە تیرۆرکردنی ناوەکی کە تایبەتە بە یاسا و میکانیزمە ناوخۆییەکانی ناو ڕۆشنبیریی کوردی لەلای من لە ژێر حوکمی هەمان پرۆسەدابوو کە ڕیشەکانی لای بونیادگەرەکانە .

دیارە ئەم دۆزە لە خورئاوادا پرۆسەیەکی خوێندنەوەیەکی قووڵە کە لای بارت و فۆکۆ ئاسۆی گرنگ لە خۆدەگرن... ئاسۆی گەڕان بۆ مانایەکی تر بۆ زمان و بۆ تێکستی ئەدەبی، واتە سەیرکردنی ئەدەب وەک تاکە هێزی دەربازبوون لە فاشیزمی زمان کە تێزێکی سەنتراڵە لای بارت. وە ئاسۆی خوێندنەوەیەکی تر بۆ مێژووە بچوک و گچکەلەکان، مێژوی شێتی، مێژوی سزا و مێژووی سیکسوالییەت واتە دەرهێنانەوەی هەموو دەنگە چەپێنراوەکانی ناو مێژوو «لای فۆکۆ».

ئەم پرۆسەیە لە واقیعی ئێمەدا نامومکینە، لەبەرئەوەی دۆزینەوە و پڕکردنەوەی ڕوبەرە سپییەکان لە مێژووی غەربدا پابەندی گەڕان و ئەرکێئۆلۆژیایەکی وردە لەناو ئەرشیفی خۆرئاوادا، جیاوازی نێوان ئێمەو خۆرئاوا ئەوەیە کە ئەوان «ئەرشیف» دەگەڕێن، ئێمە «نەبوونی ئەرشیف» بۆ مانای دەنگ و بێدەنگی دەگەڕێین، وەک دەبینی جیاوازییەکە بە جۆرێک گەورەیە دوو پرۆسەی جیاوازی دروستکردووە. نەبوونی ئەرشیف وادەکات ئێمە پتر لەسەر تیورە و تێڕامان کاربکەین، نەوەک لەسەر دەق و فایل و دۆسییە دێرینەکان. بەڵام جیاوازی هەرە گەورە لەوەدایە کە بونیادگەرانی خۆرئاوا پتر لەسەر مێژووی بێدەنگی کاردەکەن، لەسەر ئەو ڕوبەرانە کاردەکەن کەهەمیشە تیایدا لەپاڵ بێدەنگییەوە دەنگێک هەیە، واتە لەپشت هەموو قسەنەکردنێکەوە قسەکردنێک هەیە، لە پشت هەموو گووتارێکی نەگووتراوەوە گووتراوێک هەیە کە لۆژیکێک هەڵدەگرێت و لۆژیکێک دەچەپێنێت، شتێک دەڵێت و شتێک ناڵێت. دیارە لە ئەرشیفی زانست و مۆراڵ و دەسەڵاتدا دەتوانین ئەو سیستمە و میکانیزمەکانی کارکردنی بدۆزینەوە کە هەندێ گووتار

دەهێنێتە پێشێ و هەندێ گووتار خەفەدەکات .

بەڵام کێشەی ئێمە و پرسیاری ئێمە ئەگەرچی وەک پرسیاری بونیادگەرەکانی خۆرئاوا تایبەتە بە بێدەنگی، بەڵام بێدەنگی ئێمە بێدەنگییەکی ساف و بێگرێ و بێخەوشە، بێدەنگی لە خۆرئاوادا بێدەنگییە لە ناو کایەیەکی زانستیدا، بەزەبری ئەبستیمێکی دیاریکراوە، دەلالەتی ئایدۆلۆژیایەکە دواجار پشت ئەستوورە بەدەسەڵاتی مەعریفە، واتە وردتر قسەبکەم بێدەنگی خۆرئاوا بێدەنگکردنی بەشێکی مەعریفەیە لە ناو مەعریفەدا، ریشەکانی ئەم بێدەنگییەش تایبەتە بە سروشتی میتافیزیکی غەربی کە هەمیشە جیهانی بۆ جوان / ناشیرین، بەرز / نزم، چاک / خراپ.... هتد دابەشدەکات. کە دواتر لەسەر دەستی نیتشەدا هەوڵی تێکشکاندنیان دەدرێت. گەڕان بەم ئاڕاستەیە و لەم ڕەوتەدا هەڵگەڕانە بە سەر «درەختی فەلسەفە» خۆیدا وەک هایدگەر دەڵێت.

ئێمەش وەک بونیادگەرەکان لە دوای بێدەنگین، لەدوای سپێتین، لەدوای نەگووتراوەکانین، لەدوای ئەو ڕووبەرانەین کە بیریان لێنەکراوەتەوە، لە خولیای دۆزینەوەی شتە فەرامۆشکراوەکانداین، لە مەراقی دۆزینەوەی مانای بێمانابیداین، لە هەوڵی تێگەیشتنداین لەوەی چەپێنراوە. بەڵام ماهییەتی ئەوەی ئێمە بۆی دەگەڕێین بەسەدان فەرسەخ جیاوازە لەوەی کە بونیادگەرەکان بۆی دەگەڕێن .

ئەو بێدەنگییەی ئێمە بۆی دەگەڕێین بێدەنگییەکی بێکایەیە، بێ مێژووە، بێ زانستە، ئەرشیفێکی چکۆلەی هەیە، خۆی لە پشت هەندێ دروشم و ئینشاوە شاردۆتەوە، یەکەم چەک و دواچەکی بەلاغەت و ئینشا و هوتاف وڕیساکانی زمانە... هەندێ شتی نەچەپاندووە بەڵکو هەموو شتێکی چەپاندووە، هەندێ گووتاری بێدەنگنەکردووە، بەڵکو خودی عەقڵی بێدەنگکردووە. عەقڵانییەتێک نییە دونیای بۆ عەقڵانی و ناعەقڵانی دابەشکردبێت، بەڵکو هێزێکە لەدەرەوەی عەقڵانییەت و ناعەقڵانییەت کاردەکات، ئیفلیجی دۆخی ئاسایی و بەرهەمهێنان دۆخی نائاساییەتی.

عەقڵێکە یەکەم و سەرەتایترین مەرجی عەقڵی کوشتووە کە بیرکردنەوەی تیورییە، ئەوەی چەپاندویتی توانای عەقڵە لەسەر نەفیکردنی خۆی و توانای عەقلە لەسەر بیرکردنەوەی ئەبستراکت... لێرەوەیە شێوە ئیشکردنی نوێگەرانە وەک ئیشکردن دەبینم لەسەر ئەو سیستمەی ئەو دۆخەی دروستکردوە و دەیپارێزێت و دەیرازێنێتەوە و بەهانەی بۆ دەهێنێتەوە. لێرەوەیە مافی خۆمانە بە گومانێکی سەرتاسەرییەوە بروانین، بیر لە پیاچوونەوەی مانای هەموو وشەکان بکەینەوە، لە پشت ئامادەگی هەندێ دروشم و ناوەوە بۆ مانا شاردراوەکان بگەڕێین، لە پشت سیستمی موقەدەساتەکانەوە بۆ لاشەی کوژراوی هەموو ڕەنگەکانی بیرکردنەوە بگەڕێین.

وەک دەبینی من لە هەموو ئەو جومگانەشدا تاسەر ئێسقان ئەو کێشانە لە مانا کوردییەکانیدا ژیاوم، بە مانایەکی تر هەمیشە کوردبوونم ئاڕاستەمدەکات... کێشە گەورەکەی ناو خەیاڵ و نوسینی من، کەویستوومە ئیشیان لەسەر بکەم، ئەوە نییە کە لەژێر کاریگەری ئەم ڕێبازم یان ئەوی تردام، کێشەکەم ئەوەیە کە تا سەر ئێسقان کوردم. ئەمە شتێکە بێپەروا بەرگری لێدەکەم، هەرشتێک نوسیوومە لە کوردبوونم جیانەبۆتەوە، دیارە بەو مانایەی کە من لە کوردبوون تێگەیشتوون. هەوڵدانی ئەوەی نزیکی من یان کاک مەریوان لە بونیادگەرییەوە وەک هۆیەک بۆسەندنەوەی شوناسی کوردیمان سەیربکرێت بەرهەمی عەقڵێکە، کوردبوونی بۆ چەند کلێشەیەکی فۆلکلۆری کورتکردۆتەوە، کوردبوونی گرێداوە بە جیابوونەوەو دابڕان و بێئاگابوونەوە لە دونیا. کوردبوون قووڵبوونەوە و هوشیارییە، نەوەک بێئاگایی و گەمژەیی. کوردبوون تەماشاکردنی دونیایە لە گۆشەنیگایەکەوە وەک کورد... ژیان و تەماشاکردن لە مانا قووڵەکانیدا، تەماشاکردن بە مانای بینینەوەی جیهان و بینینەوەی مێژووی فیکر لە شوێنی خۆتەوە، واتە لە دیدی کوردێکەوە کە خۆی و جیهان لە ناویەک پرۆسەی یەکانگیردا دەدۆزێتەوە، دۆزینەوەی من بۆ کوردبوونی خۆم لە دۆزینەوەم بۆ جیهان جیانابێتەوە، وەک چۆن

دۆزینەوەم بۆ جیهان لە ئەزمون و پاشخانەکانی کوردبوونم پاکناکرێتەوە .

3 ـ کاریگەری سێهەمی بونیادگەران مەسەلەی تێگەیشتنە لە مێژوو.

ڕزگاربوون لە دیدی گەشەگەرایی بۆ مێژوو مەرجی سەرەکییە بۆ ڕزگاربوون لە دیدی تەقلیدییانە بۆ سیاسەت . تا ئەو شوێنەی باوەڕمان وایە مێژوو خەتێکی گەشەی بەردەوامە، لەسەرەتایەکی کاڵ و نەگەیوەوە دەستپێدەکات و دەگاتە ئامانجێکی ناوەکی کە ئەم ئامانجە وەک غایەتێکی ناوەکی لەسەر بزاوتی مێژوو ڕەسمبووە. ئەم دیدە تیلیۆلۆگی «غائی» یە بۆ مێژوو، کە وادەبینێ مێژوو ئامانجێکی ناوەکی هەیە و بەرەو ئەو ئامانجە دەڕوات، ئەم دیدە بونیادگەران بە جۆرە نیگایەکی دی جێگای دەگرنەوە. لە تەفسیری بونیادگەریدا مێژوو وەک هێڵێکی گەشە کە بەردەوام ڕووی لە پێشە و گەیشتنی بە دوائامانج حەتمییە، مانایەکی نامێنێت... مێژوو لێرەدا بەجۆری دی و لەسەر بنەمای دیکە سەردەمڕەنگ دەکرێت. قۆناغگیری لەلای بونیادگەران، لەسەر چەمکگەلی وەک گەشەی حەتمی و گەشەی بەردەوام و یاسای هەمیشەیی نەگۆڕ دانەڕێژراوە. لێرەدا زاراوە گەلی وەک دابڕان، ئەبستیم، پارادیگم ڕۆڵی گەورە دەگێڕن. ئەم نیگایە بۆ مێژوو گرنگییەکی گەورەی هەیە بۆ خوێندنەوەی مێژووی گەلانی وەک ئێمە. مێژووی گەلێکی وەک کورد، کە جوڵەیەکی ناوەکی خاو و نەگۆڕی هەیە، کە پێکهاتی مێژوویی و کۆمەڵایەتی سەدان ساڵ بێ گۆڕانکاری جەوهەری ماوەتەوە، کە مێژووەکەی سروشتێکی بازنەیی هەیە، نەوەک سروشتی ڕاستەهێڵ. ئەمە وایکردوە «میتۆدە فراژوبوونگەراکان ـ المناهج الارتقائیة»، ئەو میتۆدانەی شاندەدەنە سەر تەفسیری مێژوو وەک پرۆسەیەکی پەرەسەندنی ئاڕاستەکراو بەرەو ئامانجێکی پێشوەخت دیاریکراو، ناتوانن دەرهەق بە واقیعی ئێمە و مێژووی ئێمە هیچ بڵێن. من لێرەدا باوەڕی تەواوم بەو بۆچوونەی شتراوس هەیە کە پێیوایە ئەو جۆرە باوەی خوێندنەوەی مێژوو وەک زانستێک کە پێویستی بە زانیاری، دۆکۆمێنت و شەهادەتی نوسراو هەیە، بۆ گەلانی وەک ئێمە کە

دۆکۆمێنتی نوسراویان کەمە، بایەخێکی تەواو ناچیزی هەیە. ئەمە جگە لەوەی خودی بونیادگەریی وەک میتۆد تا ئەندازەیەکی زۆر ڕزگارکردنی زانستی مێژووە لە کۆت و پێوەندەکانی ڕوانین بۆ مێژوو وەک زنجیرەیەک حکایەت و ڕوداوی جیاواز جیاواز، هەوڵدانە بۆ دۆزینەوەی سیستمێک و نەسقێک لە قۆناغە جیاوازەکاندا، تا ئەندازەیەکی گەورەش دەربازکردنی مێژووە لەدەسەڵاتی موتڵەقی مێژووی سیاسی بەسەر جۆرەکانی تری مێژووەوە. بونیادگەرەکان بواری گەلەک نوێیان لە خوێندنەوەی مێژوودا کردەوە. لای فۆکۆ مێژووی شێتی، زیندان و تیمارسازی، شوێنی مێژووی پاشاکان و جەنگەکان دەگرێتەوە. بونیادگەرەکان لە چەند ئاستێکی دیکەی مێژوو ئاگاداریانکردینەوە، کە پێشتر لەدەرەوەی بایەخی ڕاستەقینەی مێژوونوسان بوو. ئەمە چاوێکی وردتر دەبەخشێت بە ئێمە، تا بەجۆرێکی دی تەماشای مێژوو بکەین. ئەمە جگە لەوەی پێداگرتنی شتراوس لەسەر ئەوەی مێژوو ناتوانێت بێلایەن بێت، هەمیشەش ئەوانەی دەینوسنەوە و قسەی لێدەکەن بە شێوەیەک لە شێوەکان دیدی ئایدۆلۆژی، چینایەتی و ناسیونالیستیانەی خۆیان تێکەڵاوی حیکایەتەکان دەکەن، بە ئەندازەیەک گەیشتن بە هەقیقەتی مێژوویی جگە لە خورافەتێک زیاتر هیچی تر نییە. لێرەوە بایەخدان بە پێکهاتی جەوهەری شتەکان، بە پێکهاتیان وەک ئەوەی ئێستا هەیە و دەیبینین، بێئەوەی بەردەوام لە ناو ڕوکارەکانی گەشەی مێژوودا لێڵیانبکەین، بایەخێکی مەعریفی گەورەی هەیە. ئەمە بەو مانایە نییە بایەخ بە دیوی مێژوویی دیاردەکان نەدەین، بەڵکو بەو مانایەیە دیوی دەرەکات و نازەمانیان فەرامۆشنەکەین .

بۆ ئەوەی وردتر بدوێم دەڵێم من باوەڕم بە گەشەکردن و پەرەسەندن هەیە، بەڵام گۆڕینی گەشە بۆ چەمکێکی حەتمی و تیلۆلۆژیانە «غائي»، واتە بۆ چەمکێک پێتوابێت، مێژوو دەکرێت تەنیا بە یەک ئاڕاستەدا بڕوات و پێشتوابێت کە ئەو ئاڕاستەیە وەک ئامانجێک لە سەرخواستی هێزە مێژووییە گرنگەکان نوسراوە، ئەمەیان باوەڕم پێی نییە. بونیادگەرەکان

گۆڕانە ڕادیکالەکانی ناو مێژووو ناو سیستمی ژیان و جیهانبینی دەبینن، لێرەوە هەموو گۆڕانکارییەکی سیاسی، هەموو لابەلابوونەوەیەکی کاتی وەک ئاماژە بۆ قۆناغێکی مێژوویی سەیرناکەن، مێژوو هەموو ڕۆژێک و هەموو ساڵێک ناگۆڕدرێت. ئەوەی پێوەری گەشە و پەرەسەندنە، گۆڕانی حوکمڕانەکان نییە، بەڵکو گۆڕانی سیستمەکانی ژیان، سیستمەکانی کولتوور، جیهانبینییەکانە. تەنیا لەو گۆشە نیگایەشەوە دەبێت تەماشای گەشەو پەرەسەندن بکەین .

4- خاڵێکی تر لە بونیادگەرییدا کەلای من زۆر گرنگ بوو، بایەخدانی بونیادگەران بوو بە چەپێنراوی کولتووری «المکبوت الثقافی». ئێمە لەگەڵ قوتابخانەی دەرونشیکاردا زانیارییەکی تەواومان سەبارەت بە چەپێنراوی جنسی و غەریزیی دەستکەوت، بەڵام دواتر بونیادگەرەکان لە چەپێنراوی غەریزییەوە گواستیانەوە بۆ چەپێنراوی کولتووری، بۆ قسەکردن لەسەر نەستێکی کولتووری و مەعریفی. ئەم گواستنەوەیە لە چەپێنراوی غەریزییەوە بۆ چەپێنراوی مەعریفی بایەخێکی گەورەی هەبوو بۆ بینینی جەوهەری ئەو پرۆسانەی لە ناو ڕۆشنبیریی کوردیدا ڕوودەدەن. فەزای کوردی چەندە لەسەر گەورەکردنی ڕوبەری چەپاندنی غەریزی ئیشدەکات، ئەوەندەش لەسەر چەپاندنی مەعریفی ئیشدەکات. ئەم خاڵە سەرەتا و دەستپێکی تەواوی نوسینەکانی منە. تێگەیشتن لە میکانیزمەکانی چەپاندنی مەعریفی یەکێکە لە هەرە گرنگترین ئەرکەکانی فیکر لە دونیای ئێمەدا. سەرخستنەوەی ئەو چەپێنراوانە، دۆزینەوەیان، وەبیرهێنانەوەیان، دواکەوتنی شوێن پێکانیان، بەشێکی گەورەی خولیا و ئارەزووی من بووە. ڕوبەری حەرام، ڕوبەری فەرامۆشکراو، میکانیزمەکانی شاردنەوە، میکانیزمەکانی گۆڕینی ئاسایی بۆ نائاسایی، گۆڕینی نائاسایی بۆ ئاسایی. بینینی سروشتی ڕیزبەستنی گووتارەکان و هیرارکییەتیان، سروشتی هاتنەقسە و بێدەنگ بوونیان. ئەوانە بە کۆ پابەندی دۆزینەوەن لە ناو چەپێنراوی مەعریفی ئێمەدا.

لەدەرەوەی ئەم کاریگەرییانە، دواجار حەزدەکەم بێمەسەر ئەو تەورە

گرنگانەش کە تیایدا خۆم گەلەک دوور لە بونیادگەران دەبینمەوە.

١ ـ لای هەندێک لە بونیادگەران بیرۆکەی «بونیاد» وەک جەمسەرێکی دژ بە جەمسەری خود و ئازادی تەماشادەکرێت. واتە بونیاد وەک یەکەیەکی کارای ئەوتۆ تەماشادەکرێت کەلەسەرجەم هێزەکانی دی بەهێزترە و هەموو شتەکان لە ناوخۆیدا کۆدەکاتەوە و پێیانوایە جیهان و مێژوو جگە لە چالاکی بونیادەکان هیچ جۆرە چالاکییەکی دی لە خۆناگرێت. بە کورتی لای هەندێک لە بونیادگەران، فیکرەی بونیاد هاوشێوە و هاوڕەنگی قەفەزێکە کە یەکجار دەچیتە ناوی و ئیدی هەرگیز ناتوانیت بێیتە دەرەوە. لێرەدا بونیاد ئەو جەبرەیە کە مرۆڤ ناتوانێت لێی ئازاد بێت. ئەو جەبرەیە کە زۆرجار مرۆڤ نائاگا تیادەژی. ئەوەی لەم تێگەیشتنەدا نەگەتیڤە سەیرکردنێتی بۆ مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی بێئیرادە. دیارە گومان نییە کە چەندەها پێکهاتی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەن، سروشتی جەبری تاریک و بونیادی داخراو وەردەگرن، زۆرجار ئەو پێکهاتە قەفەزئاسایانە تەمەنێکی درێژیشیان هەیە. بەڵام وێناکردنی خود وەک چەمکگەلێکی بێمانا لەبەردەم چەمکگەلی بونیاددا، تەماشاکردنی بونیاد وەک جەمسەری نەفیکەر بۆ خود، پێموایە مەسەلەیەکە بەرەو دەرەنجامی مەترسیدارمان دەبات. ئیرادەی ناسینی بونیادەکان و شکاندنیان چالاکییەکە کەوتۆتە سەر خودی مرۆڤ و بەندیشە بە ئازادییەوە. لێرەوە چەمکی ئیرادەگەریی چەمکێکی ئێجگار گرنگە بۆ ئێمە. من باوەڕم بەبوونی بونیادێک نییە، بکرێت وەک قەفەزێکی هەمیشەیی سەیریبکەین، ئەمە جگە لەوەی چەمکی فەرد بۆ کۆمەڵگایەکی وەک ئێمە دەکرێت دژ بە هەموو دیسپۆتە کۆن و نوێکان، چەمکێکی پۆزەتیڤ بێت.

2ـ بونیادگەری لە زۆربەی دۆخەکاند، یان لە زۆربەی زانستەکاندا بۆ یەکجۆر لە پێکهات و ستراکتوری هاوشێوە دەگەڕێت، واتە کورتکردنەوەی سەرجەمی زانستەکان بۆ سەر چەند ستراکتورێکی وەک یەک و لەیەکچوو. یاخود گێڕانەوەی کۆی زانستە جیاوازەکان بۆ سەر چەند قاڵبێکی ستراکتوری هاوشێوە، واتە گرێدانەوەی دەروونناسی و ماتماتیک،

ئەنترۆپۆلۆژیا و زمانە لە ڕێگای کۆمەڵێک بونیادی یەکەمین و هاومیکانیزمەوە. پێموایە ئەگەر ئەو هەوڵە لەگەڵ سەرەتاکانی گەشەی زانستدا مانای هەبێت دواتر لەگەڵ بەشبەشبوون و پارچەپارچەبوونی وردی کایەکاندا، دۆزینەوەی ئەو ستراکتورە هاوبەشانە کارێکی ئەستەمە. تەعمیمکردنی ئەم ڕێسایەش بۆ پەیوەندی هەموو زانستەکان بەدەر نییە لە گرفتی گەورە.

3ـ بونیادگەران ناکۆکی و دژایەتی ناوخۆی ناو سیستمە فیکرییەکان دەبینن، بەڵام خودی ئەو دژایەتیانە لە ناو یەک یەکەدا کۆدەکەنەوە، واتە ئەوەی «لێکترازانساز»ـەکان بە شێوەیەک لە شێوەکان بە تێکشکێنی دەبینن بۆ لۆژیکی ناوەکی زۆر سیستەم، لای بونیادگەران دواجار وەک بەشێک لە سیستمێکی ناوەکی و لۆژیکی ناوەکی سیستمەکان تەماشادەکرێت. من پێموایە ڕۆیشتن بە خەتێکی توندڕەوانە لەگەڵ بونیادگەرییدا بەرەو ئەوەماندەبات کە کێشە ناوەکی و ناکۆکییە ناوەکییەکانی زۆر سیستەم لەناو لۆژێکێکی سەرتاسەری و گشتیدا ونبکەین. دۆزینەوەی ڕێکی لەپشت نارێکییەوە خاڵێکی پۆزەتیڤی بونیادگەرییە، بەڵام فەرامۆشکردنی هەموو ناکۆکییە ناوەکییەکان، بێدەنگکردنی ئەو سیاقە زۆرانەی کە زۆرجار لەناو یەک تێکستدا دێنە زمان. مەرج نییە تێکست بەردەوام ئاواز و ئاهەنگی یەک لۆژیک بچرێت، زۆرجار تێکست کەرنەفالێکی جودای ڕەنگ و دەنگ و شێوەزمان و شێوە نوسینەکانە. لێرەوە کۆکردنەوەیان لە ناو یەک یان چەند بونیادێکدا ڕەنگە بۆ هەندێک تێکست دەستنەدات.... مەبەستمە بڵێم، توانای بونیادگەریی لە خوێندنەوەی تێکستەکاندا لە سنوورێکی دیاریکراودایە و ترنجاندنی ئەم میتۆدە بۆ ناو هەموو تێکستێک دروست نییە.

4ـ بەوەدا بونیادگەریی لەهەموو زانست و فەلسەفە و تێکستەکاندا بەدوای ڕەگەزە بنەڕەتی و بونیادە بنچینەیی و پێکهێنەکاندا دەگەڕێت. لێرەوە کاتێک دەچێتە خزمەتی جۆرە ئایدۆلۆژیایەکەوە، یاخود هەندێ کەسی فەندەمەنتال بەکاریدەبەن، لە ڕووی ئایدۆلۆژییەوە دەرەنجامی دۆگمائیانەی

هەیە. وەک هەڵوێستی ئالتۆسێر لە مارکسیزم و لاکان لە فرۆیدییەت. کە یەکەمیان لە ئاستی ئایدۆلۆژیادا و دووەمیان لە ئاستی زانستیدا وەفایەکی قووڵیان بۆ ئەو بنچینە سەرەکی و پێکهێنە قووڵانە هەبوو کە بە بونیادی بنچینەیی مارکسیزم و فرۆیدیزمیان دەزانی. واتە مەترسییەک لە بەکارهێنانی بونیادگەرییدا هەیە کە مەترسی بەهێزکردنی چەمکە دۆگمائی و تیژڕەوەکانە. هەڵبەت ئەم ڕوکارەی بونیادگەریی هێندەی پابەندی «بەکاربەر»ـی میتۆدەکەیە، پابەندی «بەکاربردن»ـی نییە، واتە هێندەی گرێدراوە بە کەسی بەکارهێنەوە بۆ میتۆد، نەبەستراوە بە خودی میتۆدەکەوە.

پرسیار دەربارەی پەیوەندی کایە فیکرییەکان یەکێکە لە کێشە سەنترالّ و ناوەندییەکانی دونیای مەعریفەت. لەم بوارەشدا هەمیشە پرسیارێک دووبارە و چەندبارە دەبێتەوە، دەربارەی «مانای قووڵی و سروشتی قووڵبوونەوەی مەعریفی». ئاخۆ قووڵبوونەوەی مەعریفی بریتییە لە گەڕانێکی بێوچان و قووڵبوونەوەیەکی ستوونی بە ناو یەک کایەدا، یاخود قووڵبوونەوە، پەلکوتان، بڵاوبوونەوە و پرد دروستکردنێکی ئاسۆییە لە نێو کایەکاندا؟. بەر لەوەی مرۆڤ هەوڵی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، دەبێت وەڵامی پرسیارێکی سەرەکی و گرنگی دیکە بداتەوە. ئەویش ئەوەیە: ئاخۆ بۆ ئەوەی لە چۆنێتی کایەیەک تێبگەین، دەبێت تەنیا بە میتۆد و گووتارە ناوخۆییەکانی ئەو کایەدا بچینەوە، یاخود بە پێچەوانەوە، چۆنێتی هەر کایەیەک لەڕێگای پەیوەندی بە کایەکانی دیکەوە ئاشکرادەبێت؟ وەک ئەوەی بپرسین ئاخۆ ئەدەبیات تەنیا بە ئەدەبیات تەفسیردەکرێت، یان ئەدەبیات بە کۆمەکی کۆمەڵێک دراویی میتۆدی و فیکری دیکە کە لە دەرەوەی ئەدەبیاتەوە دەهێنرێن دەخوێنرێتەوە؟.

بەڕای من وەڵامی ئەم پرسیارە ئەگەرچی گەلەک سەختە، بەڵام بایەخێکی بێوێنەی هەیە، بۆ دیاریکردنی ستراتیژی ئیشکردن لەڕۆشنبیریی کوردیدا. گەر باوەڕمان هێنا ئیشکردن لە ناو یەک کایەدا گرنگترە لە توانای هەڵسوڕان و جوڵاندنەوە لە ناو زیاد لە کایەیەکدا، واتە باوەڕ بەوە دەهێنین تایبەتمەندێتی و تەخەسوس، گرنگترن لە پەلکوتان و فرەگەرایی مەعریفی. باوەڕ بەوە دەهێنین قووڵبوونەوە، مانای ڕۆچوونێکی ستونی بە ناو کایەیەکدا نەوەک هاتوچۆ و گەڕان بە شێوەی کۆچەرییەک «نۆمادێکی» دۆلۆزیی، لە ناو تۆڕێکی گەورەی زانیاریدا کە مرۆڤ ئازادانە لە ئاستێکیاندا سەردەکەوێت و لە جێگایەکی دییەوە سەر دەردەهێنێت. تایبەتبوون «تەخەسوس»، بەگشتی، وەک کێشەیەک کە لە ناو مێژووی مەعریفەی مۆدێرندا سەرهەڵدەدات، بەڵگەو بەهانەی خۆی هەیە. یەکێک

لە هەرە گەورەترین بەهانەکانی ئەوەیە کە فراوانبوونی کایە زانستییەکان و دابەشبوون و گەورەبوونی دەریائاسای لکە مەعریفییەکان بە ئەندازەیەک گەورەیە دەرچوون لە تایبەتبوون، واتە ونبوون و بێئاراستەیی و نەدۆزینەوەی ڕێگا. لایەنگرانی تایبەتبوون، زانستە ڕاستەقینەکان بەو زانستانە دەبینن کە بە میتۆدی تایبەتی و کەرەستەی تایبەتی ناو کایەکان خۆیان بەرهەمدێن، لێرەوە ڕایان وایە تێزی لاهوتییەک لەسەر ماتماتیک هیچ نرخێکی نییە و قسەی ماتماتیکناسێکیش لەسەر ئەخلاق، هەمانشێوە ناچیز و بێبەهایە و لادانە لە لۆژیکی تایبەتبوون، ڕەوتی مێژووی زانستیش وەک مێژووی جیابوونەوەی کایەکان دەبینن لەیەکدی، گێڕانەوەی کایەکانیش بۆ ناو یەک وەک گەڕانەوەیەک لە زانستەوە بەرەو میتافیزیک تەماشادەکەن. بەڵام لەگەڵ ئەم لۆژیکە بەهێزەدا، مەترسیگەلێکی گەورە لەڕێگای ئەم تێڕوانینەدا هەیە. تایبەتبوون هەمیشە مانەوەیە لە ناو یەک کایەدا، گرتنی ڕێگایەکە و ڕۆیشتنە بە نێویدا، بێئەوەی بزانین لە دەرەوەی ئەو ڕێگایە چیتر هەیە، وردکردنەوەی مەعریفەیە بۆ چەند یەکەیەک کە کۆکردنەوە و پێکەوە گرێدانیان نەکردە دەنوێنن، پچڕانی پەیوەندییە لە نێوان دەرەنجامە جیاوازەکاندا، ونکردنی ئەو نیگا و تێڕوانینە گشتییەیە کە وادەکات بزانین لە ناوکۆییەکاندا «واتە لە سیاقات دا» دەکرێت چی دی دەرەنجام بهێنین، چونکە دواجار ئەوەی بایەخی زانست دەستنیشاندەکات دەرەنجامە وردەکان نین، بەڵکو ئەو تێگەیشتنە گشتییەیە کە دەتوانین لە کۆی چالاکی مەعریفی مرۆڤەوە بەدەستی بهێنین.

بەڵام ئەمە سروشتی کێشەکەیە وەک لە خۆرئاوا دەردەکەوێت. بۆئەوەی بزانین کە سروشتی ئەم کێشەیە لە دونیای ئێمەدا چۆنە دەبێت بە دیوێکی دیکەدا بڕوانین.

سەرەتا دەبێت بپرسین: تایبەتمەندبوون لەڕۆشنبیریی کوردیدا چییە و سوود و زیانەکانی چیین؟. تایبەتبوون لەڕۆشنبیرییەکدا کە توانای بەرهەمهێنانی کایەی نییە، دوو واتای هەیە یان ئەوەیە تایبەتمەندبوون دەبێت لەو کایە کولتوورییەدا کە تا ئێستا بەرهەمهاتووە، واتە ئیشکردن

دەبێت لە ناو کۆی ئەوڕووبەرەدا کە تا ئەمڕۆ لە شێوەی کتێب و نوسراودا هەمانە. یاخود تایبەتمەندبوونێکی ئەکادیمی دەبێت لە یەکێک لە بوارەکاندا، بەو جۆرەی کە خوێندنی زانکۆ و خوێندنی باڵا لە هەندێک بواردا فەراهەمیدەکەن. واتە یان تەخەسوسێکی ئازاد دەبێت لە بواری مێژوو و ئەدەبیاتی کوردیدا، وەک لای کەسانی وەک عەلادین سوجادی و مەلا عەبدولکەریمی مودەرس و مەسعود محەمەد و هەندانی دیکە دەیبینین. یان تەخەسوسی ئەکادیمی دەبێت لەڕێگای خوێندنی زانکۆ وە لە بوارێکی مەعریفی یان فەلسەفیدا، وەک ئەوەی لە ماوەی سی ساڵی ڕابوردوو نەوەیەک لە کۆمەڵناس و دەروونناس و ئەدەبناس و مێژووناسی ئەکادیمی لە زانکۆکان دەرچوون. پرسیارەکە ئەوەیە ئاخۆ بەردەوامبوون لەسەر ئەم سیستمی بەرهەمهێنانی تایبەتمەندانە، بە قازانج یان زیانی فەرهەنگی کوردییە؟ بەڕای من هەر دووک ئەم تایبەتمەندبوونە، دوو تایبەتمەندبوونی پڕ کێشەن کە زیانیان لە قازانج زۆرترە. لایەنی یەکەم: تا ئێستا کۆی ئەو بوارەی کە دەشێت بە ناوی تەخەسوس لە بواری ئەدەبیات و مێژووی کورددا ناوببرێت، بوارێکە توانای دۆزینەوە و گەڕان و پشکنینی لە کایەی خۆیدا نییە و عەقڵێکی کلاسیکی تاک دیو و نیوچاو باڵی بەسەردا کێشاوە. خودی ئەم بوارە بە کەرەستەکانی خۆی، بەو میتۆدانەی لە مێژووی خۆیدا بۆ خۆخوێندنەوە بەکاریهێناوە نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی زانستێکی ئەدەبی یان مێژوویی کوردیانە بەرهەمبهێنێت. پسپۆڕانی ئەم بوارە کاریان لە بواری تەفسیر و تەحقیق و ساغکردنەوە تێنەپەڕیوە، دەرەنجامی کاری ئەم تایبەتمەندانە ڕاوەستانێکی لەمێژینەی لە بواری ئەدەبیات و مێژووی ئێمەدا دروستکردوە، کە دەرەنجامی خواستی دەرنەچوونە لەو شێوازە لە تایبەتمەندێتی کە لەسەرەتاوە هاوڕێی ئەدەبیاتی ئێمەبووە. هۆی سەرەکی ئەم نوشوستییە ئەوەیە کە ئەو باسکارانەی لەسەدەی بیستدا لەم بوارەدا چالاکبوون، هەرگیز بواری چالاکی خۆیان بە زاراوە و کەرەستەی بوارەکانی دیکە موتوربە نەکردوە، لە باشترین حاڵەتدا جگە لەوەی کۆمەکیان لە تێکستە دینییەکان خواستووە بۆ تەفسیرکردنی هەندێک تێکست، ئاسەواری هیچ جۆرە

ئامادەگییەکی مەنهەجی لکە مەعریفی و زمانەوانییەکانی دیکە نابینین، لێرەوە دەشێت بە ئاشکرا ببینین کە هۆکارێکی گرنگی پاشکەوتن لە بواری خوێندنەوەی کەلەپووردا لەلای ئێمە، بێتواناییە لە بەگەڕخستنی میتۆد و کەرەستە و زاراوەی لکە مەعریفییەکانی دی.

لەوەش بگوزەرێین ڕاستە زانکۆکان بواری لەدایکبوونی هەندێک کەسی پسپۆڕ و تایبەتمەندیان بە ئێمە بەخشیوە. بەڵام لە نێوان ئەو زانستانەدا کە لە زانکۆ دەخوێنرێن و گۆڕینی ئەم زانستانە بۆ کەرەستەی تێڕامان و تیوریزەکردنی واقیعی کوردی خۆی، هێشتا دیوارێکی گەورە و ئەستوور هەیە. ئەوەی تا ئەمڕۆ لە زانکۆکان وەک ژێرخانی ئەکادیمی دەخوێنرێت، نابێتە ژێرخانێکی تیوری بۆ داڕشتنی زانستێکی تایبەت بە کێشەکانی مرۆڤی کورد خۆی. کۆمەڵناسەکانی ئێمە، لە زانکۆ تەخەسوس لە کۆمەڵناسییەکی گشتیدا وەردەگرن کە وەرگێڕانی زانیارییەکان و میتۆدەکانی بۆ کارپێکردن لە دونیای کورد خۆیدا هێشتا ئەگەرێکی دوورە. لێرەوە زانکۆکان سوودێکیان بە پرۆسەی داڕشتنی کایەی زانستی کوردیی نەگەیاندووە، لە زانکۆکاندا بیرۆکەکان دەناسرێن، زانیارییەکان کۆدەکرێنەوە، بەڵام کایەکان تەنیا کاتێک دروستدەبن کە توانای تیوریزەکردن بەو چەمکە ئەکادیمیانە دروستبووبێت، لەمرووەوە تا ئێستا فەرهەنگی ناو زانکۆ نەبۆتە زانستێک جورئەتی تیوریزەکردنی دونیای کوردیی هەبێت. تەخەسوس لێرەدا لە سنووری تایبەتبوون لە کتێبەکانی ئەکادیمیاوە ناپەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندبوون لە کێشە فەرهەنگی و بونیادییەکانی ناو عەقڵ و واقیعدا. ئەم جۆرە لە پسپۆڕگەرایی نەوەیەکی دروستکردوە ڕۆڵیان لەڕۆڵی مامۆستاوە نەگوازراوەتەوە بۆڕۆڵی بیریار، لەڕۆڵی باسکارێکی سادەوە کە زانیاری دەگوازێتەوە نەبۆتە ڕۆڵی تیوریزەکار کە واقیع دەخوێنێتەوە. لێرەوە گەورەبوونی ژمارەی دەرچووانی زانکۆکان لەلای ئێمە لە گەورەکردنی ڕووبەری دۆزینەوەدا ڕەنگی نەداوەتەوە. تا ئێستا ئەکادیمیا هێندەی فەرمانبەر و موچەخۆر دروستدەکات کایەی فەرهەنگی دروستناکات.

هەردووک ئەمجۆرە تایبەتمەندبوونە کە لە دونیای ڕۆشنبیریی ئێمەدا باڵادەستن، گەیشتوونەتە بونبەست. گەر دەمانەوێت لەو قەیرانە دەربازبین دەبێت ئامادەگی ئەوەمان تێدابێت کێشەکە لە بنەوەڕا بە جۆرێکی دیکە تەماشابکەین. پەیوەندی نێوان «تەخەسوس و کۆزانی» کە هەندێکجار وەک دوو پۆڵی پێچەوانە تەماشادەکرێن هیچ نییە جگە لە هەڵەیەک کە ئێمەی بەم دۆخەی ئێستا گەیاندووە، لە پرۆسەی بیرکردنەوەدا مرۆڤ دەبێت لە هاتوچۆیەکی بەردەوامدا بێت لە نێوان کۆزانین و تەخەسوسدا، لە نێوان مەعریفەتی گشتی و مەعریفەتی وردەکاردا، لە نێوان کایەی خۆی و کایەکانی دەرەوەدا. بۆئەوەی زیاتر مەبەستەکەم ڕوونبکەمەوە لێرەدا سێ پرۆسەی سەرەکی جیادەکەمەوە کە گرنگن بۆ هەر کردارێکی مەعریفی: پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاریی، پرۆسەی ئیشکردن لە ناو زانیاریدا، پرۆسەی سێهەمیش پرۆسەی ئیشکردنە بە زانیاری، واتە گۆڕینی زانیارییە بۆ کەرەستەی بەرهەمهێنانی زانیاری دیکە.

لەڕۆشنبیریی ئێمەدا، هەر سێ ئەم پرۆسەیە بە سێ ئاقاری سستدا دەڕۆن، هۆکاری سەرەکی ئەو سستیەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تێگەیشتنە دژوارەی ئێمە لەسەر تایبەتبوون هەمانە. پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاری لای ئێمە لە ژێر ڕەحمەتی ئەو تێگەیشتنە تەقلیدی و دژوارەماندا بەڕێوەدەچێت کە بۆ تایبەتبوون و تەخەسوس هەمانە. تا ئێستا ڕۆشنبیریی ئێمە، خۆی لە جوغزێکی بچوکدا دیلدەکات و سنووری کۆکردنەوەی زانیارییەکانی لە هەرێمی هەندێک مادە و هەندێک سەرەنجی گشتی تێناپەڕێت. بۆ نمونە، کە نوسەرێکی ئێمە لەسەر شاعیرێکی وەک پیرەمێرد دەنوسێت، سنووری ئیشکردنی خۆی و ستراتیژی کۆکردنەوەی زانیاریی لەلای ئەو، لە سنووری کەڵەکەکردنی زانیاری لەسەر پیرەمێرد و شیعرەکانی تێناپەڕێت، ئیشەکەی لە ناو ڕۆحێکی ئەرشیفیدا نوقمدەبێت و لەویادا دەست پێدەکات و هەر لەوێشدا دەمرێت. ئیشەکەی برای کۆچکردومان کاک ئومێد ئاشنا لەسەر پیرەمێرد، ڕەنگە دەلیلێکی گرنگی ئەو شێوازی کارکردنە بێت. لە ماوەی ساڵانی پێشوودا من هەتا یەک باسم لەسەر کلاسیکیاتی ئەدەبی ئێمە نەخوێندۆتەوە، کە لە سنووری

کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر شاعیر تێپەڕیبێت و لە تەفسیری ڕاستەوخۆی مانای شیعرەکان زیاتر ڕۆیشتبێت. تەخەسوس لای ئێمە لە پیرەمێرددا بە ناو شارەزایی و تێگەیشتندا لە چۆنێتی شیعر و تیورییەکان و مێژووی شیعردا تێنەپەڕێوە، بە سەر ئەو پردانەدا ڕانەبوردووە کە شیعر بە مێژوو، یان فەلسەفە یاخود کۆمەڵناسی یاخود هەر لکێکی دیکەی مەعریفییەوە گرێدەدەن، لێرەوە تەخەسوس لە پیرەمێرددا هەرگیز هاوڕێ نەبووە بە پشکنینێکی قووڵی دونیای شیعر خۆی، یان گەڕانەوەیەکی فیکری نەبووە لە تێرم و تێزێکی فیکرییەوە بۆ ناو شیعر، دۆزینەوەی نزیکی و دووریی جیهانبینی شیعری نەبووە لەگەڵ جیهانبینییە فیکری و فەلسەفییەکانی دیکەدا. ئەم کارەساتە لە ئاستی ئەکادیمیا و دەرەوەی ئەکادیمیاشدا وەک یەکە، زۆربەی ئەو نامەی ماجستێر و دکتۆرایانەی لەسەر شیعری کوردی نوسراون، بەدەست هەمان کێشەی داخران و سنووربەندی میتۆدییەوە دەناڵێنن... پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاری لەڕۆشنبیریی ئێمەدا، هێشتا بەڕێگایەکی سادە و سانا و سەرەتاییدا دەڕوات، کە لەگەڵ سەختی و قووڵبوونەوەی زانستەکاندا تەبا و گونجاو نییە. بۆئەوەی چیتر لە پیرەمێرد تێبگەین، بەس نییە ئەرشیفی پیرەمێرد بدۆزینەوە، ژیانی بزانین، بەڵکو پێویستە شتێکی زۆر زیاتر لەسەر فەلسەفەی زمان و میتۆدە نوێکانی ڕەخنە و شێوازە تازەکانی سۆسیۆلۆژیای ئەدەب و فەلسەفەی ئەدەب بزانین. ئەم شێوازەی ئەمڕۆ لە زانکۆکانی کوردستاندا دەیبینین، کارئاسانییەکی گەورەیە کە کەسانێک ببنە پسپۆڕ لە بواری ئەدەبیاتدا، کە هێشتا زانیاریی سەرەتاییان لەسەر خودی ئەدەبیات نییە. بۆ نمونە ناکرێت لە ئەدەبی کوردیدا پسپۆڕبیت و هیچ لە ئەدەبیاتی دونیا نەزانیت. بەڵام ئەو تەماشا ڕووکەش پەرستە بۆ مەسەلەی تەخەسوس وایکردوە، زانکۆکانی ئێمە و دەزگا ڕۆشنبیرییەکانمان پڕبن لە کەسانێک کە دکتۆرایان لە شاعیرێکی کورددا هەیە، بێئەوەی کەمترین زانیاریان لەسەر هیچ ڕێباز و میتۆدێکی فەلسەفی و ئەدەبی ئەم دونیایە هەبێت، خەڵکانێک ببن بە هەڵگری دکتۆرا لە قانعدا بێئەوەی وشەیەک لەسەر تیورە سەرەتاییەکانی ناسیونالیزم بزانن، ببنە خاوەن دکتۆرا لە گۆراندا و

کەچی وشەیەک لەسەر فەلسەفەی مۆدێرنە و ئاڤانگاردییەتی ئەدەبی نەزانن... بەڕای من ئەم کارەسات و مەرگەساتە فیکرییە کە ئەمڕۆ دونیای ئێمەی تەنیوە، ڕیشە قووڵەکەی لەو جۆرە تەماشاکردنەی تەخەسوسدا بنجبەستە، ئەو تێگەیشتنە دژوارەیە بواریکردۆتەوە نەزانین ئاسان بخزێتە دونیای ئەکادیمی ئێمەوە. پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاریی، تا ئێستا لە دونیای ئێمەدا پرۆسەیەکی سەرەتایی و نازانستییە.
بۆئەوەی بتوانین ڕیفۆرمێکی قووڵ لە بواری خوێندنەوەی ئەدەبیات و مێژووی خۆماندا پیادەبکەین، دەبێت دەستکارییەکی قووڵی سیستمی کۆکردنەوەی زانیاری بکەین. لەسەرەتای سەدەی بیستدا کە خوێندنەوەی ئێمە بۆ ئەدەبیاتی خۆمان دەست پێدەکات، کە هەستدەکەین دەبێت مێژوویەک بۆ ئەو ئەدەبیاتە دابڕێژین، ئەو هەوڵانەی دەدرێن هێشتا سەرەتایین و لە جیهانێکەوە سەرچاوەدەگرن پەیوەندی کولتووری و مەعریفی بەدەرەوەی خۆی زۆرکزە، واتە کەرەستەکانی پەیوەندی نەگەیشتوون و پردەکانی پەیوەندی هێشتا نەکراونەتەوە، لێرەوە ئاساییە مێژووی ئەدەبیاتی ئێمە، بە میتۆدێکی پۆلێنکاری سەرەتایی دەست پێبکات «وەک لای سەجادی دەیبینین»، بەڵام ئاسایی نییە ئەمڕۆ ئێمە هێشتا لەو جوغزە دەرنەچووبین. قوتابیانی ئێمە تا ئێستا دەتوانن بێئەوەی شارەزای ئەدەب بن، ببن بە شارەزای ئەدەبی کوردی، بێئەوەی هیچ لە فەلسەفەی مێژوو بزانن، ببن بە پسپۆڕ لە مێژووی کوردیدا، بێئەوەی شتێک لە تیورە فیکری و سیاسییەکان بزانن، ببن بە پرۆفیسۆر لە بواری خوێندنەوەی بزاوتی سیاسی کوردیدا، ئەمەش کۆمیدیایەکی بێئەندازەڕەشە، کە واقعی ئەدەبیات و ئەکادیمیای ئێمە بەدەستییەوە دەناڵێنێت. تەخەسوس لە بواری ئەدەبیاتی کوردی و مێژووی کورددا وەک لکێک خۆی لە تەخەسوس لە ئەدەب و مێژوو جیاکردۆتەوە، لێرەوە ئەو دەرفەتە دروستبووە کەسانێک دکتۆرا لە گۆران یان مەحویدا وەرگرن، کەچی هیچ شتێک لە شیعر نەزانن.ڕاستکردنەوەی ئەم هاوکێشەیە، پێویستی بە هەڵتەکاندنی ئەو بۆچوونەمان هەیە دەربارەی تایبەتبوون.
جیاکردنەوەی خوێندنەوەی ئەدەبیاتی ئێمە لە تیورییەکانی ئەدەب، لە

بۆتیکا، لە سۆسیۆلۆژیا و فەلسەفەی ئەدەب، کارێکی نەکردەیە. بۆئەوەی بتوانین لەسەر ئەدەبی کوردی خۆی ئیشبکەین، دەبێت لەسەر گەورەکردنی قەوارەی زانیارییەکانمان کاربکەین. ئەوەی ژیانی رۆشنبیریی ئێمەی ئیفلیجکردوە، نەبوونی پرۆسەیەکی مەنهەجی کۆکردنەوەی زانیارییە. دیارە رۆشنبیریی لە بنەڕەتدا لەرێگای کۆکردنەوەی زانیارییەوە دروستنابێت، بەڵام لەرێگای کۆکردنەوەی زانیارییەوە دەست پێدەکات، واتە هەررۆشنبیرییەکی دونیا کێشەی لەم وێستگە سەرەتاییەدا هەبوو، ئەوا کێشەیەکی بونیادی قووڵ و گەورەی هەیە، گەر ئەم کێشەیە سروشتێکی ئەکادیمیشی وەرگرتبێت وەک لە ئێستای کوردستاندا دەیبینین، ئەوا مانای چۆتە ئاستی قەیرانێکی کوشندەوە. بەبڕوای من بەبێ دروستبوونی توانایەکی مەعریفی کە بشێت لە نێو کایەکاندا هاتوچۆبکات، کەرەستەی کایەکان لە ناو یەکدا بگوازێتەوە، هێزی هەبێت دەرەنجامە فیکرییەکانی بوارێک لە بوارێکی دیکەدا بخاتەوە کار، ناتوانین لەم تارماییە ترسناکەی تایبەتبوون رزگارمان ببێت. تایبەتبوون ئەوە نییە بەکۆمەڵێک میتۆدی پۆڵین و وەسفی سەرەتایی بەرەنگاری کێشەیەک ببینەوە، ئەوەیە بە هەمەڕەنگی کەرەستەکان و کەڵەکەکردنی زانیاری جیاواز و ئەزموونکردنی پرۆسێسی مەعریفی جودا جودا بەسەر یەک دیاردەدا، بەرابەر کێشەیەک بوەستینەوە. تەخەسوسی ڕاستەقینە بەگەڕخستنی کۆمەڵێک کەرەستەی جیاوازە لە شیکردنەوە و خوێندنەوەی یەک دیاردەدا، تایبەتبوون داخستنی سنووری کایەیەک نییە لەڕووی کار و دەرەنجام و زاراوەی کایەکانی تردا، بەڵکو نیشانەگرتنەوەیە لە یەک مەبەست لە گۆشەی جیاواز جیاوازەوە. بۆ نمونە تایبەتبوون لە هونەردا ئەوەیە کە دواجار بتوانین میتۆدە جیاوازەکانی تەفسیر لە خوێندنەوەی هونەردا بخەینەگەڕ، پسپۆڕی بواری هونەر کەسێک نییە کە پەیوەندی بە مێژوو و دین و سایکۆلۆژیا و فەلسەفەوە نەبێت، وەک لە جیهانی ئێمەدا باوە، بەڵکو کەسێکە دەتوانێت هەموو ئەو کایانە بۆ تێگەیشتن لە هونەر چالاکبکات. تایبەتبوون بریتییە لە توانای پەلکشان بۆ جێگاکانی دی و هێنانەوەی دەرەنجامەکان بۆ کایەی خۆت. لێرەوە کایەیەکی زانیاری و

ئەدەبی بوونی نییە پێویستی بە کایەکانی دی نەبێت، پێویستی بە گەشت نەبێت لە ناو بوارە مەعریفییەکانی دیکەدا... قووڵبوونەوە بریتی نییە لەوەی دەرگای کایەیەک دابخەین و شورا بەدەوری ئیشکردن و دەرەنجامەکانیدا بکێشین، بەڵکو بە پێچەوانەوە تایبەتبوون بریتییە لەدروستکردنی دەستێکی مەعریفی لە ناو کایەیەکدا بتوانێت پەلبهاوێت و لە جێگای دیکەوە کەرەستەی بیرکردنەوە و هەڵکۆڵین بگوازێتەوە بۆ ناو کایەی خۆی. هیچ کایەیەکی زانستی یان ستاتیکی نییە پێویستی بە چاوێکی دیکە نەبێت، لەدەرەوە بێت و کۆمەڵێک ڕەهەندی نهێنی ناو خۆی بۆ ئاشکرابکات.

ئەم قۆناغە سەرەتاییەی ئیشکردنی مەعریفی لە دەرەوەی لۆژیکی تایبەتبوون دەست پێدەکات. بەڵام لە قۆناغی دواتردا قۆناغی ئیشکردن لە ناو زانیارییەکاندا، شتێک لە تایبەتبوون نزیک دەبینەوە، بێئەوەی لە ناو هیچ کایەیەکدا نوقمبین، لەم قۆناغەدا کەرەستەکانی دەرەنجامهێنان و بیرکردنەوە دەخەینە بەر ئەزموونە سەرەتاییەکانی کارکردن، ئەو زاراوانەی لە جێگای دییەوە دەیانهێنین، ئەو چەمکانەی لە شوێنی تر قەرزیاندەکەین هەوڵدەدەین لە ناو سیستمێکی فیکری دیکە و لە جێگایەکی تردا تاقیانبکەینەوە، بەبێ ئەم قۆناغە، پرۆسەی بەرهەمهێنانی مەعریفی ناتوانێت بگاتە هیچ ئەنجامێک، مرۆڤ ناتوانێت دەرەنجامی ئامادەگی هیچ فیکرێک لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی دی بگوازێتەوە، بەڵکو دەتوانێت میتۆدەکانی کارکردن و تێڕامان تاقیبکاتەوە و بیانخەیتە سەر شێوەیەک بشێت ببنە کەرەستەی بیرکردنەوەی خۆی. هەڵەی هەرە گەورەی مارکسیستەکانی خۆرهەڵات ئەوەبوو کە لەبری میتۆدەکانی کارکردن، دەرەنجامە ئایدۆلۆژییەکانی مارکسیزمیان دەگوازتەوە، واتە لە مێژووی مارکسیزمی خۆرهەڵاتیدا، قۆناغی ئیشکردن لەسەر چەمکەکان خۆی بوونی نەبوو، لێرەوە نوشوستی مارکسییەت لە دەڤەری ئێمەدا بەرلەوەی نوشوستێکی ئایدۆلۆژی بێت، نوشوستێکی مەعریفییە، دەرەنجامی ئیشنەکردنە لە ناو چەمکەکان و زاراوەکان خۆیاندا. ئەمڕۆ هەمان هەڵە لە ژیانی ئەکادیمی ئێمەشدا دووبارەدەبێتەوە، کاتێک

دەبینین لە زانكۆكاندا قوتابخانە فیكرییەكانی خۆرئاوا زۆر ڕوكەشگەرا و سەتحییانە دەخوێنرێن، بێئەوەی ئیشێكی ناوخۆیی و لۆكاڵیانە بكرێت بۆ دروستكردنی پردێك لە نێوان گووتەزای كایە ئەكادیمییەكان و زەمینە واقیعییەكانی ئێمەدا. قەیرانی گەورەی زانكۆكانی كوردستان و برێكی گەورەی ئەو ئەكادیمیستیانەی كوردیش كە لە زانكۆكانی دیكەی دونیادا دەخوێنن، ئەوەیە كە پرۆسەیەكی ئیشكردن و لۆكاڵاندنی زانستەكان لە گۆڕێ نییە وابكات، زانستە ئەكادیمییە موجەرەدەكان ببن بە كەرەستەی ئیشكردن لە دونیای كۆنكرێتی ئێمەدا. واتە ئێمە بە زەحمەت لە قۆناغی كۆكردنەوەی زانیارییەوە دەچین بۆ قۆناغی ئیشكردن و گونجاندن و هەڵبژاردنی زانیارییەكانمان بە جۆرێك ڕەهەندی پراكتیكیان بەهێزبكات و بیانگۆڕێتە سەر كەرەستەی تەفسیركردنی مەنهەجی بۆ دونیای ئێمە. بەڕای من گرنگ نییە بە تەنیا زانیاری تەواومان لەسەر ئەركیۆلۆژیای فۆكۆیی، یان تەفسیریی ئۆدیبی فرۆیدی یاخود واقیعی فیرتوئێلی بۆدریارد یان هۆمۆساكەری ئاگامبن یان هەر تێزێكی دی هەبێت، بەڵكو گرنگ ئیشكردنە لە ناو ئەو چەمكانەدا بە جۆرێك ڕەهەندی پراكتیككردنیان بەرابەر دونیای ئێمە و واقعی ئێمە تێدا بەهێزبێت. گرنگ دۆزینەوەی ئەو تەوەر و ڕێگایەیە كە وادەكات چەمكێكی گرنگی فیكری خۆرئاوا ڕۆڵێكی گرنگ لە خوێندنەوەی كێشەیەكی ئێمەدا ببینێت. تایبەتبوون و تەخەسوسی تەسك دەرفەت بەم گوازتنەوەیە نادات، تەخەسوس لە دونیای ئێمەدا لە باشترین حاڵەتدا لە سنووری وەرگرتنی زانیارییەكاندا دەوەستێت، تەخەسوس جۆرە جوڵەیەكی بەرتەسك و فەنتازیایەكی بەرتەسكی كردۆتە ڕۆحی باسكارانی ئێمەوە كە نەوێرن لە دەرەوەی بوارەكانی خۆیان بجوڵێنەوە و فەنتازیای مەعریفی تێدا كوشتوون. لێرەوە لە ئەكادیمیاكانی ئێمەوە قسەیەك و تێزێك نایەتەدەرێ گرنگ بێت و كۆمەكمان پێبكات باشتر لە واقیع تێبگەین، چونكە لە بنەڕەتدا بۆئەوەی پەیوەندی تیورە و پراكتیك بەهێزبكەین پێویستمان بەوەیە لە لۆژیكی تەسكی تایبەتبوون دەربازبین و لە نێوان دونیای ئێمە و چەمكە نامۆكاندا پردێك دروستبكەین. بەبێ ئەم پرۆسەیە لەدایكبوونی

زانستێک لەگەڵ کێشەکانی کورددا دەرگیربێت و قاچیشی لە فیکر و زانستی نوێ نەبڕیبێت، نەکردەیە. زانیارییەک قووڵ ڕیشەی لە ناو فیکری مۆدێرندا نەبێت، لە ئاگاییەوە لەو فیکرە سەرچاوەی نەگرتبێت، نرخێکی ڕاستەقینەی نییە، بەڵام زانیارییەکیش بەشی ئەوە کاری لەسەر نەکرابێت، ڕەهەندە پراکتیکییەکانی بەهێز نەبووبێت بکرێت دونیای خۆمانی پێبخوێنینەوە، ئەویش نرخێک و بەهایەکی گرنگی نییە.

تەنیا لە سێهەمین ئاستدا دەکرێت مرۆڤ ·بێترس قسە لە تایبەتبوون بکات، ئەو قۆناغەی تێیدا زانیاریی و ئەزموونی میتۆدی و زەخیرەی زاراوەیمان بەکاردەهێنین بۆ بەرهەمهێنانی زانیاری بەرابەر بە کێشەیەکی تایبەتی لە بوارێکی تایبەتیدا. تەخەسوس شتێک نییە لەسەرەتای کاری مەعریفیدا دەست پێبکات، بەڵکو ئاڕاستەکردنی دەرەنجامەکانی نێو پرۆسەیەکی دوورودرێژە، بە جۆرێک لە ناو کایەیەکدا بگیرسێتەوە و لەڕوونکردنەوەی کێشەیەکدا چالاک بێت. تایبەتبوون بریتییە لەبەگەڕخستنی زانیارییە تایبەتی و گشتییەکانی ناو کایەیەک بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی مەعریفی، بۆئەوەی بشتوانین لە هەر کایەیەکدا زانیاری نوێ بەرهەمبهێنین، دەبێت بتوانین لە ناو ئەو کایەیەدا بەرەنجامی کارکردنی بوارەکانی دیکە و فەرهەنگەکانی دیکە بچێنین. واتە تەخەسوسی ڕاستەقینە لەوەوە دروستدەبێت کە لە مەرجەعییەتدا یۆنفرسال و گەردونگەرا و فرەسەرچاوەبین، بەڵام لە پراکتیکدا لۆکاڵ و کێشەدۆز و تیشکۆکاربین. مەبەستم لە کێشەدۆزی ئەوەیە زانیارییەکانی خۆمان بۆ دۆزین و پشکنینی کێشەیەک بەگەڕبخەین، مەبەستیشم لە تیشکۆکاری ئەوەیە هێزی چڕکردنەوەی پرۆسە پراکتیکییەکەمان لە سەر خاڵێکی دیاریکراو هەبێت. کەواتە تایبەتبەتبوون بریتییە لە چڕکردنەوەی مەعریفەتێکی پەرت لە پرۆسەی تێڕاماندا لە کێشەیەکی دیاریکراو. بەبێ ئەو مەعریفە پەرتە گەیشتن بە ساتی چڕکردنەوە ئەستەمە، بەبێ چڕکردنەوەش هەر مەعریفەتێک لە عەرەب و فارس و خۆرئاوا وەریدەگرین، بۆ تێگەیشتن لە کێشەکانی دونیای کورد سوودێکی ئەوتۆی نییە. چونکە دواجار مەعریفەت بریتییە لە کۆکردنەوەی کۆمەڵێک ڕوناکی

لە پێناوی دروستکردنی گورزەیەک تیشکدا کە ئاڕاستەی تیشکۆیەکی تایبەتی دەکەین، تا لەوێدا تاریکی ناوەوەی گرفتێکی پێ بخوێنینەوە. واتە تەخەسوس ئەوە نییە لە ناو کێشەیەکدا دەست پێبکەین و لەویاشدا بمرین، تەخەسوس ئەوەیە دوور لە کێشەیەک دەست پێبکەین و لە زیاد لە جێگایەکدا بجولێین و بە زیاد لەرێگایەکدا بڕۆین تا لەوێوە دەگەینە سەنتەرێکی دیاریکراو، دواتریش بە زانیاریی نوێوە لەو سەنتەرە دێینە دەرێ بۆ ئەوەی بەرەو جێگایەکی دیکە بڕۆین. ئەو عەقڵە پسپۆڕانەی ئەکادیمیا و خوێندنی ئەکادیمی بەگشتی بۆ کوردی دروستیکردوە، عەقڵگەلێکن لە جێگایەکدا لەدایکدەبن و دواتر ناتوانن بە هیچ ڕێگایەکی دیکەدا بڕۆن. لێرەوە ئەوانەی دکتۆرایان لەرێزماندا هێناوە، توانایان نییە لەسەر فەلسەفەی زمان قسەیەک بکەن، ئەوانەی دکتۆرایان لە گۆراندا هێناوە ناتوانن بە دوو دێڕ لەسەر ئەزموونی شێرکۆ بدوێن، یان هەر لەدەرەوەی ئەو باسانەی بۆ وەرگرتنی شەهادەکانیان دەینوسن توانایان نییە دواتر نوسینێکیان هەبێت. ئەمانە جگە لە مامۆستا، وە زۆرجار مامۆستای خراپیش هیچ شتێکیان لێ دەرناچێت. تەخەسوسکارانی ئێمە لەو پیاوە گوندنشینە دەچن کە لە گوندەکەی خۆیدا لەدایکدەبێت و لەویاشدا دەمرێت، تووشی ئەو وەهمەش بووە کە گوایە چونکە هەرگیز گوندی خۆی جێنەهێشتووە، کەواتە دەتوانێت باشتر تێیبگات و بیبینێت، لەکاتێکدا تەخەسوسکاری ڕاستەقینە گەڕیدەیەکە لەوسەری دونیاوە بە ناو کۆمەڵێک دەڤەر و زەمینی جۆراوجۆردا دەڕوات و دواتر لادەداتەوە گوندەکەی خۆی، تەنیا ئەویش دەتوانێت باشتر گوندی خۆی ببینێت، چونکە تەنیا ئەو دەتوانێت ئەزموونی بینینی دونیا لەگەڵ ئەزموونی گوندی خۆیدا بەراوردبکات و تێکەڵاوییبکات، هەر ئەویش دەتوانێت گەر لە گوندەکەیدا گیایەکی جیاواز و درەختێکی ناوازە هەبێت، تۆوەکەی هەڵگرێت و بەرەو دونیا بگەڕێتەوەو و دووبارە دەستبکاتەوە بەسەفەر.

هەموو خوێندنەوەیەکی سەرەتایی بۆ مێژوودا دەبێت تێڕامانێکی قووڵیش بێت لە تێگەیشتنی ئێمە بۆ مێژوو. بەس نییە تەنیا مێژوو وەک حیکایەت بگێڕینەوەو بنوسینەوە، بەڵکو لەوە گرنگتر تێڕامانە لە شێوەی «تێگەیشتنی ئێمە لە مێژوو» وە شێوەکانی «نوسینەوەی مێژوو». ئەو بۆچوونەی کە مێژوو تەنیا وەک بەرهەمی کۆمەڵێک یاسای مێژوویی دەبینێت کە لەسەروو ئیرادەی فەردەوە دەجوڵێنەوە چیتر ئەو سیحرەی نەماوە کە لەسەدەی نۆزدە و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا هەیبوو، هیچ کەس ئەمڕۆ ناتوانێت هەندێک یاسا دیاریبکات و بڵێت «مێژوو لەسەر ئەم یاسایانە دەڕوات» و پەیڕەوکردنی ئەو یاسایانە ئێمە بەرەو بەهەشت دەبات. لە کاتێکدا پێکڕا پێویستیمان بە سەرهەڵدانی «هوشیارییەکی نوێ» بۆ «مێژوو» هەیە، دەبێت دڵنیابین ئەم هوشیارییە نوێیە لە ڕەخنەکردنی پرۆسەی «مێژوونوسینی» ئێستاکێمان و لە دیاریکردنی کەموکورتییە گەورەکانی بواری «مێژوونوسی» ئەمڕۆمان جیانابێتەوە. لێرەدا مەبەستمە شتێک لەسەر چییەتی و چۆنێتی قەیرانی تێگەیشتنی ئێمە لە مێژوو بدوێم. هەندێک لە دەردەکانی ناو کایەکە و کەموکورتییە کوشندەکانی دیاریبکەم، چونکە گۆڕان لە هوشیاریماندا بۆ پرۆسەی «مێژوونوسین» مەرجی سەرەکی گۆڕانە لە «هوشیاریماندا بە مێژوو». چونکە هوشیاریی مێژوویی نوێ، بەبێ مامەڵەکردنی تازە لەگەڵ مێژوو خۆیدا بوونی نییە، هەموو بەرخوردێکی تازەش لەگەڵ مێژوودا، تەنیا کاتێک مانای هەیە کە مێژوونوسێکی نوێ دروستبکات. بۆیە نەهاتنە مەیدانی نەوەیەکی نوێ لە «مێژوونوسان» دوای ڕاپەڕین و ڕوونەدانی بومەلەرزەیەکی گەورە لەم کایەیەدا، دەمانخاتە گومانەوە دەربارەی یەکێک لە گرنگترین کایەکانی نوسینی ئێمە، کایەیەک ناسیونالیزمی کوردی زۆر ئەرکی پێسپاردوە و زۆر خەونیشی لەسەر بونیادناوە. لەوەبەر لە وتاری «لەدەنگی زمانەوە بۆ بێدەنگی مانا» باسم لەو کێشانە کرد کە دەشێت

نەبوونی مێژوو بە زانستێکی سەربەخۆ بیخولقێنێت، لێرەدا لەسەر هەمان کێشە دەڕۆم و پتر ڕەهەندەکانی دەپشکنم. مێژوو بەو مانا ئەکادیمییەی ئەمڕۆکە لە فەرهەنگی ئێمەدا باڵادەستە، پتر لەوەی لە زانستەوە نزیک بێت لە حیکایەتەوە نزیکە. کەم باسی مێژوویی دەبینین ڕۆحی ئایدۆلۆژیا یان نەفەسی چیرۆکخوانی تێیاندا بەسەر دیدگای فەلسەفی و سۆسیۆلۆژیدا سەرنەکەوتبێت. مێژوو لە دیدی باسکارە ئەکادیمییەکانی کوردەوە ئەو بوارەیە کە خۆی بەڕاست و دروستی زانیارییەکانمانەوە دەربارەی ڕابوردوو خەریکدەکات. مێژوو وەک تێڕامان لە ئێستا و داهاتوو، لە تەماشاکردنی ڕۆحی ئەو بکەرانەی ئێستا لە کاردان شتێکی ئەوتۆمان پێ ناڵێت. تێگەیشتنی ئەکادیمیانەی ئێمە لە مێژوو، لە ئاست خوێندنەوەی مێژووی سیاسیدا گیریکردوە و دەمێ ساڵە ناچێتە پێشێ. مێژوونوسەکانی ئێمە جگە لە نوسینەوە و پێداچوونەوەی مێژووی سیاسی و گێڕانەوەی شتێکی دیکەیان نەکردوە. بە کورتی مامەڵەکردنی ئێمە لەگەڵ مێژوودا بەر دوو کۆسپی زۆر سەرەکی دەکەوێت، کە هەردووکیان پێکڕا وادەکەن مێژوو زانستێکی کاریگەر نەبێت. یەکەم: مێژوو وەک کایە بەجۆرێکی ترسناک و کورتبین و پاشکۆگەرا دوای سیاسەت کەوتووە و وە هەمیشە لە «گۆشەنیگایەکی سیاسی» دیاریکراوەوە «مێژوویەکی سیاسی» دیاریکراو دەنوسێتەوە و لە ئاست هەموو مێژووەکانی دیدا کوێرە. دووەم: مێژوو وەک کایە هیچ پەیوەندییەکی بە کایەکانی ترەوە دروست نەکردوە، بە تەواویی لە کۆمەڵێک کایەی ستراتیژی و بنەڕەتی بۆ تێگەیشتنی مێژوو دابڕاوە، کە ئەویش فەلسەفە و دەروونناسی و کۆمەڵناسییە، مێژووش بێ پەیوەندی بەو کایانەوە دەبێتە زانستێکی کوێر. بۆیە لێرەدا ناچارم کە جیاوازییەکی گرنگ بکەم لە نێوان نیگای «ئەرشیفدۆز» یدا بۆ مێژووی کوردی، بەرامبەر نیگایەکی دیکە کە تەواو پێچەوانەی عەقڵی ئەرشیفدۆز کاردەکات و بە میتۆدی « تیوریزەکردنی کایە » ناویدەبەم. دەڵێم نیگای «ئەرشیفدۆزی»، چونکە هەوڵی سەرەکی مێژوونوسە تەقلیدییەکان ئەوەیە کە مێژوو وەک زانست لە ئاستی مامەڵەکردن و بەدواداچوونی ئەرشیفی نوسراو و زارەکییدا

دیلبکەن و ئیشی مێژوونوس لە نوسینەوەی حیکایەتە مێژووییەکاندا بوەستێنن کە لە ئەرشیف و یادەوەریدا بەڵگە و ئاسەواریان هەیە. بۆئەوەی زیاتر مەبەستەکەم روونبکەمەوە دەبێت بەوردی لەسەر هەردوو زاراوەی «ئەرشیفدۆز»ـی و « تیوریزەکردنی کایە » لە مامەڵەکردنی مێژوودا بدوێم.

ئەرشیفدۆزی بەو جۆرەی لە رۆشنبیری کوردیدا دەیبینین بریتییە لەو جۆرە تێگەیشتنەی کە خوێندنەوەی مێژوو تەنیا و تەنیا بە رابوردووە وە گرێدەدات، لە مێژوودا بۆ حەقیقەتێک دەگەڕێت، پێیوایە ڕاستییەکان نەگووتراون و حیکایەتەکان بەتەواوەتی نەگێڕدراونەتەوە و وێنەی بکەرە مێژووییەکان وەک خۆی نەکێشراوە و یادەوەری مێژوویی ئێمە ونکراوە و بەشێکی سڕدراوەتەوە، پێشی وایە ئێمە دەبێت لە ناو ئەرشیفی دێرین و نوێدا، ئەرشیفی نوسراو و گووتراودا، لەناو مەتریالی نوسراو و یادەوەرییدا بۆ نهێنییەکان بگەڕێین و نەگووتراوەکان دەربهێنینەوە و شتەکان لەو دیدگایەوە بنوسینەوە کە گۆشەنیگای سەیرکردنی کوردی بۆ مێژوو نیشاندەدات. خولیای سەرەکی ئەمجۆرە تێڕوانینە بۆ مێژوو ئەوەیە وێنەیەکی تەواوکار و تەواوبین بۆ رابوردووی کورد دروستبکات، بزوێنیشی لەم نیازەدا ئەو ڕۆحە ناسیونالیستییەیە کە مێژوو بە شاهیدی هەرە گەورەی نەتەوە دەزانێت. پرۆسەی ئەرشیفدۆزی لای ئێمە هێندەی گەڕانە بۆ ئەو شاهیدە مێژووییە، تێرامان نییە لە خودی مێژوو. لێرەوە مێژوونوسی کورد خۆی وەک کەسێک نیشاندەدات کە لە ناو ئەرشیف و دەستنوس و کتێبی کۆندا نوقمبووە. زۆربەی وەخت ڕاوی ئەو شتانەدەکات کە ناوی کوردیان تیا هاتووە و لە تاریکی تێکستە کۆنەکاندا بۆ هەر تروسکەیەک دەگەڕێت، کە دێرینی کورد و گرنگی کورد و رابوردووی کورد نیشانبداتەوە. هەڵبەت ئەم پرۆسەی ئەرشیفدۆزییە بۆ خۆی کارێکی خراپ نییە گەر تەواو تەسلیمی ئەو لۆژیکە سادەیەی ڕۆحی ناسیونالیستی نەبایە و تەواوی ئیجتیهادی مێژوویی ئێمەی بەخۆیەوە سەرقاڵ نەکردایە. یەکێک لە مەترسیدارترین خاڵەکان لەم شێوە

تێڕوانینەدا خوێندنەوەیەتی بۆ مێژوو لەسەر ڕۆشنایی مۆراڵی ناسیونالیستیدا، فەرامۆشکردنێتی بۆ هەر شتێک کە خەیاڵی ناسیونالیستی نەجولێنێت، وە داتاشینێتی بۆ مێژوویەک کە پتر لەوەی مێژوویەکی ڕاستەقینە بێت، مێژوویەکی خەیاڵێنراو و بارگاویکراوە بە دیدی نوسەرەکان. بەڵام لە هەموو خاڵەکان ترسناکتر ئەوەیە کە «عەقڵی ئەرشیفدۆز» تێڕامانی تیوریی لە مێژوو دەکوژێت، واتە لەسەر ڕووکەش و توێژی دەرەکی مێژوو کاردەکات، خۆی لە تێڕامان لە ئێستا و داهاتوو دەپارێزێت، وەک ئەوەی مێژوو تەنیا زانستی تێڕامان بێت لەو ڕووداوانەی ڕوویانداوە، نەوەک زانستی خوێندنەوەی ئەو وزەو جوڵەیە بێت کە لە جەستەی کۆمەڵگادا دەجولێت. ڕەخنەش لە ئەرشیفدۆزی تەنیا لەو کاتەدا گرنگە کە بۆ تێپەڕاندنی تەواوی عەقڵییەتەکە بێت، زۆربەی ئەو دیالۆگ و گفتوگۆیانەی لە نێو مێژوونوسە ئەرشیفنشینەکاندا دەکرێت، بێسوود و بێزەنتییە، چونکە زۆربەیان بەشەڕهاتنن لەسەر چۆنێتی ڕووداوێک، چییەتی کاراکتەرێک، پاش و پێشی دەرکەوتەیەک، ساڵرۆژی ڕووداوێک، کێ یەکەم کەس بوو کە کارێکی کرد، کێ یەکەم نامەی نارد، کێ یەکەم بەیاننامەی نوسی، کێ یەکەم چیرۆکی نوسی و .... بەوجۆرە تا دوایی. بە کورتی عەقڵی ئەرشیفدۆز زیاتر لەگەڵ تەپوتۆزی مێژوودا مامەڵەدەکات، نەوەک لەگەڵ مێژوو خۆیدا. لەگەڵ پاشماوەکاندا، لەگەڵ پەراوێزدا، واتە لەگەڵ دەرەنجامەکاندا نەوەک لەگەڵ هێزە بزوێنەکاندا. کێشەکە بە تەنیا ئەوە نییە کە ئەم عەقڵییەتە مێژوو لە ڕوانگەیەکی مێژوویی تایبەتییەوە دەخوێنێتەوە، واتە تەواو لە ناو لۆژیکی تەماشاکردنی خۆیدا دیلە و ناتوانێت گومان لە بیرکردنەوەی خۆی بکات، واتە گرفتی هەرە سەرەکی تەنیا ئەوە نییە کە شوێنگە و ساتەوەختە مێژووییەکەی، هەڵبژاردن و دەرەنجامگیرییەکانی جڵەودەکات، واتە گرفتەکە تەنیا دیلبوونی نییە لە قاڵبی شوێنکاتی خۆیدا، بەڵکو کێشەکە ناهوشیاربوونێتی بەو شوێنکاتە، و ناهوشیارییەتی بەرامبەر بە ئێستای خۆی و ئەو جەبرانەی نائاگا تێیکەوتووە. وەک دیریدا «هەڵبەت بە گەڕانەوە بۆ هۆسرل» لە گفتوگۆیەکی توند لەگەڵ فۆکۆدا دیاریدەکات،

هەموو نیگایەک بۆ ڕابوردوو، مەحکومە بەو ئاسۆیە کە لە مێژوودا وەریدەگرێت، واتە ڕووداوێکی مێژوو نییە کە ئێمە وەکو خۆی ببینین، بەڵکو هەمیشە ڕووداوەکان بە چاوێکی تایبەتی دەبینین. بەڵام کێشەی مێژوونوسی کورد تەنیا تێنەگەیشتنی لە مێژووی ڕابوردووی کورد نییە، بەڵکو تێنەگەیشتنێتی لەو هەلومەرجە عەقڵی و کولتووری و مەعریفییەی کە خۆی کاری پێدەکات، ئەوەیە کە هیچ لەسەر خۆی و ئەو فەزا ئەبستیمییە نازانێت کە تێیدا دەستبەکارە. مێژوونوس بۆئەوەی مێژووبین بێت دەبێت پێشوەخت خودبین و هەنوکەبین بێت... واتە تۆ ناتوانیت لە ڕابوردوو بگەیت گەر لەو پرسیارەوە دەست پێنەکەیت تۆ لە ژێر چ هەلومەرجێکدا ڕابوردوو دەبینیت. لەوەوە نەڕوانیت کەرەستەی بینین لای تۆ چییە و ئەو کەرەستانە چیین و بەرهەمی چیین. بە مانایەکی تر پرۆسەی مێژووناسین بەر لە هەر شتێک بە پرۆسەی خۆناسیندا تێدەپەڕێت. مەسەلەکە هەر ئەوە نییە کە مێژوونوس چاوببڕێتە بڕگەیەکی مێژوویی دیاریکراو، بەڵکو ئەوەشە چاوببڕێتە بونیادی ڕوانین و جیهانبینی خۆشی، واتە سەیری ئەو ڕەگەزانەبکات کە تێڕوانینی ئەوی دروستکردوە. مێژوونوسین کردەیەکی گرێدراوە بە ماهییەتی مێژوونوسەوە، لێرەوە بەبێ تێگەیشتن لەوەی ئێمە لە چی هەستێکی مێژوویی خولقاوین، ئەستەمە بتوانین سەیری مێژوو بکەین. بۆئەوەی لە ناو ئایدۆلۆژیای خۆماندا نوقم نەبین، ئەم ساتەوەختە نائاگا و بێهۆشانە حوکمی نیگامان نەکەن، دەبێت تێبگەین ئێمە لە چ پێگەیەکی مێژووییەوە لە مێژوو دەڕوانین. مێژوونوسی ڕاستەقینە لە پرۆسەی مێژوونوسیندا لەوە ناکەوێت سەیری ئەو شتانەشبکات کە ئەویان دروستکردوە، چونکە مێژوونوسی بێئاگا لە خودی خۆی لەدەرەنجامدا لەبری نوسینەوەی مێژوو بێئاگا خودی خۆی نەوەک مێژوو دەنوسێتەوە. ئەرشیفدۆزەکانی ئێمەش زۆربەی وەخت خەیاڵ و خەون و ئایدۆلۆژیاکانی خۆیان دەنوسنەوە، چەپێنراوە سیاسییەکانی خۆیان لە مێژوودا بەرەڵادەکەن، وەهمە ناسیونالیستییەکانیان دەکەنە ڕابەر. ئەوان لە کۆتی یادەوەرییەکانی خۆیاندا دیلن و جگە لە شوناسی ناسیونالیستیانەش بۆ هیچی دیکە

ناگەڕێن. بە کورتی پرۆسەی «ئەرشیفدۆز»ـی نیشانەی هەبوونی مێژوونوسی کوردی نییە، بەڵکو دەرەنجامی نەبوونێتی... دەرکەوتەیەکی نائامادەگییەتی، مێژوونوسین بەبێ «فەلسەفەی مێژوو» بوونی نییە، بەبێ دیاریکردنی هەڵوێست لە دەستێوەردانەکانی خودی مێژوونوس لە پرۆسەی نوسینەوەی مێژوودا بوونی نییە، چونکە بەبێ ئەم هەڵوێستگیرییە واتە مێژوونوس لە گەورەترین قەیران و کێشەی ناو زانستەکەی خۆی ئاگادار نییە کە مەسەلەی «غایەتگەرایی » و «هیستۆریزمە» کە دوو گەورەترین قەیرانی ناو مانا و میتۆدی مێژوونوسییە. بەبێ خوێندنەوەی مێژووی ئێستا، واتە بەبێ تێگەیشتن لە ژینگەی مێژوونوس، مێژوو گەر لەدایکیش بێت وەک منداڵێکی شێواو دێتە دونیاوە. مێژوونوسێک کە تەنیا دوای یادەوەری و ئەرشیفە تۆزاوییەکان دەکەوێت یادنوسە نەوەک مێژوونوس.

سەبارەت بە ئەلتەرناتیفی «ئەرشیفدۆزی» کە تەواوی عەقڵی مێژوویی ئێمەی داگیرکردوە، شێوەنیگایەکی دیکە هەیە کە دەمەوێت پێی لەسەر دابگرم، گۆڕانکارییەک کە ئەستەمە بەبێ پیادەبوونی، شتێکمان هەبێت ناوی زانستی مێژووبێت. مێژوونوس چەند لەسەر ڕووبەرێکی لۆکاڵ و تایبەت ئیشبکات ناتوانێت خۆی لە گرفتە گەورەکانی میتۆدی مێژوونوسی و فەلسەفەی مێژوو بپارێزێت. مێژوونوسی کورد ناتوانێت تا هەتا هەتایە خۆی لە فەلسەفە بشارێتەوە، چونکە سەرەتا بۆئەوەی پێ بنێینە قۆناغێکی دیکەی نوسینەوەی مێژووەوە، دەبێت هەستێکی تازەمان بە مێژوو خۆی هەبێت، ئەوەش تەنیا لە ڕێگای قووڵبوونەوەی هەستی فەلسەفی مێژوونوسەوە دێتەدی... مێژوو بە ڕۆحە تەقلیدییەکەی لە سەد ساڵی ڕابوردوودا غروری ناسیونالیستی ئێمەی تێرکردوە، ڕابوردوویەکی نیگارنوێنی «تصوري» بۆ دروستکردوین، مەتریالێکی داوەتە دەست بزاوتە سیاسییەکانمان خەباتکارانە لەسەر زەمینە و بنەمای ئەو مێژووە ئیشبکەن، بەڵام ئەو تێگەیشتنەی کە عەقڵی سیاسی تێردەکات، ناتوانێت عەقڵی زانستی تێربکات، گەورەترین کارەساتێک

ڕۆشنبیرییەک تووشی بێت ئەوەیە عەقڵی سیاسی لۆژیکی خۆی بەسەر عەقڵی زانستیدا بسەپێنێت. تەنیا عەقڵێکی زانستی لاواز قەبووڵی باڵادەستی جۆرە عەقڵێکی دیکە دەکات. بۆیە تیوریزەکردنەوەی مێژوو لە پێشی پێشەوەی ئەو ئیشانەدایە کە دەتوانین لە ڕێگایەوە عەقڵی زانستی لە عەقڵی سیاسی جیابکەینەوە، دروستکردنی زانستێک لە کۆمەڵگای ئێمەدا سیاسەت لە بنەوە کۆنترۆڵی نەکات لەوەوە دەست پێدەکات، چەمکی مێژوو لە چنگی ئەو یادەوەرییە سیاسییە ئازادبکەین کە بۆ ڕابوردوویەک دەگەڕێت بۆ خۆی، نەوەک بۆ داهاتوویەک بۆ ئێمە. ئێمە هەموومان دەزانین سیاسەت ڕۆڵێکی ترسناکی لە پاشخستنی هوشیاری زانستی ئێمەدا بینیوە، بەڵام لە ڕاستیدا هەرگیز هەوڵمان نەداوە هۆی ئەو زیانە بزانین. کێشەکە لەوەوە دەست پێدەکات کە سیاسەت لە جەوهەریدا ئیشێکی زۆرکەمی بە زانستەکان هەیە، لەوانە زانستی مێژووش. سیاسەت هەموو شتەکان دەکات بە کەرەستە، لێرەوە عەقڵی کایەکان ئیفلیجدەکات و لە دوادەرەنجامیشدا خۆی ئیفلیج دەبێت. کورتکردنەوەی هەر زانستێک بۆ هەندێک وەزیفە، هەموو گرنگی و جوانی و بیرکردنەوەی لەنێودەبات، زانستەکان دەبێت شوێنی بیرکردنەوە و تاقیکردنەوەی ئازادانەی ئەگەرەکان بن، نەوەک بە هەندێک مەبەست و ئامانجی دەرەکییەوە زنجیربکرێن و ببەسترێنەوە. مێژووی کوردی تا ئەمڕۆ بەو ئەندازەیە ئیشیکردوە کە عەقڵی سیاسی پێویستی پێیەتی، ئیدی دەبێت بەو شێوەیە ئیشبکات کە زانستێک پێویستە ئیشبکات و لەسەروو هەموو شتێکیشەوە لەگەڵ فەلسەفەی مێژوودا سەرقاڵ بێت. عەقڵی مێژووخوێنی ئێمە، لە بنەڕەتەوە ئەو دوو پرسیارە جەوهەرییەی نەکردوە کە لە بنەمای دەستپێکردنی هەموو خوێندنەوەیەکدایە بۆ مێژوو. پرسیاری: «مێژوو» چییە؟ کە پرسیاری سەرەکی «فەیلەسوفەکانی مێژوو»ـە، لەگەڵ پرسیاری: «مێژوونوس» دەبێت چی بکات بۆ ئەوەی لە مەتریالی باسەکەی نزیک ببێتەوە؟ کە پرسیاری سەرەکی «هیستۆریستەکان»ـە. ئەم دوو پرسیارە سەرەتایی و گرنگە «کەوەڵامەکەیان دەرگا لەسەر دابەشبوونێکی ناوەکی هونەری مێژوونوسین بەسەر دووبەرەدا دەکاتەوە»

هەر دووکیان بەشێوەیەکی بەرچاو لە دونیای مێژوونوسینی ئێمەدا ونن. هۆی ونبوونی ئەم دوو پرسیارە دەگەڕێتەوە بۆ هەندێک هۆی ئایدۆلۆژی کە ئەوانیش ڕیشەی خۆیان لە زنجیرەیەک هۆکاری عەقڵیدا دەدۆزنەوە. هۆ ئایدۆلۆژیەکان هەر یەکەیان گرێدراوی سروشتی ئایدۆلۆژیایەکی جیاوازن، هەر ئایدۆلۆژیایەک و بە شێوەیەکی تایبەتی مێژوونوسەکانی خۆی بەهەڵەدا بردووە. ناسیونالیستەکانی کورد هەرگیز ئەم پرسیارانەیان نەکردوە، چونکە ویستوویانە مێژوویەک بۆ نەتەوە دروستبکەن، نەوەک زانستی مێژوو دروستبکەن، خواستیان بووە مێژووی کورد بخوێننەوە، نەوەک خودی خوێندنەوە و گرێ گەورەکانی هونەری خوێندنەوە بکەنە زانست، ئەوەی گرنگ بووە و ئەوەی لۆژیکی «گووتاری مانەوە» سەپاندویەتی ئەوەبووە کە ئێمە ئێستا و لێرەدا و بەخێراترین شێوە «مێژوویەکی نەتەوایەتی»مان پێویستە شەڕی دوژمنانی پێبکەین، مێژوویەک شوناسێکی کۆییمان بۆ دروستبکات. لێرەوەیە مێژوو لای ئێمە لەدەرەوەی «زانستی مێژوو» و لە باوەشی سیاسەتدا لەدایکدەبێت. مارکسیستەکان شانسێکی زیاتریان لەبەردەمدا بوو کە مێژوو بەجۆرێکی زانستی بنوسنەوە، بەڵام مارکسییە کوردەکان لە هیچ ساتێکدا نەیانتوانی مارکسیزم لە فۆرمی زانستدا بەرجەستەبکەن. ئەوان لەبری ئەوەی ماتریالیزمی مێژوویی وەک میتۆد بەکاربهێنن، وەک حەقیقەتێکی دینی و رەها و یۆنیفرسال سەیریانکرد، لێرەشەوە خودی فێربوونی مەتریالیزمی مێژوویی بوو بە ئەلتەرناتیڤی خوێندنەوەی مێژوو. وەک ئەوەی تەماشاکردنی کلیلەکە و سەرسامبوون بە کلیلەکە بچێتە بری کردنەوەی دەرگاکە، مارکسیستە کوردەکان لە بواری مێژوودا سەیرکردنی کلیلەکەیان کە مەتریالیزمی مێژوویی بوو، وەک کردنەوەی دەرگاکە تەماشادەکرد کە خودی مێژووە، لێرەوە مارکسیزمی کوردی گەرچی پتر لە پەنجاساڵ تاکە بەریانی زاڵی ناو ڕۆشنبیریی کوردیی بووە، هیچ کاتێک ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ڕاستەقینەی لەگەڵ مێژوودا نەبووە. بەرخوردی ئیسلامییەکانی ئەمڕۆش لەگەڵ مەسەلەی مێژوودا لە بەرخوردی ناسیونالیستە کوردەکان و مارکسیستەکان باشتر نییە، خواستی سەرەکی

ئەوان ئەوەندەیە کە مێژووی کورد بە مێژووی ئیسلامەوە گرێبدەن و لەویادا ماناى بۆ بدۆزنەوە، گەر هەڵەی ناسیونالیستەکان ئەوەبێت کە دەیانەوێت «مێژووی کورد» بەبێ زانستی مێژوو بنوسنەوە، هەڵەی مارکسیستەکانیش ئەوەبێت کە نەیانتوانی لە میتۆدێکی خوێندنەوەی مێژووەوە بەرەو مێژوو خۆی بگەڕێنەوە، هەڵەی ئیسلامییەکان ئەوەیە کە دەیانەوێت مێژوویەک لەناو مێژوویەکی دیکەدا بتوێننەوە و مێژووی ئیسلامی وەک ئەلتەرناتیفی مێژووی کورد تەماشابکەن، مێژووی کورد لای ئەوان هیچ نییە جگە لە لکە حیکایەتێکی ناو حیکایەتێکی مەزنتر کە مێژووی ئیسلامە، ئەوان مێژووی کوردیان بۆ گرنگ نییە، بەڵکو ئیشکردنی ڕۆحی ئیسلامیان لە ناو ئەو مێژووەدا بۆ گرنگە، بەواتایەکی تر هێندەی بۆ ئیشکردنی دین لە مێژوودا دەگەڕێن بۆ ناوەڕۆکی ئەو مێژووە ناگەڕێن.

لێرەوە بەبێ گەڕانەوە بۆ پرەنسیپەکانی زانستی مێژوو و فەلسەفەی مێژوو، ئەستەمە هیچ چەشنە مێژوونوسییەک لەدایک بێت. ئەو پێناسە تەقلیدییە کە پێی وایە «مێژوو کۆمەڵێک ڕوداوە کە لە ڕابوردوودا ڕوویانداوە و ئێمە دەبێت هەوڵ بدەین ڕاستی و دروستیان بسەلمێنین تا ڕابوردووی نەتەوەکەمان بزانین» هیچ شتێک ڕوون ناکاتەوە، یاخود لایەنی کەم لە ژێر ڕۆشنایی ئەو تەفسیرە ئایدۆلۆژییەدا کە ئیش بەم پێناسە سەرەتاییە دەکات هیچ ڕووننا‌کاتەوە. من پێموایە ئەستەمە لە گرفتەکانی خوێندنەوەی مێژوو تێبگەین، گەر لە گرفتەکانی ئێستامان تێنەگەین. ئەستەمە لە ڕابوردوو بگەین، گەر نەزانین ئێستا لە چ قەیرانێکی عەقڵیدا دەژین، چونکە قەیرانی مێژوونوسین توند بە قەیرانێکی ترەوە گرێدراوە، کە قەیرانی هەنوکەی عەقڵمانە. مێژوونوسی ئێمە کوشتەی مەزاجی ئایدۆلۆژی خۆی و کۆیلەی یادەوەرییەکان و کەرەستەی ئەو گووتارانەیە کە بەبێ ئاگای خۆی کۆنترۆڵیانکردوە، واتە مێژوونوسی ئێمە بێئاگایە لەوەی لە چ بونیادێکی عەقڵییەوە لە بونیادە مێژووییەکان دەڕوانێت. لەمێژوونوسیندا گەر بێئاگا بیت لەوەی «خۆت چییت» بێئاگا

دەبێت لەوەی «مێژوو چییە». لێرەوە من هەندێک سەرەتای گرنگ دەستنیشاندەکەم کە بەبێ ئیشکردن و تیوریزەکردن لەسەر ئەم تەوەرانە ئەستەمە پێبخەینە ناو هیچ پرۆسەیەکی مێژوو خوێندنەوەوە، ئەستەمیشە «مێژوونوسین» وەک زانست لەو کوێری و جاهیلییەتە دەربهێنین کە ئێستا تیادەژی. مەسەلەکە بە قووڵی بە «هێزی تیوریزەکردنەوە» گرێدراوە، مێژووی ئێمە پێویستی بەهێزێکی تیوریزەکردنی گەورە هەیە کە لەو جوغزە داخراوەی خۆی دەریبهێنێت. واتە سەرەتای هاتنە دەرەوە لە «ماڵی ئەرشیف» دەبێت جوڵەبێت بەرەو « ماڵی تیورە»، گەڕان لە مێژوودا تەنیا بۆ دۆزینەوەی حیکایەت نییە، بەڵکو بۆ بینینی ستراکتورێکی بزوێنتر و مانایەکی تێپەڕێنتر و بەرینترە لە خودی ڕووداوەکان، کە دەڵێم «تیورە» مەبەستم ئەوەیە کە مێژوو لەوەبکەوێت کە تەنیا کایەیەک بێت مانای سیاسی سەتحی و حیکایەکردنەوەی ڕووداوەکان بەرهەمبهێنێت، بەڵکو ببێتە کایەیەکی کراوە کە سوود بە فەلسەفە و دەروونناسی و کۆمەڵناسی دەگەیێنێت و سوودیان لێوەردەگرێت. مێژووی کوردی ئەستەمە بەتەنیا و بێکۆمەکی زانستەکانی تر ببێتە زانست، وە ئەگەر نەشبێت بە زانست ناتوانێت لە هوشیاری گشتی کورددا ڕۆڵێک ببینێت. پرسیارێکی گرنگ کە مێژوونوسینی لەسەر بەندە، ئەو پرسیارەیە دەربارەی «چۆنێتی دروستبوونی زانینی ئێمە بە مێژوو». هەروەک چۆن کانت لەسەرەتای ڕۆشنگەرییەوە پرسیاری «چۆنێتی دروستبوونی زانین»ـی لای مرۆڤ کردە پرسیاری سەرەکی، کەسانێکی وەک «درۆسن»یش کە بنەماکانی «هیستۆریزم»ـی دامەزراند هەمانشێوە ئەو پرسیارەیان ئاڕاستەی مێژوو کرد. ئەم پرسیارەش بەبێ جوڵەیەکی گەورە، بەبێ «ڕاڕاییەکی مەزن» دەرهەق بە میتۆدەکان و ڕۆحێکی پرسیارکەر نایەتەدی. بە کورتی کە دەڵێم تیورە مەبەستم ئەوەیە مێژوو بەر لەوەی بۆ بابەتی تێڕامان بگەڕێت، دەبێت خۆی کردبێتە بابەتی تێڕامانی خۆی. هەر زانستێک نەیتوانی خۆی سەیری خۆی بکات و لەو زەمینە فیکری و میتۆدییە ڕابمێنێت کە لەسەری وەستاوە نابێت بە زانست. عەقڵی ئەرشیفدۆز ناتوانێت هەست بە قەیرانی

خۆی بکات گەر پێشتر کۆی لۆژیکی ئیشکردنی نەخرابێتە ژێر پرسیارەوە، تیورە تەنیا شتێکە کە مێژوونوسین لە گرێ و کۆسپەکانی خۆی ئازاددەکات ... لە حیکایەت و مانا سیاسییە بچوکەکان دەریدەهێنێت و جیهانبینییەکی بەرینتری دەدەاتێ، وای لێدەکات لەگەڵ کێشەی قووڵتردا دەرگیربێت کە تەنیا بە مانای سیاسی «کوردبوون»ـەوە ناوەستێت و بەسەر هەموو ڕەهەندەکانی کوردبووندا دەکرێتەوە. بۆیە وشەی تیورە لەم گووتارەدا کە لێرەدا بانگەشەی بۆدەکەم هیچ نییە جگە لەو هێزەی وادەکات مێژوو زیاتر ببینێت و ڕوونتر ببینێت و ئاسۆدارتربێت. تیورە سەرەتا لە مێژووەوە دەست پێناکات، بەڵکو لە کایەکەوە دەستپێدەکات. واتە مێژوو بەرلەوەی لە ڕووداوەکانی مێژوو یان لە ژیانی سەرۆک و مێژووی ئیمارەتەکان ڕابمێنێت دەبێت لە پرسیارە جەوهەرییەکانی خۆی ڕابمێنێت، تیورە بریتییە لە بیرکردنەوەی مێژوو وەک زانست لە کایەکەی خۆی، لە کەرەستەکانی، لە فەزای ئیشکردنی... بۆیە زۆر گرنگە بزانین کە «تیوریزەکردنی کایە» چییە.

مێژوو بۆئەوەی هەبێت نابێت خۆی لە کۆمەڵێک پرسیاری سەرەکی و گرنگ بپارێزێت. مێژوونوس لەوەوە دەست پێناکات، بپرسێت : ئیبراهیم پاشای بابان لە کوێ مرد؟ قازی محەمەد لەگەڵ کێدا ناکۆک بوو؟ پەیوەندی شێخ سەعید لەگەڵ ئەرمەنییەکاندا لە چ ئاستێکدا بوو؟ بەکر سدقی کورد بوو یان نا؟ ... هتد. بەڵکو لە کۆمەڵێک پرسیاری جەوهەری ترەوە دەگەڕێتەوە سەر ئەمجۆرە بابەتانە، وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە و گەڕان بۆ ماناکانیان و ناواخنکردنیان لە هوشیاری مێژوونوسدا مەرجی سەرەتایی و یەکەمینن بۆ لەدایکبوونی مێژوو وەک زانست و سەرەتای ئەو پرۆسەیەن کە بە تیورەزەکردنی کایە ناویدەبەم. لایەنی کەم چوار پرسیاری زۆر سەرەکی هەیە مێژوونوس ناتوانێت بێوەڵام بەجێیان بهێڵێت کە ئەمانەن: 1. ئێستا چییە؟ 2. بکەری مێژوویی چییە؟ 3. ڕووداو چییە؟ 4. جوڵە و گۆڕان لە مێژوودا چییە؟. بەبڕوای من تەنیا لەوەڵامی ئەم چوارپرسیارەوە مێژوونوس لە دایکدەبێت. لێرەدا زۆر بەکورتی لەسەر

ئەو چوار تەوەرەیە و گرنگیان بۆ هەر خوێندنەوەیەکی مێژوویی دەدوێم، بێئەوەی ئیدیعای ئەوەبکەم کە دەکرێت یان دەشێت یان لە توانامدایە دوا وەڵام بەو پرسیارانە بدەمەوە، چونکە هەر پرسیارێک لەوانە دەڕژێنە دەیەها لکە پرسیار و کایەی کراوەی ترەوە، کە دەشێت هەر مێژوونوسەو بەپێی سروشتی خۆی جۆرە وەڵام و جورە گۆشەنیگایەکی تیا هەڵبژێرێت.

## ئێستا چییە؟

پرسیار لە ئێستا پرسیارە لەو ساتەوەختە مەعریفی و سیاسییەی کە مێژوونوس تیا دەژی. واتە خوێندنەوەی ئێستا تەنیا کاتێک بوونی هەیە کە لە ڕاستیدا سەرقاڵی تێگەیشتن بین لە «چۆنێتی دروستبوونی دیدگای ئێستاکێمان بۆ شتەکان». بەڵام «ئێستا» تەنیا گرێدراوی تێڕامان نییە لە فەزای سیاسی و کۆمەلایەتی، بەڵکو گرێدراوی تێگەیشتنمانە لە عەقڵی ئێستاکێمان، واتە وەرگرتنی هەڵوێستێکی گومانکار و ڕەخنەییە لەو شتانەی کە وەک سادە و بەڵگەنەویست و پرسیارنەویست وەرمانگرتوون. مێژوونوس دەبێت لە ئێستا تێبگات، بۆئەوەی ئێستا نەتوانێت بەو قاڵبە گەورە و فۆرمە تایبەتیانەی خۆی وەها ئابلۆقەی بدەن، خواست و حوکمەکانی ناهوشیارانە بگۆڕن. چونکە ئێستا لە ڕێگەی کۆمەڵێک وێنە و تێڕامان و خەیاڵی سەوزکراوەوە لە ئێمەدا، گەلێک دیوی دیاردەکانمان لێوندەکات. دەبێت لە ئێستا تێبگەین بۆ ئەوەی یەکەم: بەهەڵەماندا نەبات و دووەمیش: لە ڕێژەگەرایی بۆچوونەکانمان تێبگەین. تێگەیشتن لە ئێستا مەرجی سەرەکی ئەوەیە کە تێبگەین چی گۆڕاوە و چی لە شوێنی خۆی دووبارەدەبێتەوە، تێگەیشتن لە ئێستا مەرجی گەورەی هەنگاونەنانە بۆ تێگەیشتن لە «لێکچوون و لێک نەچوون» لە مێژوودا، چونکە لە پرۆسەی بیرکردنەوەدا لە مێژوو، ئێمە تەنیا ڕابوردوو بە ڕابردوو ناپێوین، بەڵکو ڕابوردوو بە ئێستا دەپێوین. ئەم پێوانەیە گەر نائاگا و ناهوشیارانە و ژێرەوانکێ بێت، مێژوو وەک زانست لە نێودەبات. بۆ نمونە ئەوەی مێژوو بۆ مەبەستی سیاسی بنوسینەوە، یەکێکە لەو گووتارە زۆر زاڵانەی

سەردەمی ئێستاکێمان کە وەها بەڵگەنەویست و دوورگومان وەرگیراوە برێکی زۆر لە باسکاران وەک خەوشێکی کوشندە نابینن و زۆریشیان باش و سوودکار هەڵیدەسەنگێنن، گەر تێنەگەین ئەم ڕەهەندە سیاسییەی ناو نوسینەوەی مێژووی کورد لە کوێوە هاتووە، گەر نەچینە بنج و بناوانی ئەو زیانە کوشندانەی ئەمە لە «مێژووناسینی کوردی» داوە، ئەوا ناچاردەبین دووبارەیبکەینەوە. ئێستاناسی بەشێکی گرنگی مێژووناسییە، ئێستانوسیش بەشێکی گرنگی مێژوونوسییە. واتە مەسەلەکە تەنیا هوشیاربوون نییە بەرامبەر ئەو مینانەی ئێستا لە ڕێگای مێژوونوسدا دایدەنێت، بەڵکو پرۆسەی خۆ بە مێژوودا کردنیشە. مێژوونوس کەسێک نییە تەنیا لە سەر ڕابوردوو کاربکات، بەڵکو کەسێکە ئێستاکەش دەخاتە بەر دیدێکی مێژوویی. ئێستا تەنیا ئەو خاڵە نییە کە لێوەی سەیری مێژوو دەکەین، تەنیا ئەو جێگایە نییە کە تیا وەستاوین، بەڵکو خۆی ساتێکی مێژوویشە. مێژوونوس مەحکومە بەوەی ئەم ساتە لە مێژوودا ببینێت و مێژووش لەم ساتەوە بخوێنێتەوە. ئەمە مەرجێکە کە مێژوونوس لێی دەرناچێت، ئەو پنتەیە کە دەبێت قووڵ لێی ڕابمێنێت. چونکە ئەم تێڕامانە تەنیا ڕێگای پەیوەندی مێژوونوسە بەو فەزا کولتوورییەوە کە تیا لەدایکبووە، ئەو بەهیچ شێوەیەک ناتوانێت ئەم ساتەی خۆی لە دەرەوەی مێژوو تەماشابکات، ناشتوانێت مێژوو دوور لە چاوی ئەم ساتە ببینێت... واتە مێژوونوس دەبێت بزانێت کە خۆی لە مێژوودا وەستاوە، بەبێ تێگەیشتن لە ئێستاش ناتوانێت بچێتە ناو مێژووەوە، تێگەیشتن لەم دوو جەبرە مەرجی ڕزگاربوونی مێژوونوسە لە زیانە گەورەکانی. واتە مەرجی خۆپاراستنێتی لە موتڵەقگەراییەکی گەورە و مەرجی خۆپاراستنیشێتی لە ڕێژەگەرای«ڕێلێتڤیزمێکی» سەرپەڕانە. خۆکردنی دروست بە مێژوودا گرێدراوی خۆکردنی دروستە بە ئێستادا، ئەوەی مێژوونوس خۆی وەک بوونەوەرێکی دەرەمێژوو ببینێت، خۆی وەک «ڕاستی - بین»ێکی دەرەکات ببینێت... ئەوە ڕێگرێکی گەورەیە لەبەردەم ئەوەی کە ڕۆحی سەردەمەکانی تر تێبگات. ئێستا ئەو ساتە وەختە ئیدیالەیە کە مێژوونوس پێویستی پێیەتی بۆئەوەی ببێتە مێژوونوس، چونکە

مێژوونوس ناتوانێت له ڕابوردوودا بژی، به‌ڵكو ئێستا تاكه مێژووییه‌كه كه مێژوونوس ده‌توانێت تیابژی. واته په‌یوه‌ندی به‌زه‌مه‌نه‌وه له ڕێگای په‌یوه‌ندی به ئێستاوه ده‌رده‌كه‌وێت. ئێستا مێژووییه‌كه له هه‌موو ساته‌كانی تر ڕوونتر و ڕۆشنتر پێمان به‌خشراوه، لێره‌وه گه‌ر نه‌توانین له ڕوونترین دراویی مێژوویی تێبگه‌ین ناتوانین له‌دراوه تاریكه‌كانی تێبگه‌ین. به‌كورتی به‌رخورد له‌گه‌ڵ مێژوودا به‌رخوردێكی عه‌قڵی و مه‌عریفییه ڕیشه‌كه‌ی له به‌رخورده‌وه له‌گه‌ڵ ئێستادا ده‌ست پێده‌كات، تێنه‌گه‌یشتن له ئێستا هه‌نگاوی یه‌كه‌مه بۆ تێنه‌گه‌یشتن له ڕابوردوو. مامه‌ڵه‌نه‌كردنی مێژوونوسی كورد له‌گه‌ڵ ئێستادا «وه‌ك ساته‌وه‌ختێكی مێژوویی - مه‌عریفی » ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی پێیوایه ئێستا له‌ده‌ره‌وه‌ی مێژووه، واته هه‌ستی به «ڕۆحی مێژوویی» چركه‌ساتی خۆی نییه وه خۆی وه‌ك بوونه‌وه‌رێكی مێژوویی نابینێت و ناتوانێت خۆی وه‌ك قه‌واره‌یه‌كی جه‌ڕێنراو له مێژوودا ته‌ماشابكات. هۆیه‌كی دووه‌م ئه‌وه‌یه كه«ئێستا» به ئاسانی ناكرێت به حیكایه‌تێك كه له‌نێوان «ئه‌گه‌ر و نه‌گه‌ری» ڕاستی و درۆدا یارییبكات، به‌ڵكو پێویستی به ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ی میتۆدی و تێڕامانی تیوری قووڵتر هه‌یه. مرۆڤ ئاسان ده‌توانێت ڕابوردوو بگۆڕێت بۆ حیكایه‌ت و داهاتوو بگۆڕێت بۆ خه‌ون، به‌ڵام بۆئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ «ئێستا»دا مامه‌ڵه‌بكات یان ده‌بێت لێی ڕابكات یاخود زانستیانه و عه‌قڵانیانه مامه‌ڵه‌ی له‌گه‌ڵدا بكات، لێره‌وه ڕاكردن له ئێستا ڕاكردنه له بیركردنه‌وه، ئه‌م ڕاكردنه گواستراوه‌ته‌وه بۆ مێژوونوسیش. جگه له‌وه بیركردنه‌وه له ئێستا، مێژوونوس به‌ره‌و ڕووبه‌ڕووبوونه‌ی له‌گه‌ڵ خودی خۆیدا ده‌بات، بۆ تێگه‌یشتن له خۆی، بۆ ئاراسته‌كردنی چاوی به‌ره‌و خۆی، به‌ره‌و سیستمی بیركردنه‌وه‌ی، واته به‌ره‌و جێگایه‌ك سه‌ره‌تا وا ده‌رده‌كه‌وێت وه‌ك ئه‌وه‌ی په‌یوه‌ندی به مێژووه‌وه نه‌بێت. له‌وه‌ش بترازێت تێگه‌یشتن له ئێستا مه‌رجی سه‌ره‌كی جیاكردنه‌وه‌ی ئه‌و شتانه‌ن كه مێژوویان هه‌یه له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌دا كه نوێن و هه‌نوكه‌ین، ئێستا تاكه ساتێكه ده‌توانێت «مێژوویی» و «نامێژوویی» له‌یه‌ك جیابكاته‌وه، تاكه ساتێكیشه پیشانمان ده‌دات ده‌شێت مێژوو به‌سه‌ر چه‌ند مێژووی بچوكدا دابه‌شببێت، واته ئێستایه كه

مێژووەکان دابەشدەکات و کایەیان بۆ دەکاتەوە، لێرەوە نزیکی لە هەنوکە ئێستا تاکە ڕێگای نزیکییە لە مێژووەوە.

## بکەری مێژوویی چییە؟

مێژوو لەگەڵێک بکەر و لەگەڵێک وێنەی بکەر و ئەگەری بکەر دروستبووە. چەمکی بکەر لە کەسی حاکم و نەیارەکانیدا کورت ناکرێتەوە. بەر لەهەر شتێک دەبێت مێژوونوسینی کوردی لەو عەقڵییەتە دەربهێنین کە چەمکی سەنتراڵی مێژوو بە کەسانی وەک سەرۆکەکان و فەرمانڕەوا سەرەکییەکانەوە گرێبدات، یاخود قۆناغەکانی مێژوو بەپێی حوکمڕانی وەچەکان و ئیماراتەکان دابەشبکات . کێ بکەری هەرە گەورەی مێژووە؟ ئاخۆ مێژوو پێکڕا لەسەرەتاوە تا کۆتایی یەک بکەری هەیە، یاخود هەر سەردەمە و هەر کولتوورە و هەر ناوەندە جۆرە بکەرێک دروستدەکات؟ ئاخۆ بکەری مێژوویی مرۆڤە، واتە بوونەوەرێکی «خودداره ـ سوبێکتیڤە» وەک کەسانی لە بابەت تۆماس کارلایل دەڵێن؟ یان وەک هیگڵ دەڵێت «عەقڵێکی ئۆبێکتیڤ و ڕەها» مێژوو دەخولقێنێت؟ یان «یاساکانی بەرهەمهێنان و گەشەکردنی» مێژوو دەجوڵێنن وەک مارکس بانگەشەی بۆدەکرد؟ ئایا لەسەر شانۆی مێژوو مرۆڤ تێکستەکەی نوسیوە و هەرخۆشی کاری ئەکتەرێتی دەکات، یا بەپێچەوانەوە مرۆڤ تەنیا ئەکتەرە و تێکستێکی نوسراو نمایشدەکات؟ ئاخۆ فەرد و کاراکتەرە کاریزمییەکانن مێژوو دروستدەکەن یان ڕۆحی نەتەوە؟ ئایا چینەکان بکەری گەورەی مێژوون یان ئیلیت و دەستە هەڵاوێردەکان؟ ئایا گەشەی زانست بزوێنی مێژووە یاخود گروپە سیاسییە ستراتیژییەکان؟ ئایا خودا مێژووی ئادەمیزاد ئاڕاستەدەکات، یان تەکنۆلۆژیا؟ ئاخۆ بکەری مێژوویی کوێرە و بێئاگا مێژوو دروستدەکات، یان هوشیارە و دەزانێت چی دەڵێت و چی دەکات؟... ئەمانە و دەیان پرسیاری گرنگی دیکە کە دەشێت ئاڕاستەی «بکەری مێژوویی» بکرێن، ماهییەتی مێژوو وەک زانست دیاریدەکەن. هەر مێژوونوسێک خۆی لەم پرسیارانە بدزێتەوە، ئەوا لەدەرەوەی کایەی مێژوونوسین دەژی و خۆی لە مەرجە سەرەکییەکانی

نزیکبوونەوە لە مێژوو دەشارێتەوە. ناکرێت مێژوونوس بێ فەلسەفەیەکی تایبەت دەربارەی بکەری مێژوویی و پەیوەندی لە نێوان بکەرە جیاوازەکاندا بوونی هەبێت. مێژوو چیرۆکی کۆمەڵێک ئەمیر و سوڵتان و حیزب و لەشکر نییە، بەڵکو جوڵەیەکی ناوەکی و بکەری تاریکتری هەیە کە دەبێت مێژوونوس لەگەڵیاندا دەرگیربێت و بیاندۆزێتەوە. بکەرە مێژووییەکان بەسەر گەورە و بچوک و دیار و نادیاردا دابەشدەبن، بەسەر هێزی عەقڵی و هێزی مادییدا دابەشدەبن. مێژوونوسین تێرامانە لەو تێکەڵاوبوون و کیمیا نهێنییەی کە بکەرە جیاوازەکان خولقاندوویانە. مێژوونوسی کورد بە حوکمی دابڕانی تەواوەتی لە فەلسەفەی مێژوو، بە حوکمی بێئاگایی لەوەی کە بڕێکی گەورەی نهێنی مێژوو لە ناو زانستە کۆمەلایەتییەکاندا دەبێت بۆی بگەڕێین، هەرگیز دەرگای ڕاستەقینەی مێژووی نەدۆزیوەتەوە. فەرامۆشکردنی ماناو چۆنێتی بکەریی مێژووییش بە مانای فەرامۆشکردنی مانا و چۆنێتی مێژوو خۆیەتی.

## ڕووداو چییە؟

سەیرکردنی مێژوو «وەک زنجیرەیەک ڕووداو» لە ڕۆژگاری هۆمیرۆسەوە تا ئێستا سەیرکردنێکی باوە. بەڵام لە چەند ساڵی ڕابوردوودا بایەخدان بە مانای ڕووداو و تێڕامان لە چییەتییەکەی، گەشەی زۆر گەورەی بە خۆیەوە بینیوە، کەسانی وەک بۆردیۆ، ئالان بادیۆ و سلاڤۆ ژیژیک لەو ڕووەوە ئیجتیهادی بەرچاویان کردوە. لەسەر ڕۆشنایی ئەو نوێبوونەوە گەورانەدا ئەستەمە مێژوونوس خۆی لە تێڕامان لە ماهییەتی ڕاستەقینەی ڕووداوی مێژوویی بشارێتەوە. مەرج نییە ئەو ڕووداوانەی گۆڕان دروستدەکەن ڕووداوە گەورەکان بن. ڕووداو شتێکە دەرگا لەسەر شتێکی نوێ دەکاتەوە، ڕەهەندێکی ڕەمزی هەیە کە تەفسیری مێژوویی و پەیوەندی نێوان قۆناغە مێژووییەکان بەجۆرێکی تر ڕێکدەخاتەوە. ڕووداو تەنیا لابردنی پادشاکان و هەرەسی شۆڕشەکان و سەرهەڵدانی حاکمییەتەکان نییە. بەڵکو سەرهەڵدان و دەرکەوتنی شتێکیشە کە پێش ئەو نەبووە و نەبینراوە. واتە ڕووداو هێندەی وەرگەڕانێکی ڕەمزییە، هێندە

گرێدراوی ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتەکان و وەرگەڕانی حاکمییەتەکان نییە.
مێژوونوسی ئێمە تا ئێستا دوای ڕووداوە ڕاستەقینەکانی مێژووی ئێمە نەکەوتووە، تا ئێستاش جیاکارییەکی تەواوەتی لە نێوان قەوارەی واقعیانەی ڕووداو و قەوارەی ڕەمزی ڕووداودا نەکردوە. ئەو ڕووداوانەی لە مێژوودا دەستنیشان نەکردوە کە ئاماژەی دابڕانن لەگەڵ ئەو ڕووداوانەدا کە ئاماژەی دووبارەبوونەوەن. مێژوونوس گەر نەتوانێت لەسەر ڕۆشنایی چییەتی ڕووداوەکان، بەردەوامی و دابڕان لە مێژوودا دیاریبکات. گەر نرخی ڕەمزی ڕووداوەکان بۆ سەر بونیاد و سیستمە جێگیرەکان نەخوێنێتەوە، واتە مێژوو سەرتاپا وەک فەزایەکی چونییەک تەماشادەکات، لە ڕاستیشدا وێنەی مێژوو لە عەقڵییەتی مێژوونوسی کورددا ئێجگار ساف و یەکڕوو و مۆنۆتۆنە، لە حیکایەتێک دەچێت کە یەک چیرۆکنوس نوسیبێتی و لەسەرەتای مێژووەوە تا کۆتایی بە هەمان هەناسە درێژبووبێتەوە. مرۆڤ کە لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ کتێبی مێژوونوسە کۆن و نوێکانی کورد دەخوێنێتەوە نەوەک شتێک لە گۆڕانی پارادایمە مێژووییەکان تێناگات، بەڵکو شتێکیش لە چەمکی گۆڕانی مێژوویی لە سادەترین مۆدێلەکانیدا حاڵی نابێت. تێنەگەیشتن لە چەمکی ڕووداو، جیانەکردنەوەی ڕووداوی ڕاستەقینە لە ڕووداوی وەهمی، جیانەکردنەوەی ڕووداو لە دووبارەبوونەوە؛ سیفەتی سەرەکی پرۆسەی مێژوونوسینی کوردییە. مێژوونوسی ئێمە جگە لە ڕووداوە سیاسییە گەورەکان، لە ئاست هیچ ڕووداوێکی دیکەدا ناوەستێت، لەبەرئەوەی لەسەر هیچ زەمینەیەکی شیکاریش بۆ مێژوو نەوەستاوە، ئیدی هۆیەکی تێگەیشتنی لە مانای ڕووداوی سیاسیش پێ نییە. ئەم هەژارییە لە تێگەیشتن لە مانای ڕووداودا وادەکات مێژوو لای ئێمە تەنیا لەسەر ئاستی زەمەنی دابەشبکرێت و کات تەنیا پێوەری مێژوو بێت و لە سەدەکان و ساڵەکان زیاتر ئاماژەی دی و شێوە دابەشکردنی دیمان نەبێت. مێژوو کایەیەکە ڕووداوەکان دروستیدەکەن، واتە ڕووداو زەمەن دابەشدەکات، نەوەک زەمەن خۆ بە خۆ و بەتاڵ لە هیچ ناوەڕۆکێک خۆی ڕووداوبێت و خۆی مێژوو دەستنیشانبکات. خاڵەکانی وەرچەرخانی مێژوویی گرێدراوی

ئاڵوگۆڕی سیستمی بینین و سەرهەڵدانی شێوە جیاوازەکانی جیهانبینین کە لە ڕووداوی دیاریکراودا بەرجەستەدەبن، بۆیە چەمکی ڕووداو دەبێت شتێک بێت زیاتر لە تێڕامان لەو ڕەوتە زەمەنییە سادەیەی لە کردەی مێژوونوسینی خۆماندا دەیبینین.

## جوڵە و گۆڕان لە مێژوودا چییە؟

ئەمڕۆ هیچ زانستێک بە تەنیا ناژی، ڕاستە خواستی خۆدروستکردن و خۆجیاکردنەوە لە کۆی کایەکاندا بەجۆرێکی بەرچاو دەبینرێت، بەڵام ئەم خواستە نەبۆتە مایەی دەرگا داخستن لەسەر زانستەکان و دابڕانیان لە یەکتر، بەڵکو کۆمەڵێک کایەی ناوکۆیی و کۆمەڵێک «تخوبە بوار» ی دروستکردوە کە زانستەکان لەگەڵ یەکدا تێکەڵدەکات و زانستی نوێیان لێ دروستدەکات. بەپێچەوانەوە هێزی هەموو زانستێک ئەمڕۆ لەوەدایە تا چەند زانستەکانی تر پێویستیان پێیەتی. مێژووش وەک گوتم زانستێکی خۆژێن نییە، بە پێچەوانەوە «مێژوو» گرێدراوی گەشەی بونیادی کۆمەڵایەتی و گۆڕانی ئابووریی و وەرچەرخانەکانی ناو زانست و سەرهەڵدانی فۆرمی دەرونی نوێیە. جگە لەوەش گەشەی فەلسەفە و کاریگەری بیری سیاسی لەسەر مێژوو زۆر گەورەیە. لەبەرئەوە مێژوو لە مانا گشتییەکەیدا لە مێژووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و کولتووری دانابڕێت، دیارە هیچ یەک لەمانە بە تەنیا مێژوو دروست ناکەن، بەڵام مێژووش بەبێ هیچ یەک لەمانە دروست نابێت. مێژوو بەرهەمی ئەو جوڵە ناوەکییەیە کە لەگەڵێک ئاست و گەلێک زانست و گەلێک کایەوە دێت. پرسیارەکە ئەوەیە ئاخۆ جوڵەی ناو کایەکان و یاساکانی گۆڕانیان تا چەند ڕەنگدانەوەیان لە یاسا گشتییەکانی جوڵەی مێژوویدا هەیە، ئاخۆ جگە لەم گەشە و جوڵانەی کە مێژووی کایەکان بەسەربەخۆ تێیدا دەژین، گەشەو جوڵەیەکی گشتی هەیە لە کۆی ئەو گۆڕانکارییە وردانە، لە تەواوی مێژووە بچوکەکان مێژوویەکی گشتی و گۆڕانکارییەکی کۆیی

بخولقێنێت؟ ئاخۆ جوڵەیەکی مێژوویی سەرتاسەری هەیە کە دواجار لە فۆرمی وردتر و جوڵەی لابەلاییدا دەردەکەوێت، یاخود کۆمەڵێک وردە جوڵەی بچوک هەیە کە لەوانەوە ڕۆح و نیشانەی جوڵەیەکی سەرتاسەری دەستنیشاندەکەین؟ ئاخۆ جوڵە شتێکی نەپچڕاوە و گەشەیەکی بەردەوامە، یاخود کۆمەڵێک پچڕان و لابەلابوونەوە و دابڕان و دەرکەوتەی کوتوپڕە کە یاسایەکی گشتی کۆیان ناکاتەوە؟ ئاخۆ جوڵە تەنیا لە ناوەوە دەخولقێت یاخود کۆمەڵگا قەوارەیەکە دەشێت لەدەریشەوە بیجوڵێنین و لە ڕێگای چاندنی کۆمەڵێک ڕەگەزەوە هەر لەدەرەوە ئاڕاستەی دیاریبکەین ؟ ئایا هاتنی بەرهەمەکانی گەشەی دەرەوە، جوڵەی ناوەکی دەخولقێنێت و ئەگەر دەیخولقێنێت چۆن؟ ئایا جوڵەی مێژوویی دەوەستێنرێت و دەکرێت مێژوو لە جێگایەکدا ڕابگیرێت؟ ئاخۆ جوڵە حەتمییە و غایەتدارە یاخود ناکرێت پێشتر پێشبینی دەرەنجامەکانی بکەین؟. بە کورتی گەر لە مانای گۆڕان و جوڵە ڕانەمێنین ناتوانین لەو ڕەهەندە سەرەکییە تێبگەین کە مێژووی لەسەر بەندە، ناتوانین لەو ڕۆحە ڕابمێنین کە مێژوو دەجوڵێنێت. فەرامۆشکردنی تێڕامان لە فەلسەفەی گۆڕان، فەرامۆشکردنی تێڕامانە لەو مەکینە گەورەیەی مێژوو دەجوڵێنێت. ئێمە لە مێژوونوسینی خۆماندا سەرەنجی هەندێک لە بەرهەمی ماشێنەکەمان داوە، بەڵام هەرگیز سەرەنجی دینەمۆی گەورەی ماشێنەکەمان نەداوە. تاکە ڕێگایەک کە قووڵ مێژوو بە فەلسەفە و کۆمەڵناسییەوە دەبەستێتەوە دیاریکردنی تێگەیشتنێکە بۆ چەمکی جوڵە و گۆڕان، مێژوو بەبێ بوونی وێنەیەکی ئاشکرا دەرهەق بەم دوو چەمکە هەرگیز نابێتە زانستێکی مێژووناس.

لە کۆتاییدا واهەستدەکەم ساتەوەختی ئەوە هاتبێت خوێندنەوەی مێژوویی ئێمە لابەلابوونەوەیەکی ڕادیکاڵ و ستراتیژی بەخۆیەوە ببینێت، لەو قەیرانە گەورەیە دەریبهێنێت کە ئەوانەی لە بواری مێژوودا کاردەکەن، بەحوکمی نوقمبوونیان لە ناو میتۆدە تەقلیدییەکاندا، هەستی پێناکەن. مێژوونوسین بەوجۆرەی لەسەدەی بیستدا پەرەدەستێنێت و دەبێت بە

بوارێکی کارکردنی ڕۆشنبیرانی کورد، لەسەرڕێکەوە نیشانەی سەرهەڵدانی هوشیارییەکی نوێیە بە مێژوو کە لەسەدەکانی تردا نەبووە، وە یەکێکە لەو کایانەی لەسەرەتاوە بزوێنی خەیاڵی مەعریفی ئێمەبووە، بەڵام لەگەڵ خۆیدا هەموو کەموکورتی و نەخۆشییە کوشندەکانی ناو ڕۆشنبیریی کوردی هەڵگرتووە. بێتوانایی ئەم کایەیە لە ڕەخنەکردنی خۆیی و خوێندنەوەی ناوەکی قەیرانەکانیدا نیشانەیەکی گەورەی مردنی «هەستی مێژوویی » و «هەستی ڕەخنەییە» لە کولتووری ئێمەدا.

**ئێمە دەخوێنینەوە، بۆئەوەی خۆمان بنوسینەوە**

**رۆلان بارت**

**کتێب لە وشە و بێدەنگی دروست دەبێت**

**جیل دۆلۆز**

گومان نییە کە کۆمەڵگای ئێمە لەم قۆناغەدا وێنەیەکی نادروستی لە سەر خۆی هەیە، وێنەیەک برێکی زۆر لە ڕەزامەندی نابەجێ و ڕەخنەی نابەجێ لەگەڵدایە، بە جۆرێک دەتوانین بڵێین هەڵسەنگاندنی ئێمە بۆ ڕۆحی ئەم قۆناغە و بۆ دیاردە ناوەکییەکانی زۆرجار نەپێک و دوور لە واقیعییەتن. مارکس لە ئایدۆلۆژیای ئەڵمانیدا سەرەنجێک دەنوسێت، لە ئێستای ئێمە نزیکەو بۆ تێگەیشتن لە بارودۆخی تێڕوانینمان لە ئێستامان مانادار دەکەوێتەوە. ئەو دەنوسێت «لە ڕەوتی ژیانی ئاساییدا هەموو دوکاندارێک باش دەزانێت لە نێوان خۆوێناکردنی کەسێکدا بۆ خۆی و حەقیقەتی ئەو کەسەدا جیاکارییبکات». بەڵام لە ڕاستیدا ئەو جیاکارییە بەو ئەندازەیەش سادە نییە کە مارکس قسەی لێدەکات، کاری مێژوونوسی ئێمە تا ئێستا بەم زانیارییە سادە و ساکارە نەگەیشتووە، ئێستاش هەر سەردەم و قۆناغێک سەبارەت بە خۆی هەر شتێک بدرکێنێت و هەر خەیاڵسازییەک بکات وشە بە وشە باوەڕی پێدەکەین. لەم وتارەدا مەبەستم نییە بە مێژوونوسان بڵێم باوەڕ بەو ڕستە و وێنانە مەکەن کە ئەم سەردەمەی ئێمە دەربارەی خۆی بڵاویدەکاتەوە، واتە باوەڕ بە برێکی زۆری ئەو ستایشانە مەکەن کە ئاڕاستەی ئەمڕۆی ئێمە دەکرێت، وەک چۆن برێکی زۆری ئەو ڕەخنانەی لەم سەردەمەش دەگیرێت، خاڵی نین لە نیازی خودگەرا و وەهمی ئۆپۆزسیۆنگەرایی نادروست، بەڵکو نیازمە بڵێم پڕوپاگەندەی سیاسی ئەم قۆناغەی ئێمە بۆ خۆی، خۆوێناکردنی وەک

دەمی کرانەوە و گەشە و دەرچوون لە جوغزی خود، بەر گەلێک لەمپەری ڕاستەقینە دەکەوێت و ڕووبەڕووی گەلێک پرسیاری بێ وەڵام دەبێتەوە. لە ڕاستیدا بۆ دەرخستنی نادروستی ئەم خوێنەکردنە، بەس نییە تەنیا بۆ هەندێک فاکتی سیاسی و ئابووری بگەڕێینەوە، بەڵکو لەوانە گرنگتر؛ پرسیارە لە شوێنی پەیامی مرۆڤ لەم سیستمەدا. مەبەستم لە پەیام ئەو ئەرکە دینی و میتافیزیکییە نییە کە یەکێک پێیوایە خودا بۆی دیاریکردوە، بەڵکو مەبەستم لە پەیام ئەو بانگەشە فیکرییەی مرۆڤە، کە لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا دەیەوێت بژی و لەسەر زەمینێکی مێژوویی دیاریکراودا خۆی تاقیبکاتەوە و هێزی خۆی بجەربێنێت. بیروڕاکان بۆیە لە دایکدەبن، تا لەساتی خۆیاندا هێزی خۆیان تاقیبکەنەوە و بژین، حوکمدان بەسەر قۆناغێکدا، یان بڕیاردان لەسەر ئەو وێنەیەی کە سەردەمێک بۆ خۆی دەکێشێت، بەشێکی بەو پێودانە دەکرێت، مرۆڤ لەو دەمەدا بۆ هێزی داهێنانی مرۆڤ بگەڕێت و بڕی تێکەڵاوبوونی ئەو هێزە بە ژیان بخوێنێتەوە. بە کورتی مرۆڤ دەتوانێت جەوهەری سەردەمێک لە ڕێگای چارەنوسی ئەو تێکستانەوە بخوێنێتەوە کە لەویادا لەدایکدەبن. کاتێک دەتوانین وەک مارکس دەڵێت لە نێوان وێنەکانی سەردەمێک و حەقیقەتی ئەو سەردەمەدا جیاکاریبکەین کە تێبگەین لەو سەردەمەدا چی بەرهەمهاتووە و چارەنوسی ئەو بەرهەمانە چی بوون.

لودفیگ فیتگنشتاین، لە «تێبینییە فەلسەفییەکان»ـی خۆیدا دەنوسێت «کە جیهانی ڕوداوەکان دەرەکات و ئەبەدیی بێت، مرۆڤ چۆن دەتوانێت دەربارەی بدوێت؟ شەپۆلی ژیان و شەپۆلی جیهان دەڕژێنە ئەوێکانەوە. ڕستەکانی ئێمەش تەنیا لەم ئان و ساتەدا دەشێت ڕاستی و دروستیان تاقیبکرێتەوە، تەنیا لە ئێستادا ئەزموندەکرێن، لەبەرئەوە دەبێت بە جۆرێک دروستبکرێن بشێت پاساویان هەبێت و ئەزمایشبکرێن، دەبێت سیفاتی ئەوتۆیان هەبێت دەرفەتبدات ئەم ئانوساتە ئەزموونیان بکات». بە مانایەکی تر ئەم قۆناغەی ئێستا شانۆی تاقیبوونەوەی ڕستەکانی ئێمەیە، بەڵام بە پێچەوانەی بۆچوونی فیتگنشتاینەوە، ڕاموایە، بەس نییە ڕستەکانی ئێمە هەڵگری سیفاتگەلێک بن کە زەمان و سەردەم

تاقیانبکاتەوە، بەڵکو دەبێت زەمان و سەردەمیش هەڵگری سیفاتگەلێک بن هێزی تاقیکردنەوەیان هەبێت و ڕێگای تاقیکردنەوە ببەخشن و دەرفەت بۆ ڕستەکان سازبکەن تاقیببنەوە. بۆ ئەوەی لە سەردەمێک تێبگەین دەبێت لە چارەنوسی ڕستەکانی خۆمان تێبگەین، کە جگە لەم ئان و ساتە سەردەمێکی تریان بۆ ئیشکردن و خۆتاقیکردنەوە نییە. بۆئەوەی وێنەکانی قۆناغێک دەربارەی خۆی بخەینە بەر خوێندنەوەوە، دەبێت بپرسین ڕستەکان و تێکستەکانمان لەم سەردەمەدا چۆن ژیان، چ دەرفەتێکی تێکەڵاوبوون و ژیانیان هەبوو، ئاخۆ تەنها کۆمەڵە ڕستەیەک بوون کە فڕین و ماڵیان بەجێهێشت و نەگەیشتنە هیچ ناونیشانێک، ئایا ئێمەی نوسەران تێکستەکانی خۆمان بۆ کوێ نارد و بە چ ئەدرێسێکی دی گەیشت؟؟. لێرەدا مەبەستم لەوە نییە کە بپرسم ئاخۆ سیاسییەکان یان هوشیاری دەستەجەمعی ئێمە تێکستەکانی ئێمە دەبیستن، لەو ڕوانگەیەشەوە حوکم بەسەر تەواوی قۆناغەکەدا بدەم، ئەمە تەفسیرێکی سادە و نادروستی ئەو قسانەیە، من مەبەستم لەوەیە، ئاخۆ سەردەمی ئێمە بە گشتی ئەو هێزەی تێدایە کە تێکست وەرگرێت و کاری لەسەربکات و دووبارە بینوسێتەوە؟. هێزی تێدایە «لە ڕێگای بەشداریکردنەوە لەگەڵ نوسەردا» ئەوەی نوسین نایڵێت، ئەوەی تێکست ئاشکرای ناکات، ئەوەی لە نێوان گووتراوەکاندا ناڕاستەوخۆ گووتراوە، ئەوەی لە ژێر ڕستەکانەوە هەیە بیڵێت و بیبینێت. واتە بە گشتی پرسیاری من سەبارەت بەو کارلێکەیە کە دەبێت لە نێوان تێکست و سەردەمی خۆیدا هەبێت، کارلێک بەو مانایە نا خەڵکانێک لە ناوەڕۆکی تێکستەکە تێبگەن و بتوانن ڕستەکانی بڵێنەوە، بەڵکو بەو مانایەی کەسانی وەک بارت و دۆلۆز باسیدەکەن، بە مانای بکرێت لەسەر حیسابی ئەو تێکستانە تێکستی تر دروستبکەین، ڕێگای تر بکەینەوە، قسە لە گووتراوەکان بکەین، تێکست وەرگرین و بە شێوەی دی بیدەینەوە، بیشکێنین و شتی دیکەی لێ بسازێنین، لە ناویدا بنوسین، بیکەن بە گۆرەپانی «ئیش» و «گەمەکردن».

بە کورتی کرانەوەی کۆمەڵگایەک لە ڕێگای ئەو پەیوەندییە بازرگانیانەوە

ناخوێنرێتەوە کە بازرگانەکانی وڵاتێک لەگەڵ بازرگانەکانی دەرەوەدا دەیکەن، لە رێگای ئەو تەوقە و ماچ و سڵاوانەوە تەماشاناکرێت کە سیاسی و دیپلۆماتەکانی میللەتێک لەگەڵ سیاسی و دیپلۆماتەکانی دەرەوەدا دەیکەن. کرانەوەی راستەقینەی کۆمەڵگا بە کرانەوەی خوێنەران و رۆشنفیکرەکانی ئەو قۆناغە دەپێورێت بەسەر میتۆدێکدا بتوانن لە رێگایەوە ئەوەی لە فیکر و بە داهێنان بەرهەمدێت سەرفیبکەن، بەوە دەخوێنرێتەوە چەند ئەو سەردەمە هێزی تاقیکردنەوەی رستەکان و تێکستەکانی تێدایە، ئیرادەی ئیشکردنی لەسەر تێکستەکان تێدایە «ئەو تێکستانەی کە هەم لە ناوخۆیدا بەرهەمدێن و لەدەرەوەش».

بۆئەوەی زیاتر خۆم روونبکەمەوە، دەگەرێمەوە سەر هەندێک تێکستی تر . رۆلان بارت شێوە پێناسەیەکی تێکست دەخاتە بەردەستمان کە بە رێگایەکی دی لە هەمان بۆچوونمان نزیکدەکاتەوە، بارت دەڵێت «تێکست بە مانا مۆدێرنەکەی، بەو مانایەی ئێمە دەمانەوێت پێیببەخشین، جیاوازە لە کاری ئەدەبی، واتە تێکست بەرهەمێکی ستاتیکی نییە، بەڵکو جۆرێکە لە پراکتیکی ئاماژەیی. تێکست بونیاد نییە، بەڵکو بونیادسازییە، تێکست ئۆبێکت"بابەت "نییە، بەڵکو کارکردن و گەمەکردنە».

دیارە ئەم برگەیەش وەک زۆربەی گوزارە و دەربرینەکانی رۆلان بارت تێگەیشتنی بۆ ئەو کەسانەی شارەزای زمانی بارت نین ئاسان نییە. بارت لێرەدا جیاکارییەکی گرنگ لە نێوان تێکست و کاری ئەدەبیدا دەکات، بەڵام گرنگتر لەم جیاکارییە ئەو خاڵەیە کە بارت تێکست وەک بونیاد تەماشاناکات، واتە وەک پێکهاتێک کە فۆرم و مانا و ماهییەتی کۆتایی خۆی وەرگرتووە و تەواوبووە، کە دەڵێین تێکست بونیاد نییە، بەڵکو بونیادسازییە، واتە نوسەر شتێکی ناتەواومان دەداتێ، کارێکمان دەداتێ کە کاری زۆر ماوە بگاتە شێوە و روخسارێکی تایبەتی، یارییەکمان بۆ بەجێدەهێڵێت کە هێشتا زۆری ماوە بگاتە کۆتایی، ئەوە ئیشی ئێمەیە کە کورانی ئەم سات و سەردەمەین ئەو پرۆسەی بونیادسازییە تەواوبکەین. فەرمانی ئێمەیە ئەو ئیشە بگەیێنینە کۆتایی و یارییەکە قۆناغێک بەرینە پێشێ. تێکست کە دەگاتە دەستی ئێمە بە ناتەواوی دەگات، ئەوە

ئێمەین کە دەبێت تەواویبکەین. وەک دۆلۆزیش دەڵێت«تێکست لە وشەو بێدەنگی دروستدەبێت». ئیشی ئێمە تەواوکردنی وشەکان و بەکارهێنانی دەنگی خۆمانە بۆ پڕکردنەوەی بێدەنگییەکان، بۆیە لە ڕاستیدا شتێک نییە ناوی خوێندنەوەی ڕووت و پاسیڤ و بێلایەن بێت، بەڵکو شتێکی دی هەیە کە کرداری تیانوسینە، نوسینە لە ناو نوسیندا، شکاندنی برگە بێدەنگەکان و قووڵکردنەوەیەتیی، هەڵکەندنێتی.

هەرگیز ئارەزووی خوێندنەوە لە ئارەزووی نوسین جیاناکرێتەوە، ئارەزووی ژیانیش لە ئارەزووی نوسین جیاناکرێتەوە، نوسین هەر خودی ژیانە کاتێک بۆ بەشە ونبووەکانی خۆی دەگەڕێت.

بەڵام چی دەبێت، گەر ئێمە تێکستمان وەک یەکەیەکی داخراو وەرگرت، وەک ئیشێک کە چیدی پێویستی بە ماندووبوونی ئێمە نییە، وەک یارییەک کە کۆتایی هاتووە و ئێمە دوای تەواوبوونی تەماشایدەکەین؟ ئەوە مانای ئێمە لەسەردەمێکدا دەژین ئیشە ناتەواوەکان بە ئیشی تەواو دەزانێت، قەناعەتەکانی ئێستا بە دوا لەنگەر دەزانێت و لە پشت ڕووکەشەوە بۆ هیچی تر ناگەڕێت، لەسەر ناکامڵی دەخەوێت و بەسەر مانا ئامادەکاندا کڕدەکەوێت. قۆناغی ئەمڕۆی ئێمە، کە لە ئاستی سیاسیدا قۆناغی ڕەزامەندی نوخبەیەکی سیاسییە کە بێهۆ لە خۆی ڕازییە، قۆناغی توڕەبوونی خەڵکانێکیشە کە توڕەییان خاڵییە لە ئاسۆ و خاڵییە لە ئەلتەرناتیڤ، لە ئاستی ڕۆشنبیریدا بۆتە ئەو قۆناغەی تێکستەکان و ڕستەکان و گووتارەکان بە وێڵی و بێمانا و بێپاوەر دەسوڕێنەوە، ئەو قۆناغەیە کە پەیامەکان دەڕۆن و هەرگیز ناگەنە وەرگر و گوێگرەکانیان، نوسین لە بۆشاییەکی قووڵ و پوچگەراییەکی بێئەندازەوە ئاڵاوە، واتە لەسەردەمێکی مێژوویدا دەژین ناتوانێت وێنەی ڕاستەقینەی خۆی بدۆزێتەوە، فیکر ناتوانێت ڕاست و دروستی خۆی تاقیبکاتەوە، تێکستیش هێندەی لەدایکدەبێت دەمرێت و گەمەزانێکی شارەزا نادۆزێتەوە دەست بۆ بێدەنگییەکانی بەرێت .

تراژیدیای کۆمەڵگا لە تراژیدیای تێکستەوە دەست پێدەکات. تێکست هێمای ئیشکردن و ژیانی عەقڵە، ئاماژەی کارکردنی هەست و نەستە

دەستەجەمعی و فەردییەکانە، کە تێکست وێڵبوو، کە تێکست خاوەنی خۆی نەدۆزییەوە، کە کەسێک نەبوو دووبارە لە ناو تێکستدا بیربکاتەوە و لەدوای تێکستەوە و وەک درێژکراوەی ئەو تێکستی خۆی بنوسێتەوە، درێژە بە یارییەکەی بدات، بیگێڕێتەوە بۆ سەرەتا، بۆ پاکێتی، وابکات تێکست مەرجەعی واقیع بێت نەوەک تەنیا واقیع مەرجەعی تێکست بێت، کە کۆمەڵگایەک هەبوو بتوانێت بەبێ تێکست و لەدەرەوەی تێکست و بێ کۆمەکی تێکست بژی و بیربکاتەوە، لەم دۆخەدا جیهان و کۆمەڵگا وەک دوو شوێنی وشک و بێرۆح دەردەکەون کە هێشتا لە دۆخی نارێکیدا دەژین، لە دۆخی «بەر لە دۆخی بوونە وشە»دا، دۆخێک تێیدا تێکستەکان بە مێشولەی تەمەنکورت دەچن، دەردەکەون و لە ساتی خۆیان و لە جێگای خۆیاندا دەمرن. ئەوەی ئەمڕۆ ڕۆژنامە و گۆڤار و سایتە کوردییەکان بخوێنێتەوە، دەبینێت چیدی تێکست لە دونیای ئێمەدا لە پەیوەندییەکی قووڵەوە بە تێکستی ترەوە بەرهەمنایەت، بەدەگمەن تێکستمان هەیە ئاماژە بێت بۆ تێکستگەلی دیکە، دیالۆگی مانا بێت لەگەڵ مانادا، بازدانی واتا بێت لە سیاقێکەوە بۆ سیاقێکی دی. بەڵکو وەک پەرچەکردارێکی غەریزییانە و قسەئارا دژ بە ناخۆشییە ڕۆژانەکان دێتەدەرێ، گلەییەکی کۆمەڵایەتی و سیاسیە کە شوێنی تاقیکردنەوە ڕاستەقینەکانی فیکر و بونیادسازییە ڕاستەقینەکانی تێکستی گرتۆتەوە. تێکست لەلای ئێمە بیرکردنەوە نییە لەگەڵ بیرکردنەوەیەکی تردا یاخود دژ بە بیرکردنەوەیەکی تر، پڕکردنەوەی بێدەنگی نییە بە مانا دۆلۆزییەکەی، بەڵکو زمانێکی کۆنکرێتی بێڕەهەندە کە نە هیچ پێش خۆی تەواودەکات نە شەهوەتی تەواوکردنی خۆشی لای کەس دەبزوێنێت، نە گەمەیەک تەواودەکات و نە گەمەیەک جێدەهێڵێت تەواوبکرێت، ڕەهەندی یاریکردنی دۆڕاندوە، لەوە دەرچووە ئیشێک بێت ئیشی لەسەر بکەین، لەوە کەوتووە بێدەنگییەک بێت، بینوسینەوە. بە کورتی ئەو لێشاوە گەورەیە لە وشەی بێمانا کە ڕۆژانە لە دونیای ئێمەدا بەرهەمدێت، نیشانەی دەوڵەمەندی دونیای ئێمە نییە لە تێکستدا، بەڵکو نیشانەی دیلبوونی ئێمەیە لە قۆناغی بەر لەوشەدا، نیشانەی ئەو تراژیدیا گەورەیەی

تێکستە کاتێک دەبێتە سوڕانەوەیەکی پوچ بەدەوری هیچدا.

رۆلان بارت بە ڕوونی و قەشەنگی لە کتێبەکەیدا «دەربارەی خۆم» تەعبیری لەوە کردوە و دەڵێت « من لە کۆمەڵگایەکی پڕ نێرەردا ـ مرسل ، Sender » دەژیم، من خۆشم یەکێکم لەو نێرەرانە، هەموو ئەوانەی کە دەیانبینم یاخود بۆم دەنوسن، یان کتێبێکم بۆ دەنێرن، تێکستێک یان بڵاوکراوەیەک یان شەهادەیەکم بۆ ڕەوانەدەکەن، ئەوانەی ناڕازیبوونێک یاخود داوەتنامەی نمایشێک یان پێشانگایەکم ئاراستەدەکەن، هەموو نێرەرن. ئێستا شەهوەتی نوسین و بەرهەمهێنان لە هەموو لایەکەوە هەڵدەقوڵێت. بەڵام بەوەدا تەواوی ڕەوت و چۆنێتی ئیشەکە دیاریکراوە، ئیدی بەرهەمە ئازادەکان قەیرانزا و سەرلێشێواو و دەرەحاڵ دەردەکەون . زۆربەی کات تێکستەکان و نمایشەکان ڕوو لە جێگایەک دەکەن، لەوێدا کەس نییە لێیان بپرسێتەوە، لە بەدبەختی خۆیاندا لەگەڵ هەڤاڵ و هاوەڵدا ناچنە پەیوەندییەوە و شەریکێکی ئەوتۆش نادۆزنەوە. دەرەنجامی ئەمجۆرە خۆخاڵیکردنەوە دەستەجەمعییە لە نوسیندا، کە خەڵکانێک وەک ڕووی یۆتۆپی کۆمەڵگایەکی ئازاد دەبینن، شێوەی کارەسات و قیامەتی وەرگرتووە» .

ئەم ڕاستییە کە ڕۆلان بارت بۆ خۆرئاوا بە دروستی دەزانێت، بۆ ئێمە سەد جار دروستترە. نوسین لە کۆمەڵگای کوردیدا هێدی هێدی بەرەو ئەوە دەڕوات، ببێتە خۆخاڵیکردنەوەیەکی ڕووت، خۆخاڵیکردنەوەی ڕق یان تورەیی یان هەر هەستێکی دی، نوسین لەم ساتەوەختەی مێژووی ئێمەدا لەوەکەوتووە درێژکراوەی مێژووی نوسین بێت، بەڵکو جۆرە نوسینێک لە گۆڕێیە بێ پاشڕەوت و بێ پێشڕەوت، نوسینێکە لە ڕووی مەعریفییەوە ناچێتە ناو ڕەوش و ناوکۆیی هیچ کایەیەکی مەعریفی، نابێتە هەڵگری ڕۆحی سەردەمێک کە لە ڕۆژگارەکانی دیکەدا درێژکراوەی هەبێت. ئێمە ئێستا لە جیهانێکدا دەژین توانای خوێندنەوەی نەماوە، واتە توانای دووبارە بەرهەمهێنانەوەی تێکست و پڕکردنەوەی بە مانای نەماوە، چیدی چارەنوسی هیچ تێکستێک دیارنییە بۆ کوێ دەچێت. ئەو تراژیدیایەی

بارت باسیدەکات «ترازیدیای ئەو تێکستانەی نە هاوڕێ و نەشەریک دەدۆزنەوە، ڕوو لە کۆمەڵێک ناونیشان دەکەن و لەوێدا کەس لێیان ناپرسێتەوە». لە خۆرهەڵاتیشدا بۆتە چارەنوس و قەدەری تێکست. بۆیە دەبێت تەواو ئاگاداربین، کۆمەڵگای داخراو، ئەو کۆمەڵگایەیە کە تێیدا نوسین ناگاتە ناونیشانی خۆی و خوێنەری ئازاد و لەمپەرشکێن نادۆزێتەوە، کۆمەڵگایەکە تێیدا ڕستەکان تاقی ناکرێنەوە و ڕاست و دروستی خۆیان ناسەلمێنن، هەر کۆمەڵگایەکیش دەرفەتی نەدا بە تێکستەکان تاقیببنەوە و بژین، کۆمەڵگایەکە ناتوانێت وێنە خەیاڵی و نادروستەکانی خۆی لە دۆخە ترازیدی و ڕاستەقینەکە جیابکاتەوە کرانەوە بەسەر تێکستدا مەرجی کرانەوەیە بەسەر خود و دونیادا.

لە قووڵایی هەموو نوسەرێکدا دوو بوونەوەر دەژی، دوو کاراکتەر کە لە جۆرە پەیوەندییەکی ئاڵۆزدان، بوونەوەرێکیان ئەو خودە کۆمەڵایەتی و سروشتییەیە کە لە ناخماندا ڕواوە، بوونەوەرەکەی دیکەشیان نوسەرەکەی ناومانە. بەبێ ئەم جیاکارییە ئەستەمە لە زۆر کێشەی گەورەی ناو تیوری ئەدەب تێبگەین. واتە مرۆڤێکی سروشتی و نوسەرێک لە ناخماندا دانیشتووە، کە نە بەتەواوەتی پێکەوە نوساون و نە بەتەواویش لە یەکدی دابڕاون. ئەوە قووڵترین جۆرە دابەشبوونێکی ناوەکییە کە ژیانی نوسەرێک داگیردەکات. پەیوەندی نێوان ئەم دوو مرۆڤە، کە یەکێکیان دەژی و یەکێکیان دەنوسێت، لە هەرە ئاڵۆزترین پەیوەندییەکانە، ئاخۆ دەتوانین بڵێین ئەو مرۆڤەی دەنوسێت، فەرمانبەرێکە لە فەرمانبەرەکانی ئەو مرۆڤەی ناومان کە دەژی؟ ئاخۆ تەنیا ئەو شتانە دەنوسێتەوە کە ئەو مرۆڤە دەیزانێت و دەیەوێت بیڵێت؟ سنووری خەیاڵ و بیرکردنەوە و خواستەکانی هەمان ئەو سنوورەیە کە مرۆڤەکەی ناومان بۆی کێشاوە؟. یاخود نوسەرەکەی ناومان شتێک دەڵێت و حیکایەتێک دەگێڕێتەوە کە پەیوەندییەکی ئەوتۆی بەو چیرۆکانەوە نییە کە مرۆڤەکەی ناومان دەخوازێت بیگێڕێتەوە؟.

ڕەنگە جیاکارییەکە لای هەندێک ناشایستە و ناڕەوابێت، بۆ نمونە گەر لە ڕوانگەی فرۆیدییەوە تەماشابکەین سەیرکردنی نوسەر وەک بوونەوەرێکی جیاواز کە دەشێت سەربەخۆ بێت و تەعبیر لە شتێک بکات جیاواز بێت لە غەمی مرۆڤەکەی ناومان، کارێکی نەکردەیە، نوسین لای فرۆید تەعبیرێکی ڕەمزییە بۆ ئەو جیهانە نهێنی و نائاگا و نەناسراوەی لە ناوماندایە، هەر وەختێک مرۆڤەکەی ناومان حاشای لە شتێک کرد کە نوسەرەکەی ناو ڕۆحمان باسیدەکات، بەبڕوای ئەو ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئێمە وەک مرۆڤ بێگوناهین و نوسەرەکەمان جۆرە فەنتازیایەکی هەیە

جودایە لە خەیاڵ و فەنتازیای ئێمە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، نوسەر لە ناو مرۆڤدا دەستدەبات و لەو خەزێنە شاردراوەیەی نەست، لەو وێنە خەوتووانەی ناو «بێئاگایی»مان شتگەلێک دەردەهێنێت کە مرۆڤەکەی ناومان ناوێرێت ڕاشکاوانە بیانزانێت و بیاندرکێنێت. گەر بەو پێیە بێت، نوسەرەکەی ناومان هیچ نییە جگە لە «خودێکی گەورەتر» «خودێکی ئازاتر» کە دەوێرێت شتگەلێک بڵێت و ببینێت کە ئێمە وەک مرۆڤ ناتوانین و ناوێرین بۆ خۆمانی بدرکێنین. گەر بەشێکی گەمەی نوسەر «هێنانەوەیەکی سمبولیانەی شتە چەپێنراوەکان» بێت وەک فرۆید دەڵێت، ئەوا نوسەرەکەی ناومان مەحکومە بە کاری گەڕان و پشکنین لە بەشە تاریکەکەی ناخماندا. واتە جوگرافیای ئیشکردنی سنووری خودی مرۆڤانەی خۆمان نابەزێنێت و ئەوەی دەیڵێت و دەینوسێت و خەیاڵی بۆدەچێت، وابەستەی ئەو ئەگەرانەیە کە خودێکی بێدەنگکراو و چەپێنراوی ناو ناخی ئێمە دەیخاتە بەر دەستی. بە مانایەک لە ماناکان لای فرۆید نوسین هەمیشە تەعبیرە لە خود، نوسین کلیلی گەیشتنە بە ژوورە نهێنییەکانی ناو خود، ئەو ژوورانەی مرۆڤە ڕووکەشبینەکەی ناومان کە ژیانی سادە و ڕۆژانەی خۆی دەژی، نایبینێت. سوریالییەکانیش هەمانشێوە، پرۆسەی نوسین لەلایەن دابڕانە لە «خودە هوشیارەکەی ناومان»، گەڕانە بۆ خودێکی بنەڕەتی، خودێک کە دەکەوێتە ئەو دیوی خودەوە، بەڵام قسەکردن لەوەی پەیوەندییەکی ڕاستەخۆ لە نێوان نوسەرەکەی ناومان و مرۆڤەکەی ناوماندا نەبێت، بۆچوونێکە تا ئەندازەیەک دوورە لە فەزای بیرکردنەوەی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست... لای مارکسییەکان نوسین تەعبیرە لە «خودی هوشیارمان» کە شوێنگەی کۆمەڵایەتیمان دروستیکردوە، لای فرۆیدییەکانیش تەعبیرە لە «خودی ناهوشیارمان»، بەڵام لە هەردوو دۆخەکەدا هەمیشە هەر تەعبیرە لە خود.

ئەوەی وادەکات بە پلەی یەکەم گومان لەم تێزەیە بکەم، ئەوەیە نوسەرەکەی ناومان تەنیا کاری ئەوە نییە شتە چەپێنراو و حەرامەکان

بکات بە سەمبول و بیهێنێتەوە، بەڵکو گۆڕینی شتە سادە و ئاسایی و حەڵاڵ و ڕێپێدراوەکانیش بۆ سەمبول، یارییەکی گەورەی ئەدەبە. نوسەرەکەی ناومان تەنیا شتە نەناسراوەکان ناکات بە ڕەمز، بەڵکو شتە ناسراوەکانیش لە مانای خۆی دەردەکات و دەیانگۆڕێت بۆ سەمبول. ئەدەب بە پێوەری فرۆیدی ئەوەیە کە شتێکی نائاساییمان بۆ دەکات بە ئاسایی، بەڵام ئەوەی من لە ئەدەب تێگەیشتبم، فەرمانێکی تر و کارێکی پێچەوانەشی هەیە کە ڕووبەری هەرە گەورەی کارە ئەدەبییەکان داگیردەکات کە ڕووبەری گۆڕینی شتە ئاساییەکانە بۆ نائاسایی. لای فرۆید و لای سوریالیستییەکانیش جیاکارییەک ناکرێت، لە نێوان ڕەمز لە ئەدەبدا، لەگەڵ ڕەمز لە «سیستمی دەرونی مرۆڤ»دا، رەمزی ناو ئەدەب هەر وەک رەمزی ناو خەون، بەرەمی نەستە و پەیوەندی بە قووڵاییە تاریک و چەپێنراوەکەی ژێر هوشیاریمان هەیە. لە کاتێکدا ئەم جیاکارییە زۆر گرنگ و گەورەیە بۆ تێگەیشتنی ئەدەب. ڕەمز لە ئەدەبدا بەدەر لە ئامازەکردن بۆ هەر شتێک هەیە و هەبووە. گەر لە جەوهەردا سەیربکەین نوسەرەکەی ناومان گەمەیەک دەکات کە مرۆڤەکەی ناومان ناتوانێت بیکات، نوسەرەکەی ناومان شتەکان لە ناوکۆیی و شوێن و ماڵی خۆیان هەڵدەکەنێت و جیهانێک دروستدەکات کە مرۆڤە سادە و ئاساییەکەی ناومان دەرەقەتی نایەت و ناتوانێت تیا بژی. جیاوازی گەورەی ئەم دوو جیهانە، لەیەک نەچوونیان، هۆیەکی گەورەیە بۆئەوەی تێبگەین کە نوسەرەکەی ناومان فەرمانبەرێکی بچوک و بێدەسەڵات و کۆیلەی مرۆڤەکەی ناومان نییە، نوسین ئاوێنەی خود نییە... بەڵکو لە خود تێدەپەڕێت و لە جوگرافیای دوورتردا ئیشدەکات. ئەو تێزەیەی کە پێیوایە دەتوانێت لە ڕێگای خوێندنەوەی نوسینەکانەوە مرۆڤەکەی ناو نوسەر بخوێنێتەوە ڕوانینێکی گەلێک ناکامە، هەموو پەیوەندییەکی میکانیکی لە نێوان تێکست و ڕۆحی نوسەردا ، نوسەر و تێکستیشمان لێ وندەکات.

ئەدەب کارخانەی دروستکردنی ئەو ڕەمزانەیە کە مەرج نییە هەمیشە ئاماژەبن بۆ ڕەهەندێکی دەرونی یان عەقڵی، بەڵکو بەپێچەوانەوە زۆرجار ئازادکردنی شتەکان لە مانا سیاسی و دەرونییەکەیان، بەشێکی گرنگی داهێنانی ئەدەبە. نوسەر تەنیا مانای شتەکان لە دەسەڵاتی زمان ڕزگارناکات، بەڵکو لە وێنە چەسپیوەکانی نێو دڵی مرۆڤە سادەکەی ناو ڕۆحی خۆشی.

لە ڕاستیدا پەیوەندی نوسەرەکەی ناومان بە مرۆڤەکەی ناومانەوە پەیوەندییەکی ئاڵۆزە، پەیوەندییەکی یەک ڕەنگ و یەک ڕوخسار نییە. پەیوەندییەکە هەموو ئەگەرەکانی ناو پەیوەندی دوو بوونەوەری هاوسێ و دوژمنیشی تێدایە، هەموو نوسەرێک و هەموو تێکستێک بەجۆرێک لە جۆرەکان ئەو پەیوەندییە بە شێوەی خۆیان دەژین، واتە بەبۆچوونی من یاسایەکی حەتمی لەو پەیوەندییەدا بوونی نییە، بەڵکو یارییەکی کراوە هەیە. ئەم پەیوەندییە لە ئاستی پەیوەندی خۆشەویستی و هاوڕێتییەوە دەست پێدەکات و بەهەموو ڕێگاکاندا تێدەپەڕێت تا دەگاتە ئاستی پەیوەندی دوژمنانەش. مرۆڤەکەی ناومان کەمجار واز لە نوسەرەکەی ناومان دەهێنێت بۆ خۆی ئازادانە گەمەی خۆی بکات، ئەوەی نوسەرەکەی ناومان ببێتە خزمەتکارێک بۆ گەیاندنی ئایدیاکان و خواستەکان و خەونەکانی ئەو مرۆڤە هەندێک جار تەواوی فەزای نوسین داگیردەکات، لەلای نوسەرە ئایدۆلۆژییەکان کە نوسین وەک کەرەستەیەکی سیاسی ڕووت سەیردەکرێت، خودە سیاسییەکەی نوسەر بەسەر تەواوی خەیاڵ و بیرکردنەوە و سەربەخۆیی نوسەرەکەی ناوەوەدا سەردەکەوێت، بەڵام ئەم دەردە تەنیا دەردی نوسەرە ئایدۆلۆژییەکان نییە، بەڵکو لە بوارەکانی دیشدا هەمان دەرد هەیە، ڕەنگە ڕۆماننوسێکی وەک «مارکیز دی ساد» نمونەیەکی گەورەی ئەو کێشەیە بێت، «دی ساد» کە ساڵانێکی درێژ لە زینداندا بوو، چیتر بواری ئەوەی نەبوو خواست و خەیاڵ و فەنتازیا سێکسوالییەکانی خۆی لە ڕاستیدا پراکتیکبکات، وەک لە ڕۆژانی ئازادیدا دەیکرد، لە بەرئەوە تەواوی ئەو خەیاڵ و هەوەسە توندانەی «دی

ساد»ی مرۆڤ هەیبوو، «دی ساد»ی نوسەر لە رۆمانەکانیدا دەینوسییەوە، «دی ساد»ی نوسەر هیچ نییە جگە لە خزمەتکارێکی خواستەکانی «دی ساد»ی مرۆڤ. ئەوەی «دی ساد»ی مرۆڤ دەستی پیاراناگات، «دی ساد»ی نوسەر لە رێگای فەنتازیاکانییەوە بۆی پڕدەکاتەوە. ئەو هەوەسە شێتانەیەی نوسین کە لە زینداندا «دی ساد» داگیردەکات، هەوەسێکی هێند بەهێزە کە نیشانیدەداتەوە نوسەرەکەی ناو مارکیز چەند لە ژێر فشاری مرۆڤە تینوو و سێکسبازەکەی ناویدا بووە. بەجۆرێک دەتوانین بڵێین کە لای «مارکیز دی ساد»، نوسەرەکەی ناخی هیچ نییە جگە لە خزمەتکار و یاداشتنوسێکی مرۆڤە پڕ خولیا و یاخیبوونەکەی ناوی.

بەڵام ئەم گەمەیە هەمیشە بەم چەشنە نییە، زۆرجار نوسەرەکەی ناومان هەوڵدەدات کاراکتەرێکی دژ و پێچەوانەی مرۆڤەکەی ناومانی هەبێت، بۆ نمونە دەشێت مرۆڤە ئاسایی و ژیانپێوەکە تەواو کەسێکی مۆرالی و شەرمن و ئاسایی بێت، بەڵام نوسینەکانی یاخیبوونێکی نهێنی بن لەو کاراکتەرە و هەڵوێستێکی پێچەوانەبن لە دژی ئەو، لەو بوارەدا هەمیشە قسەیەکی گرنگی رۆماننوسی یابانی «مۆراکامی»م دێتەوە یاد کە لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت «بۆیە لە رۆمانەکانمدا شتی نائاسایی روودەدەن، چونکە لە ژیانی خۆمدا هەرگیز شتی نائاسایی روونادات»، هەروەها «ئۆسکار وایلد» دەڵێت «هەندێک نوسەر ئەو شتانەی لە ژیاندا ونیانکردو، بە ئەدەب تیادەژین»، لێرەدا نوسەرەکەی ناومان نیشانەی یاخیبوونێکی رەمزییە بەسەر مرۆڤەکەی ناوماندا، پێدەچێت «تۆلستۆی» نمونەیەکی باشی ئەم مۆدێلە بێت، «تۆلستۆی» وەک نوسەر هەمیشە مۆرالیست و دیندار و کریستیانێکی باش بووە، بەڵام ژیانی خۆی و گەنجێتی گەشتێکی درێژە بەناو هەموو جۆرەکانی بەرەڵایی و دووری لە مۆراڵی دینییەوە، «تۆلستۆی» نمونەی ئەو نوسەرانەیە کە لە قۆناغێکی ژیانیدا ئەخلاقی خۆی و ئەخلاقی نوسینی لە ناکۆکییەکی قووڵدان، بەچەشنێک دواتر «تۆلستۆی» ماوەیەکی درێژ تەنیا لە خولیای ئەوەدا

دەبێت چۆن هاوسەنگی و تەبایی بۆ ئەو هاوکێشەیە بگێڕێتەوە. واتە دەشێت نوسەرەکەی ناومان یارییەک بکات تەواو پێچەوانەی خواست و ویست و ژیانی مرۆڤەکەی ناومان... ڕۆڵی ڕاستکەرەو ڕێنماییکەر یاخود تێکدەر و لە ڕێ لادەری بۆ ببینێت.

نوسەرەکەی ناومان مەخلوقێکی یاریکەرە، تەنیا لە سنووری خواستە ئاشکرا و نهێنییەکانی خوددا ناوەستێت، بەڵکو سنووری گەمەکانی گەورەترن. تەنیا ئەو چیرۆکانە ناگێڕێتەوە کە خود دەخوازێت بیگێڕێتەوە یان بیشارێتەوە، بەڵکو جیهان، هەموو جیهان شوێنی یاریکردنێتی. جیهانی مرۆڤەکەی ناومان تەنیا مەتریالێک لە مەتریالەکانی نوسەرەکەیە، مەیدانێک لە مەیدانەکانی یارییەکانێتی، ئەو هەمیشە لەدەرەوەی خود، لەدەرەوەی هەموو ئەو سنوور و جوگرافیایانەی خود پێشکەشیدەکات، بۆ جێگای دیکە دەگەڕێت. لە ڕاستیدا ئەوەی بڵێین کە نوسەرەکەی ناومان ئیشی تەعبیرکردنە لە مرۆڤەکەی ناومان هەڵەیە، بەڵام ئەوەی بشڵێین کە نوسەرەکەی ناومان کارێکی بە مرۆڤەکەی ناومانەوە نییە هەڵەیە. ڕاگەیاندنی مەرگی نوسەر لای «ڕۆلان بارت»، یەکێکە لەو تێزە بنەڕەتیانەی کە هەوڵدەدات پەیوەندی نێوان تێکست و نوسەر ڕابگەیێنێت، وشەی «نوسەر» لای بارت ئامارەیە بۆ «مرۆڤە ئاساییەکەی ناو نوسەر» بۆ «خودە ڕۆژانە و سروشتییەکەی». ئەوەی کێشەکە لای بارت قووڵدەکاتەوە جیانەکردنەوەی «نوسەرە» لەو مرۆڤە سادەیەی ناومان، بەبۆچوونی من دەسەڵاتی نوسەر بەسەر تێکستدا دەسەڵاتێکی ڕاستەقینەیە، ئەوەی دەسەڵاتی ڕاستەقینەی نییە خودە سادە و ڕۆژانەکەیە، مرۆڤە ئاساییەکەیە کە دەبێت لە نوسەر جیاییکەینەوە، ئەوەی لای بارت مردوە نوسەر نییە، بەڵکو هێزی خودە بەسەر نوسیندا، هێزی مرۆڤەکەی ناومانە بەسەر خەیاڵ و فەنتازیا و زمان و بۆچوونەکانماندا. نوسەر وەک دروستکەری دەق نامرێت، بەڵکو ئەو هێزەیە کە دەق لە دەسەڵات و خواستی کۆنترۆڵکردنی ڕەهای مرۆڤەکەی ناومان دەپارێزێت. نوسەر وەک هێزێکی خولقێنەر لە نوسین لە شەڕ و

تێکەڵاوی و لێک جودابوونەوەیەکی بەردەوامی نێوان ئەو دوو پۆڵە دروستدەبێت. بەڵام قسەکردنیش لە مردنی تەواوەتی خود کارێکی نەکردەیە، ڕاستە هەمیشە لە نێوان منی مرۆڤ و دەقدا بەربەستێک هەیە کە نوسەرەکەی ناومانە، بەڵام ئەم بەربەستە، ئەم بوونەوەرە کە بەردەوام شەڕ بۆ سەربەخۆیی خۆی دەکات لە خواست و ویست و ئارەزووەکانی ئەو مرۆڤەی لێوەی هاتۆتە دەرەوە، هەمیشە دەکەوێتە ژێر گوشاری گەورەوە، خود بە ڕێگای جیاواز جیاواز دەیەوێت بگەڕێتەوە، نوسەرەکەی ناویشمان بە ڕێگای جیاواز جیاواز ڕێگری لەو گەڕانەوەیە دەکات. تا کاراکتەری نوسەرەکە بەهێزتر بێت لە کاراکتەری مرۆڤەکەی ناومان گەڕانەوە و هاتنەوەی خواستەکانی ئەو بۆ ناو ئەدەبیات سەختتر دەبێت، تا نوسەرەکەی ناویشمان لاوازتربێت، خێراتر دەبێتە کۆیلەی ئەو مرۆڤە. نوسەرەکەی ناومان ناتوانێت بە تەنیا بە ڕێگادا بڕوات، پێویستی بە خەزنەیەک لە هەست و وێنە و یادەوەری و زانیاری و هەڵوێستگیریی هەیە کە بەشێکی لە مرۆڤەکەی ناومانەوە وەردەگرێت، بەڵام ئەم بابەت و هەست و زانیاریانە بەردەوام دەخرێنە خزمەت دروستکردن و نیشاندانەوەی جیهانێکەوە کە جیهانی خود نییە. نوسەر لەسەر بنەمای وەرگرتن و خیانەتکردن لەخود دروستبووە. نوسەرەکەی ناومان هەتا کاتێک بە مەبەستیش بەدوای خود دا دەگەڕێت، هەتا لەو کاتانەشدا کە ئامانجی درکاندن و هێنانە زمانی خودە، لەوە ناکەوێت ئەو یارییانە بکات کە لە خودی جیادەکاتەوە. وەک چۆن لە ئاستی مامەڵەکردنی دونیای دەرەوەدا، نوسین گۆڕینی شتە ئاساییەکانە بۆ وێنەی نائاسایی، لە ئاستی مامەڵەکردن لەگەڵ ناوەوەی مرۆڤیشدا نوسین کاری خیانەتکردنە لەو وێنە و خولیایانەی کە خود بە نیازە ئاشکرایانبکات... نوسەر هەمیشە بۆ خولقاندنی جیهانێک دەگەڕێت کە پێش ئەو بوونی نییە، لە بەرئەوە ناچارە خیانەت لە خۆی و لە دونیا بکات.

ئەوەی زۆرجار لە نوسینمان دەتۆرێنێت، دەسەڵاتی ڕەهاو بێسنووری دیاردەیەکە بەسەر کۆی ماناو لایەنە جیاوازەکانی ژیاندا، هەر کاتێک بابەتێک ژیانی خستە ژێر ڕەحمەتی خۆیەوە، کۆی بابەتەکانی دی دەبنە پەراوێزی بچوک و تەواوکاری ئەو، ژیان خۆی دەبێتە شوێن نمایشی ئەو، دەبێتە سەحنەیەکی خاڵی لە هەموو شتێک جگە لە تارمایی دەنگ وڕەنگی ئەو. دەبێت ئاگاداربین کە دەسەڵاتی ڕەهای بابەتێک بە مەرگی هەزاران بابەت دی کۆتایدێت.

یەکێک لەو پرۆسە ترسناکانەی دید و دونیابینی ئێمەشی دیلکردووە، بە سیاسیکردنی موتڵەق و بێبەربەستی هەموو شتێکی زیندەگی ئێمەیە. بە ئەندازەیەک دەکرێت بڵێین سیاسەت وزەگەلێکی مرۆڤانەی گەورەی ئێمە دەکوژێت، وزەیەک دەشێت بە چەندین کەناڵ و جۆگە و شوێنگەی دیکەدا بڕوات. سەردەمانێک ئاهوسکاڵاکانمان تەنیا دژ بە چەند دیدێکی ئایدۆلۆژی تایبەت بوون کە دونیاناسی خۆیان لەسەر بنەمای تەفسیری سیاسی و دابەشکردنی سیاسی و هەڵوێستگیری سیاسی بونیاددەنا، مرۆڤیان کورتدەکردەوە بۆ «بوونەوەرێکی سیاسی»، بوونەوەرێک کە ماناو جەوهەری خۆی تەنیا لە شوێنگە و دیدی سیاسییەوە وەردەگرت، بە جۆرێک زمانحاڵی ئەم دیدە دەیگووت «پێمبڵێ تۆ لە ئاستی سیاسییدا چۆن بیردەکەیتەوە، پێتدەڵێم تۆ کێیت». لەم ڕوانگەیەوە مرۆڤەکان هیچ نین جگە لە بارستەیەکی سیاسی لە ناو ژینگەیەکی سیاسی دیاریکراودا، کە نرخ و بێنرخی، مافی ژیان و مردن، مافی هاوڵاتی بوون و نەبوون بەپێی نەخشەیەکی سیاسی دیاریکراو دابەشدەکرێت. ئەمڕۆ دوای بچوک بوونەوەی سنووری ئیشکردن بەو ئایدۆلۆژیایانە، هەرگیز سنووری دەسەڵاتی ڕەهای سیاسەت بەسەر ژیانی ئێمەدا کۆتایی نەهاتووە. ئەمڕۆ دوای گەلەگ گۆڕانکاری گرنگ لە دونیادا دوبارە ناچارین ئەو پرسیارە

بکەینەوە کە پەیوەندی نێوان سیاسەت و ژیان لە وڵاتی ئێمە و لە ژیانی ئێمەدا چۆنە؟ ئایا بە سیاسیکردنی ڕەهاو بێسنووری ژیان بەردەوامەو دەژی، یان ئەم پەیوەندییە کۆمەڵێک ڕەگەزی بزۆکی تێکەوتووە تا شتێک لە هێز و هاوسەنگی ببەخشنەوە بەو هاوکێشە نایەکسانەی نێوان سیاسەت و چالاکییەکانی دیکەی ژیان؟ ئایا باڵادەستی سیاسەت و وزەدزینی لە هەموو ئاستەکانی دیکەی ژیان، بەرهەمی تێگەیشتن و تەفسیرێکی ئایدۆلۆژی دیاریکراوە یان لە ڕاستیدا ڕیشەیەکی لە ڕیشەی ئایدۆلۆژیی قووڵتری هەیە، کە خوداسالاریی سیاسەتمەدارە بەسەر کۆمەڵگادا؟ ئایا ئەوە سیاسەتە سیاسەتمەدار ڕادەکێشێتە ناو هەموو شوێنێکی ژیانەوە، یان سیاسەتمەدارە سیاسەت کێشدەکاتە ناو کۆی پانتاییەکانەوە؟ بەڵام ئایا باڵادەستی سیاسەتمەدار، دەتوانێت بێزەمینەیەکی پتەو کە ڕیشەکانی لە جێگای دیکەوە دێن بەردەوامبێت؟

لەو دە ساڵەی دواییدا، ئەگەرچی ساڵگەلی سەرهەڵدانی ڕەخنەی جیدیین لە سیاسەتی حیزبی ئێمە، ئەگەرچی ساڵگەلی لەدایکبوونی تێگەیشتنێکی دیکەن کە لەدەرەوەی حیزب دروستبووە و گەورەبووە، ساڵگەلی سەرهەڵدانی کۆمەڵێک کێشە و بابەتە کە سیاسەتمەدارانی ئێمە و ڕۆژنامەنوسەکانیان ناتوانن لێی نزیکببنەوە، سەرەتای لەدایکبوونی جۆرە فیکرێکی دیکەیە کە تەنیا بە تۆمەتبارکردن یان ستایشکردنی سیاسی چارەناکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا لە ئاستی کۆمەڵایەتیدا ساڵگەلی لەدایکبوونەوە و گەورەبوونی دەرکەوتەکانی ئەو ویستە ترسناکەیە کە ژیان بە چاویلکەکانی سیاسەت ببینین. واتە گەورەبوونی ڕووبەری ڕەخنەی سیاسی بەهیچ جۆرێک بەمانای گەورەبوونی ئازادی کایەکانی تر و ئازادبوونیان لە هەڵسەنگاندنی سیاسیدا ناگەیێنێت.

هیچ شتێک نییە لە ژیانی ئێمەدا تا ئەندازەی بێمانابوون و پیسبوون، بە سیاسەت بارگاوی نەکرابێت. کە لە شارێکەوە دەچیت بۆ شارێک ئەوە خۆی مانایەکی سیاسیانەی هەیە، کە لە گۆڤارێکدا بڵاودەکەیتەوە و لە گۆڤارێکی دیکەدا بڵاوناکەیتەوە تەفسیرێکی حازربەدەستی سیاسیانەی

هەیە، کە سڵاو لە یەکێک دەکەیت و لە یەکێکی دی ناکەیت مانای سیاسیانەی هەیە، کە هیچ سیاسەتێکت بە دڵ نییە، ئەوە مانای ئەوەیە تۆ ڕێگا بۆ ئەوە سازدەکەیت خۆت بچیتە جێگای سیاسەتمەدارەکان. کە پێشانگایەک لەم شار دەکەیتەوە و لەولا نایکەیتەوە ئەوە پەیوەندی بە مەیلە سیاسییەکانتەوە هەیە. لەم دیاردە بچوکانەوە تا کۆی دیاردە گەورەکانی ژیانی ئێمە بە گشتی هەموویان بەیەک چاویلکە دەبینرێن، چاویلکەی سیاسەت. یەک حاکمیش حوکمیان بەسەردا دەدات، سیاسەتمەداران و کادرە چکۆلەکانیان.

ئایا ئەم دۆخە تەعبیرە لە هەیمەنەی سیاسەت بەسەر کایەکانی تردا، یان تەعبیرە لە هەیمەنەی خواستێکی دیکتاتۆری کە لە هەناوی ستراکتوری ئێمەدا خەوتووە. هەموو باڵە سیاسییەکانی ئێمە لەوەدا بەشدارن هەریەکەیان و بە پێی کاتاگۆری سیاسی خۆی سنووری سیاسەت بێمەودا گەورەبکەن، بە جۆرێک هەموو ڕەفتارێک دواجار ڕەفتارێکی سیاسییە و تەفسیرێکی سیاسیانەی هەیە، هەموو مەعریفەت و داهێنانێکیش چ وەک ناوەڕۆک و چ وەک ئەو دیاردانەی لە دەوریێتی «بۆ نمونە وەک شێوازی بڵاوکردنەوە و شوێنی بڵاوکردنەوە و تیراژی بڵاوکردنەوە» دەلالەتی سیاسیانەیان هەیە. تا ئەم ساتە لە کۆمەڵگای ئێمەدا ماشێنێکی ترسناک لە کاردایە ژیان لە عەفەوییەت و دۆخی سروشتی خۆی دووردەخاتەوە و دەیکاتە قەوارەیەک تیایدا هەموو ڕەفتارێکی ئینسانی ئێمە، وەک بوارێکی توند دارێژراوی مەدلولاتی سیاسی تەماشادەکرێت. ماشێنێک هەیە یەک پێوەر دەکاتە شاپێوەر، عەقڵی مرۆڤی سادەی ئێمە بە یەکجۆرە دونیابینی دەستەمۆدەکات، دیدی بۆ یەک جێگا دەجوڵێنێت و هەستەکانی بەرابەر یەکجۆرە کردار دەوروژێنێت، ئەم ماشێنە تا ئەمڕۆ زیندوە و لە کاردایە، تا ئێستا کار و دەسەڵات و لۆژیکی لەسەرو و کار و دەسەڵات و لۆژیکەکانی دیکەوەیە. هەموو هێزە گەورەکانی ئێمە لە هێزە سیاسییەکانەوە، تا هێزی ڕاگەیاندن، تا تەقالیدی ڕۆژانەی کۆمەلایەتی، تا ژیانی کۆمەلایەتی ناو ناوەندی ئەدەبی و هونەری ئێمە، تا ئەو لۆژیکەی

بۆ کارپەیداکردن و بژێوی دابینکردن دەیخەینەکار هەموویان ئیشکردنن بە ویستی ئەو ماشێنە ترسناکە، قەبووڵکردنی قانوونەکانێتی، گەمەکردنە بەپێی مەرجەکان و خواستەکانی. ئەو ماشێنەش یەکجۆر بابەت بەرهەمدەهێنێت کە بابەتی سیاسییە، یەکجۆر هەڵسەنگاندنی هەیە کە هەڵسەنگاندنی سیاسییە، یەکجۆر مرۆڤ تیا سەروەرە کە کەسی سیاسییە، یەک قازی و حاکم تیا شەرع دادەنێت کە ئەو پیاوانەن چاوی سیاسەتمەدار و هەستەوەری ئەون بۆ ناو خەڵک و ترپەپێوی ئەون بۆ خوێنبەری خەڵک.

لە دەساڵی رابوردودا رەخنەیەکی زۆر لە حیزب گیراوە، رەخنەیەکی زۆر لە کولتووری رۆشنبیری حیزب گیراوە، گومانێکی زۆر دەرهەق بە مانای ئەم کولتوورە و رەهەندە دزێوەکانی دروستبووە، بەڵام قسەکردن و گومانکردن لەسەر هەیمەنەی خودی سیاسەت، لەسەر گێڕانەوەی هێز و حورمەت بۆ چالاکییە ئینسانییەکانی تر، لەسەر تەرخانکردنی رووبەرێکی گەورەتر بۆ پرسیارە ئینسانی و فەلسەفییەکان، لەسەر زیندووکردنەوەی پرس لە ستاتیکا، لە فۆرم ، لە مانا. بەردەوام لە پاشخان و لە ئاستە نزمەکانی بایەخ و گرنگیدا بوون. گەورەترین کارەسات بۆ کولتوورێک ئەوەیە کە بابەتەکان و کێشەکانی نرخ و بەهای خۆیان لە سیاسەتەوە وەربگرن.

ئەم کێشەیە لە جەوهەریدا لە کێشەی حیزبدا کورتناکرێتەوە، ئەم گرفتە لەوە دەرچووە ریشەکانی تەنیا بە چاککردن و باشکردن و پەڕوباڵکردنی حیزب تەواوببێت. چونکە ئەگەرچی حیزب داینەمۆی سەرەکی لە دایکبوونەوەی هەیمەنەی سیاسەتە، بەڵام تەنیا بکەر و تەنیا یاریکەری ئەم گۆڕەپانە نییە. ئەمڕۆ هەمووان ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەشدارن لە بە سیاسیکردنی ژیاندا.

لە قووڵایی هەموو کێشەیەکدا کۆمەڵێک چەمک هەیە کە ئەو چەمکانە بە کۆ مانای ڕاستەقینەی ئەو کێشەیە دروستدەکەن. کێشەیەکی وەک

کێشەی ئازادی، تەنیا بە زمانی سیاسەت تەعبیری لێناکرێت. زانستەکان پرسیاری دیکەیان لەم کێشەیە هەیە، گۆشەی دیکە هەیە بۆ بینینی مانای ئازادی، سیاسەت گەرچی لە سەر چەمکێکی وەکو ئازادی ئیشدەکات، بەڵام سیاسەت بێگەڕانەوەیەکی بەردەوام بۆ فەلسەفە، دەروونناسی، کولتووورناسی، ناتوانێت لە سەر ئازادی بەشەڕبێت. ئەو کولتوورەی پرسیارە جەوهەرییەکانی ئازادی لە فیکردا دەکوژێت، ناتوانێت لە سیاسەتدا بەدەستیبهێنێتەوە.

دیارە مانای زاراوەگەلێکی وەک هەیمەنەی سیاسی لە دیدی مندا لەوە قووڵتر تەنیا بەوە کۆتایی پێبهێنین بڵێین سیاسەت پرسیارە فەلسەفییەکانی کوشتووە، سیاسەت ڕۆچوونێکی قووڵ بە هەموو ئاستەکاندا ڕۆچووە. مەبەستی منیش لە پشکنینی پەیوەندی نێوان ژیان و سیاسەت، پشکنینی ئەو ڕۆچوونەی سیاسەتە بۆ ناوەوەی دونیابینی ئێمە.

لەم کورتە باسەدا قسەم لە دەسەڵاتی سیاسەت بەپلەی یەکەم، قسە نییە لەدەسەڵاتی ڕاستەوخۆی ئەم چالاکییە بەسەر ژیانەوە، بەڵکو قسەیە لەسەر دەسەڵاتە ناڕاستەوخۆکانی سیاسەت لە بوارێکی گرنگی ژیاندا کە زمانە. لێرەشدا مەبەستم تەنیا لە هەیمەنەی زمانی سیاسەت نییە لە ناو میدیاکاندا، تەنیا باس لە زاڵبوون و باڵادەستی بابەتە سیاسییەکان ناکەم کە باڵادەستییەکی بەرچاوە و هەمووومان هەستی پێدەکەین، بەڵکو قسە لەو ساتە دەکەم کە سیاسەت تیایدا دەبێتە سیستمێکی زمانەوانی، واتە مانای سیاسی وشەکان دەبنە ئابڵۆقەدەری ئەگەری هەموو مانایەکی دیکە. باس لەو ئاستە دەکەم کە تیایدا سیاسەت بە شێوەیەک لە شێوەکان ڕەمزییەتی زمان دەکوژێت و دەیگۆڕێتە کەرەستەیەکی وەزیفەکاری موتڵەق کە لەدەرەوەی دەلالەتی سیاسی، دەلالەتە خەوتووەکانی دی ڕێگایەک نادۆزنەوە بۆ لەدایکبوون. ئەوەش بەو مانایەی کە سیاقی باڵادەست بۆ دەرکەوتنی وشە، سیاقێکی ڕەمزی ئەوتۆ دەبێت لە دواجاردا ماناکان جگە لە دوولانە سیاسییەکان خزمەتی شتێکی دی

ناکەن. لەم دۆخەشدا تێکست و خەیاڵگەی ناوەکی زمان ، لەتەکیشیاندا مانای یەکە بە یەکەی وشەکان دەچنە ناو ئەو دابەشبوونە دەلالییەوە کە لە ژێر میکانیزمی کارکردنی ستراکتورێکی سیاسیدا ڕیزیان بەستووە.

بۆ نمونە، دوولانەیەکی وەک دوولانەی قوربانی / جەلاد، دیلی / ئازادی، خائین / دڵسۆز کە بە کۆ بە دەلالەتی سیاسی ڕاستەوخۆ بارگاویکراون، دەبنە ئەو ناوکۆییە مەرجەعییەی وشەکان تیا لە دایکدەبن و مانای خۆیانی لێوەردەگرن و بە هێما بارگاویدەبن. ئیدی دەسەڵاتی ئەم ناوکۆییانە «سیاقات» لە دەسەڵاتی دەلالەتی وشەکان تێدەپەڕێت و دەبێتە تاکە مەرجەعی دروستکردنی مانا.

لە شیعری کلاسیکیدا سیاقی ئایینی چاوگی ئابلۆقەدانی مانایە، تێکستی کلاسیکی بە کۆ لە ناو سیستمێکی زمانەوانیدا سەقامگیرە کە فەرهەنگە زمانەوانییەکەی بە هاوکێشەکانی «ئیمان و وەسوەسە»، «خودا و شەیتان»، «دۆزەخ و بەهەشت»، «سەروەر و بەندە»، «پاکژی و گوناه»...هتد ئابلۆقەدراوە. لە هەموو تێکستە کلاسیکییەکانی ئێمەدا، ئەم ململانێیانە دەردەکەونەوە و بونیادی ڕەمزی و چیرۆکی ناو تێکست دروستدەکەن، بە جۆرێک زمان بە هەر لایەکدا بجولێتەوە یاسا ناوەکی و سیستمە مەجازییەکەی ناوەوەی دەیباتەوە سەر هەمان سیاق. لە وێدا وشەگەلی وەک «شەراب»، «ساقی»، «پیاڵە»، «دولبەر»، «برۆ» و دەیان وشەی گرنگی دیکە کە بونیادی وێنەی شیعری کلاسیکیان لەسەر بەندە، مەرجەعییەتێکی دینیان هەیە، هەتا ئەو شیعرانەش کە مانا ڕاستەوخۆکانیان وەک کوفر لێکدەدرێتەوە، لە قووڵاییدا و بەپێی وەزیفە ڕەمزییەکەیان هێشتا هەر قەسیدەی ئاینین. لە کولتووری کلاسیکیدا وشە بە جۆرێک بە مانا دینییەکانەوە بەستراوە، دەکرێت بە ئاسانی لە پشت مانای ڕاستەوخۆی هەر وشەیەکەوە ڕەهەندە دینییەکەی بدۆزینەوە، لێرەوە کوفر لە وەسفی جوانی حەبیبەدا لە سیاقە دەلالییەکاندا، تەعبیرێکی ڕەمزییە بۆ عیبادەتی جوانی خالیق. هەتا سێکسیترین قەسیدەی ناو کولتووری کلاسیکیش وەک کوفر تەماشانەکراوە، چونکە لە

پشت وەسفی جەستەوە خالیق وەک موعجیزەکارێک ئامادەبووە. شاعیری کلاسیکی چەندە لە خودا دوورکەوتبێتەوە، ئەو ڕەمزییەتە دینییەی کە زمانی ئابلۆقەداوە و لە ناو فەزای دینیدا دیلیکردوە، هێناویەتییەوە بۆ ناو ئاین. بەوەدا لە دونیابینی دینییدا جیهان قەوارەیەکە هەموو شتێک تیاییدا ڕەمزە بۆ ئەفسونکاری خودا، لێرەوە سیاقی دینی پێشوەخت لە ڕێگای وشەوە، لە ڕێگای ئەو سیستمە مەجازییەوە کە بەلاغەتی دارشتووە، بالآتر لە هەر نیازێکی خراپی شاعیر، مانای وشەکان و مەبەستی وەسفەکانی گێڕاوەتەوە بۆ ئامێزی تەفسیری لاهوتیانە. لێرەدا دەسەڵاتی سیاقە زمانەوانییەکان، بەهێزترن لە ویستی وشە و نیازی نهێنی شاعیرەکان.

لە جۆرە دۆخێکی وادایە قەسیدەیەکی وەک مەستورەی نالی لە بری ئەوەی بەنەفرەتکردن لە نالی بشکێتەوە، بە ئافەرینکردنی تەواو دەبێت، چونکە جوانی جنس لە ناو ئەو کولتوورەدا هەمیشە پەیوەندییەکی بەلاغی قووڵی بە خوداوە هەیە. هەر ئەوەشە وادەکات گەر ئەمڕۆ قەسیدەیەکی وەک قەسیدەی مەستوورەی نالی بنوسرێت، ئەوا لای فتواچییە دینییەکان و هاوڕێ تازەکانیانەوە «فتواچییە فەلسەفییەکان»، بە نیشانەی ئاخر زەمان، فەسادی گەردونی، زبڵی عەولەمە و کاریگەری کولتووری خۆرئاوایی تەماشابکرێت. هۆی ئەم فۆبیایە لە ئێستادا و ئەو لێبوردن و قەبووڵکردنەی جاران لەوەوە نەهاتووە کە دینییەکانی سەردەمی نالی کەمتر باوەڕیان بە خودا بووە، بەڵکو لەوەوە هاتووە فیکری دینی وەک دیدگای سەردەمێک کە ئاوابووە، چیتر مەرجەعییەتی مانا دروستناکات، چیتر ئەو سیاقاتانە ناژی کە تیایدا وەسفی لەش وەک وەسفی موعجیزەکاری خودا و وەک بەشێک لە بەلاغەتی تێڕامان لە وردەکارییەکانی ئیشی پڕ لە ئەفسونی خودا تەماشابکرێت. ئەمەش وادەکات توندڕەوانەتر بجوڵێتەوە. نالی بەجورئەتتر نەبووە لە شاعیرانی ئێستا، بەڵکو لەسەردەمێکدا ئیشیکردووە، کەوەسفی لەشی ئافرەت لە سەرسامبوون بە موعجیزە خوداییەکان جیانەبۆتەوە، لەشی ئافرەت

پڕبووە لە ئاماژەی ڕەبانی، بەپێچەوانەی ئێستاوە کە وەسفکردنی لەشی ئافرەت وەک بێشەرمی و «فجور» و «بێئەخلاقی» و «کاریگەری عەولەمە» سەیردەکرێت.

لە ئێستادا بەلاغەتێکی سیاسی شوێنی ئەو بونیادە بزوێنەی گرتۆتەوە. ئایین چیتر ناوکۆیی مەرجەعییانە نییە. چیتر وەک جاران سیستمی مەجاز و هێمای ناو زمانی لە دەستدا نییە، جوانی مەخلوقات چیتر بە شێوەیەکی میکانیکی لە ناو زمانەوە نابرێنەوە سەر جوانی خودا، بەڵکو نوسەران پێویستیان بە گووتارێک یان دارشتنێکی تیوری ڕاستەوخۆ هەیە بۆ ئەوەی ئەو شتانە بڵێن.

چیتر زمان خۆبەخۆ دینیانە بیرناکاتەوە، بەڵکو دەبێت یەکێک بێت لەدەرەوەڕا ناچاریبکات بەو جۆرە بیربکاتەوە.

ئیدی لە دونیای ئێمەدا دین ئەو وزە ئایدۆلۆژییە نییە لە ناوەوە زمان بە شێوە بیرکردنەوەیەکی تایبەتی ناچاربکات. دین کۆنترۆڵ و دەسەلاتی بەسەر زماندا لاوازبووە، چیتر وشەکان بە ئاسانی بە مەدلولاتی ئایینی بارناکرێن، لێرەشەوە ئیشی بزاوتە ئاینییەکان لەگەڵ پرۆسەی گەیاندن و کۆنترۆڵکردندا ئاسان نییە. ئەو جەنگەی ئەمڕۆ لە نێوان «ڕۆشنبیری هاوچەرخ» و «ڕۆشنبیری دینی» دا هەیە، سەرچاوەکەی تەنیا پابەندی کێشەی ئایدۆلۆژی نییە، پابەندی هەڵوێست نییە لە عەلمانییەت، جیهانگیری ، ئازادی ئەخلاقی و دەسەلاتی پیاوانی دیین. بەڵکو پابەندی کێشەیەکی گرنگتریشە کە کێشەی کۆنترۆڵکردنەوەی زمانە، کێشەی بارگاویکردنی زمان لە سیاقاتە گشتییەکانیدا بە گووتارێک دەرگا لەسەر ڕستێک مانا بکاتەوە و بوار لە ڕیزێک مانای تر دابخات.

ئەو ڕقەی هەندێک لە پیاوانی ئایین لە ڕۆشنبیری نوێیان هەیە، لە قوولاییدا بۆچوونێکی ترساوە دەرهەق بە لەدەستچوونی تواناکانی کۆنترۆڵکردنی بەرهەمهێنانی مانا. چیتر دین ناتوانێت تێکستی نوێ ناچاربکات، ئەو جیهانبینییە هەڵگرێت لە ناویدا زمان بە مانا دینییەکان

بارگاویکرابێت، چیتر دەلالەتی دینی ئەو ڕووبەرە مەزنەی جارانی لە ناو زمانی ڕۆژانەدا نییە. ڕۆشنبیرانی کوردیش لە «گۆران»ـەوە تا ئەمڕۆ ئەو هێزەن کە سەرقاڵی دروستکردنی جۆرە تێکستێکن سەدای دین تیاییدا وەک سەدەکانی پێشوو پڕ شەوق و زرینگە نەبێت. «دیارە ئەمە ئەوە ناگەێنێت من دونیایەک کێشەم لەگەڵ گووتارە باڵادەستەکانی ئەو ڕۆشنبیرەو ئەو ڕۆشنبیرییەدا نییە، بەڵام هەر کاتێک ئەم ڕۆشنبیرە دەکەوێتە بەر پەلاماری ئەو خواجایانەی لە بەرگی مامۆستا و ئەکادیمی و فەیلەسوفدا شەڕ بۆ فیکری دینی دەکەن، لەوساتەدا بێدوودڵی دەبێت لە پاڵ ڕۆشنبیردا بوەستین، نەوەک لە پاڵ ئەوانەدا کە نوێنەری تورەیی دینن لە تازەگەری».

گەیشتنی ئێمە بە ڕۆژگارێک چیتر تیایدا دین ئەو هێزە نییە لە ناوەوەڕا تێکستەکان بە گووتنی مانایەکی پێشوەخت ناچاربکات، مانای ڕزگاربوونی زمان و تێکست ناگەێنێت. ئاین لە دوای خۆی دەسەڵات دەداتە مەرجەعییەتێکی ڕەمزی دیکە کە سیاسەتە. لەدوای دین سیاسەت دەبێتە ئەو هێزەی زمان لە ناوەوەڕا پڕدەکات لە مەدلولاتی ڕەمزی، زمان ناچاردەکات تەنیا یەکشێوە بنوسێت و لە یەک کایە ماناکانی خۆی وەرگرێت. سیاسەت ئەو حەوزەیە وشەکانی تێهەڵدەکێشین و لەوسەر بەیەک بەرگ و ماناوە دەریاندەهێنین و دەیانخەینەوە ناو فەرهەنگی بەکارهێنانی فیکری و ئەدەبییەوە.

گووتاری مانەوە ئەو گووتارەیە کە سادەترین هاوکێشەکانی وجود «مان و نەمان» دەگۆڕێتە سەر هاوکێشەیەکی سیاسی، گووتاری مانەوە لە جەوهەریدا دینەمۆی بە سیاسیکردنی هەموو گووتارەکانی دیکەیە.

کاتێک کێشەی ژیان و مردن لە پرسێکی وجودییەوە بووە پرسێکی سیاسی، لە ژێر ئەم پرۆسەیەدا هەموو دوولانەکانی دیکە دەبنە پرسی سیاسی، لێرەوە لە ئەدەبی کوردی نوێدا، هیچ یەک لە پرسە وجودییەکان لە پرسی سیاسی جیانەبوونەتەوە. ئەم هاوکێشەیەش لەو سیستمی هێما

و مەجاز و تەشبیهەدا بەرجەستەدەبێت کە وادەکات ڕەمزییەتی وشەکان تەنیا بە تەفسیرێکی سیاسیانە شیبکرێنەوە.

کە مان و نەمان بووە کێشەیەکی سیاسی، لە ژێریدا ژیان و مردنیش دەبنە دوو زاراوەی سیاسی ڕووت. لە بن ئەوانیشدا هەموو وشەکانی دی بەو دابەشکردنە بارگاویدەبن، ئیدی لە پەراوێزیاندا وشەگەلی جوان - ناشیرین، وەفا - بێوەفایی، ڕاستی - درۆ، بەرزی - نزمی، مەرگ - جاویدانەگی، عەشق - کینە... هتد. دەبنە هەڵگری ئاماژەی سیاسیانە، ئیدی هەموو کێشەکان، هەموو ناکۆکییە ڕەمزی و واقیعییەکان، هەموو یۆتۆپیا و دژە یۆتۆپیاکان مانای خۆیان لە سیاسەتەوە وەردەگرن و لە ناو سیاقی تەفسیرێکی سیاسیدا بۆ دونیا ڕاڤەدەکرێن. کەدرەختی ناو شیعر و چیرۆکەکان بەرناگرن، ئەوە ئیحای وشکبوونێکی سیاسییە، کە کانی ئاوی پیانایەت ئیحای سەردەمێکی سیاسی بەدفەڕە، کە بولبول ناخوێنێت بە پێچەوانەی سەردەمی کلاسیکییەوە، دەلالەت نییە بۆ زیزبوونی مەحبوبە، بەڵکو ئاماژەیە بۆ دۆخێکی سیاسی غەمگین و شکستخواردوو، کە درەخت دەقیژێنێت، لەبەرئەوەیە ترسی سیاسیانەی هەیە، کە عەشق شکستدەخوات لەبەر جیاوازی سیاسی و ئابورییە، کە باڵندەکان لە قەفەزدا غەمگینن، ئەو خەمگینییە هیچ نییە لە خەمی سیاسیانەی خەڵکێکی دیل کە لە باڵندەدا ڕەمزی خۆیان دۆزیوەتەوە.

لە ئەدەبیاتی کوردیدا ملیۆنەها وێنە دەدۆزینەوە کە بەبێ ئەو سیستمە ڕەمزییەی سیاسەت لە ناو زماندا سەوزیکردووە تەفسیرناکرێن. بە جۆرێک دەتوانین بڵێین کە زمان لە ناوەوەڕا بە جۆرێک ئاڕاستەدەکرێت سیاسیانە بیربکاتەوە، ئەو ماناو دەلالەتە هەڵگرێت کە سیاسەت پێشوەخت پێیبەخشیوە، ئەمجۆرە کۆنترۆڵکردنە ناوەکییە وادەکات وشەکان بە ئەستەم بخرێنەوە سەر دۆخی سروشتی خۆیان، بەزەحمەت بگەڕێنەوە سەر ساتی پێش بارکردنی ئایدۆلۆژی، بەگرانییەکی بێسنوور لەو سیاقانە دەرچن تیایاندا مانایەکی سیاسی دەسەپێنرێت بەسەر وشە و ئەگەرەکانی مانادا.

بەر لەوەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی حیزب، بەرلەوەی کێشە ڕۆژانەکان سیاسەتمان وەک تاکە بابەت پێشکەشبکەن، زمان لە ناوەوەڕا بیرکردنەوەو خەیاڵگەی ئێمەی گۆڕیوەتە سەر خەیاڵگەیەکی سیاسی.

کێشەی گەورە لەم مەسەلەیەدا ئەوەیە کە کۆنترۆڵکردنی سیاسەت بۆ سیستمی بەرهەمهێنانی ناوەکی مانا لە ناو زماندا بە هەژارکردنێکی گەورەی سیاسەت و کۆمەڵگاش دوایدێت. کاتێک مانای سیاسی تاکە مانایەک بێت فیکر خۆی پێوەسەرقاڵ بکات، کاتێک زمان بە کۆ بکرێتە جەستەیەکی سیاسی ئیدی ئاسۆکانی ناو زمان لە پرسیاری سیاسی، دوودڵی سیاسی، تورەبوونی سیاسی بەولاوە چیدی هەڵناگرن. واتە کولتووری ئێمە دەبێتە باغێک، چەند درەختی جۆراوجۆری تیا سەوزبکەیت، لە کۆتاییدا درەختە جیاوازەکان هەموو یەک جۆر میوە دەگرن، چەند جۆر باڵندەی تیا بەخێوکەیت، دواتر هەموو یەک ئاواز دەخوێنن.

کاتێک دەڵێین مرۆڤ لە کۆمەڵگای ئێمەدا کورتدەکرێتەوە بۆ «حەیوانێکی سیاسی»، واتە هەر وشەیەک کە لە زماندا هەیە، لە زاریدا دەبێتە وشەی سیاسی. وەزیفەی زمانە تایبەتییەکانیش دەبنە خزمەتکردن یان دژایەتی گووتارێکی سیاسی. بە سیاسیکردنی زمان تەنیا لە ئاستی ئەدەبی و فیکریدا دەرناکەوێتەوە، بەڵکو کۆمەڵێک ترسی گەورەی دی دەورووژێنێت. چونکە بە سیاسیبوونی زمان واتە بەسیاسیکردنی سۆزە ئینسانییەکان، بە سیاسیکردنی ئەخلاق، بە سیاسیکردنی یاسا.

گەر بۆ نمونە قسە لە پەیوەندی بەلاغەتی سیاسی و ئەخلاق بکەین، ئەوەتا دەبینین زمانی ئەخلاق، تەنیا تەعبیر لە سیستمێکی ئەخلاقی ناکات، بەڵکو تەعبیر لە سیستمێکی سیاسیش دەکات، لەم فەرهەنگەدا وشەگەلی بەئەخلاق و بێئەخلاق تەنیا تەعبیر نین لە ڕەفتاری جنسی و کۆمەڵایەتی مرۆڤ، بەڵکو وەسفن بۆ ڕەفتاری سیاسیانەشی. لە پێکدادانی بازاڕیانەی سیاسەتدا، دوژمنەکان تەنیا خیانەتکار نین، بەڵکو

بێئەخلاقیشن، هەر سیاسەتەکەیان ناتەواو نییە، بەڵکو بەلۆژیکی ئەم عەقڵییەتە ژن و کچەکانیشیان ناتەواون. زمانی سیاسی ئێمە بێئەندازە پڕە لە ئاماژە و ڕەمزو هێمای ئەخلاقی، بە جۆرێک ئیدی ئاشکرایە بەلاغەتی سیاسی ئێمە سیاقێکی تایبەتی بۆ مانا ئەخلاقییەکان دەکاتەوە. ئەم بە سیاسیکردنەی ماناکان ئەمڕۆ گەیشتۆتە ئەو ئاستە کۆمیدییەی یەکێک لە ڕۆشنبیرییە ئیسلامییەکان واڕابگەیەنێت کە کورد تا لەسایەی ئیسلامدا بووە شەهامەتی هەبووە و ئێستا شەهامەت و پیاوەتی نەماوە. گۆڕینی وشەگەلی شەهامەت، پیاوەتی، ناپیاوی بۆ وشەگەلێکی بارکراو بە وەزیفەکانی بەلاغەتی سیاسی، یەکێکە لە دیاردەکانی زاڵبوونی ئەم بەلاغەتە بەسەر زمانی ئەخلاقیدا. یەکێک لەسەرکردە ئیسلامییە توندڕەوەکان قەسیدەیەکی هیجای لەسەر سەرۆکێکی تر نوسیوە، تەنیا بە قاموسێکی جنسی تایبەت دەکرێت لە ماناکانی تێبگەین. ئەخلاق لێرەدا جگە لە پاشکۆیەکی سیاسەت هیچی تر نییە... بوارێکە مەرجەعییەتی خۆی لە سیاسەتەوە وەردەگرێت.

بە سیاسیکردنی زمان، مانای کوشتنی هەر هیوایەک بشێت لەدەرەوەی سیاسەت دروستببێت. دیارە وەزیفەی ئەم ستراکتورە خزمەتکردن نییە بە حیزبێکی دیاریکراو، بەڵکو خزمەتە بە بونیادێکی عەقڵی کە هەموو سیاسەتمەدارانی کورد لە هەر کوێیەکی دونیادابن سوودی لێدەبینن. بە سیاسیکردنی زمان بریتییە لەو شاسیستمە مەعریفییەی کە کۆی خیتابە جیاوازەکانی لێوە بەرهەمدێت. بەڵام نابێت وا تێبگەین کە سیاسەتمەدار سوودێکی ڕاستەوخۆ لەم بەلاغەتە نابینێت. کاتێک زمان خۆبەخۆ سیاسیانە بیربکاتەوە، سیاسی ئەوەندەی لەسەرە ناوی خۆی لە ژێر ماناکاندا بنوسێت. چیتر ئەو پێویستی بە دیاریکردنی ئاسۆکانی بیرکردنەوە نییە، چونکە ئەو ئاسۆیانە بەر لەو لە ناو زماندا دیاریکراون... چیتر پێویستی بە گەیاندنی مانا نییە، چونکە بەر لەو مانا سیاسییەکان دەستنیشانکراون... پێویستی بە وروژاندنی عاتیفەمان نییە، هێندەی لەسەرە ئەو کلێشە ئامادەکراوانەی بەکاربهێنێت تا عاتیفەمان بجۆشێت،

پێویستی بەوە نییە ڕەنجێک بەفیرۆبدات سەرەنجمان بۆ بابەتەکانی خۆی ڕابکێشێت، بەر لەو نیاز و بابەتی ئەو لە ناو زمانی ئاسایی ڕۆژانەی ئێمەدا ئامادەیە.

ڕۆژێک لە ڕۆژان سیاستمەداری کورد زمانی سیاسی و فیکری خۆی نەبووە، هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ئەم مرۆڤە کۆی وەزیفە سیاسییەکانی خۆی تەنیا بەو بەلاغەتە جێبەجێکردووە کە زمان پێشکەشیکردووە. لێکۆڵینەوەیەکی سادە دەتوانێت ئەوە بسەلمێنێت کە زمانی دروشم، زمانی خوتبەی سیاسی، زمانی بەیاننامە حیزبییەکان، زمانی ڕۆژنامەگەری و میدیای حیزبی، بە کۆ لە ئاستێکی بەلاغی زۆر نزمدا وەستاون. ئەم زمانە لە هەموو حیزبە کوردییەکاندا لەیەکدەچێت، لەبەرئەوەی حیزب خۆی ئەم زمانەی دروست نەکردووە، بەڵکو بەلاغەتێکە بەرلەوەی بگاتە ناو گووتاری حیزبی، وەک گووتارێکی زمانەوانی گشتیی بووە و مەیدانی گرتووە، هێندە هەیە حیزب دواتر لە ناویدا دەوەستێت و بەکاریدەبات، بەرهەمیدەهێنێتەوە، کەناڵی سەپاندن و بڵاوبونەوەی بۆ دابیندەکات، لەدەرەوەی ئەو زمانەش شوێنی دیکەی نییە تیا بوەستێت.

بەڵگەیەکی گەورە کە ڕاستی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێت ئەوەیە، فرەحیزبی لە کوردستاندا بە واتای فرەڕەنگی زمان نەبووە. زۆری ژمارەی حیزبەکان و ئایدۆلۆژیاکان، ئەو یەکێتییەی نەشاردۆتەوە کە لە بنەوەڕا سیستمی مەعریفی ئەم حیزبە بە ناو جیاوازانەی ڕاگرتووە.

سیستمی بەلاغەتی سیاسی، مەجاز، لێکچوواندن، جیناس، سروشتی تەعبیرکردن لە وشە و دانانی لە ناو سیاقێکی زمانەوانیدا لە کۆی ڕاگەیاندنی سیاسی ئێمەدا یەکشێوەیە.

ئەوەی زمان خۆبەخۆ سیاسیانە بیربکاتەوە. ڕاڤیار «مفسر» میکانیکیانە بۆ ڕاڤەی سیاسی بگەڕێت. شیکردنەوەکان خۆبەخۆ ئاماژەیەکی سیاسی لە پشت هەموو ڕەمزێکەوە ببینن، بابەتە سادەکان هەموویان لە سیاقی بابەتی سیاسیدا بخوێنرێنەوە، ڕەخنەکان هەمیشە ببنەوە بە ڕەخنەی

سیاسی، ئەمانە وادەکەن ناکۆکی لەگەڵ دەسەڵاتی حیزبیدا نەبێتە ناکۆکی لەگەڵ کۆی سیستمدا. واتە دەشێت تۆ لەگەڵ ئەم حیزب یان ئەو حیزبدا ناتەبابیت، بەڵام قووڵ لە ناو ئەو سیستمەی ئەمڕۆدا چەقیبیت، سیستمێک مرۆڤ بۆ حەیوانێکی سیاسی کورتدەکاتەوە، ژیان بۆ ژینگەیەکی سیاسی کورتدەکاتەوە، فیکر بۆ تێڕامانێکی سیاسی کورتدەکاتەوە .

کۆنترۆڵکردنی زمان کە بە کۆنترۆڵکردنی فیکر دوایبدێت، وادەکات لەگەڵ هەموو تورەیی و ناڕازیبوونێکیشدا، مرۆڤانی تورە و ناڕازیی نەتوانن شتێکی دی جیاواز لەوەی هەیە بەرهەمبهێنن، چونکە دواجار ئاسۆکانی بیرکردنەوە و خەیاڵیان هەمان ئاسۆی بیرکردنەوە و خەیاڵی ئەوانەیە کە حوکمدەکەن. کاتێک زمان شتێکی جیاوازتر لەوە بەرهەمنەهێنێت کە هەیە، تاکە ڕێگا بۆ کردنەوەی دەرگایەکی دی، ئاگادارییە لەو جڵەوە ناوەکییانەی زمان بەسەر فیکردا دەیسەپێنێت، تاکە کەسێک بتوانێت لە ئابلۆقەی ئەو مانایانە دەرچێت ڕۆشنبیرانن، دیارە هەموو ڕەنگەکانی ناو شەبەنگی ڕۆشنبیریش ناتوانن لەو ئابلۆقەیە دەرچن، ئەوانە نەبێت کە لە ڕێگای سیستمێکی فیکرییەوە، دەروازەکانی زمانێکی دی دەکەنەوە، زمان بۆ ئەوەی خۆی ئازادبکات، دەبێت ببێتە هەڵگری فیکرێک، هێدی هێدی لە ناوەوەڕا خۆی لە سیستمە باوەکانی تەعبیر جیابیکاتەوە. دەبێت ببێتە هەڵگری هوشیارییەک بزانێت زمان بەچی جۆرە بارگەیەکی خەیاڵکوژ و ڕازشکێن بارگاویکراوە. لێرەوە هوشیاربوون بەرابەر هێزی زمانبەستی سیاسەت، مەرجی یەکەمی عەوداڵبوونە بۆ زمانێکی دیکەی نوسین بکەوێتە ئەودیوی ئەو سیستمەی ڕاز و درکاندن کە ئەمڕۆ بەکاریدەهێنین. لێرەوە هەر گەڕانێک بۆ زمانێکی نوێ، گەر نەزانێت دەبێت چی بشکێنێت، گەر نەزانێت دەبێت چ بارگەیەک لە کەلەپووری ئەو زمانە بتەکێنێت، ڕێگا بەرەو تەعبیری دیکە نادۆزێتەوە. یەکێک لەو تەوەرە گرنگانەی کە ڕۆشنبیری ئێمە فەرامۆشیکردووە، خوێندنەوەی پەیوەندی نێوان سیاسەت و زمانە.

بە سیاسیکردنی بەردەوامی کێشەکان و بابەتەکان، تەنیا سیفەتی حیزبەکان نییە، بەڵکو سیفەتی ئەو هێزە مەدەنیانەشە کە لە ڕێگای بە سیاسیکردنەوە شەڕ لەگەڵ حیزبەکاندا دەکەن، سیفەتی ئەو ڕۆژنامە ئەهلییانەشە کە کێشەکان تەنیا لە گۆشەنیگای سیاسییەوە دەخەنەڕوو. دەشێت ئەم بە سیاسیکردنە هەندێکجار شێوەیەکی فشاربێت بۆ دەرخستنی ئەو ڕووبەرانەی حیزبەکان دەیانشارنەوە؛ بەشێک بێت لە پرۆسەی دروستکردنی شەفافییەتی سیاسی یان لەوانەیە پێویستییەکی گرنگ بێت بۆ ڕزگارکردنی هەندێ دەستکەوت و بەها کە حیزبەکان لە ناکاو پەلاماریاندەدەن «کە دیارە لەو ساتانەدا دەبێت هەموومان بەدەنگبێین». بەڵام ئەمجۆرە بە سیاسیکردنە توندڕەو و بێلەمپەرە بەشدارییەکی گەورەشە لە بەرتەسککردنەوەی بایەخی ڕۆشنبیری ئێمە بە کێشە فیکری و ستاتیکی و تیۆرییەکان. تا ئەو ئەندازەیەی دەگەینە ئاستێک تیایدا گرنگی ڕۆشنبیر بە ئامادەگی لەسەر پرسیارە سیاسییەکان دەپێورێت، نرخی ئەم ڕۆشنبیرە بە هەڵوێستە سیاسییەکانی دەستنیشاندەکرێت.

کێشەی گەورە کە وادەکات ڕۆشنبیران کەمتازۆر بکەونەوە ناو کێشە سیاسییەکان، کێشەی نەبوونی ئۆپۆزیسیۆنێکی سیاسی ڕاستەقینەیە کە وەزیفەی سیاسی خۆی ڕاستگۆیانە جێبەجێبکات، غیابی ئەوجۆرە ئۆپۆزیسیۆنە ڕۆشنبیران ناچاردەکات ئەو بۆشاییە پڕبکەنەوە کە دەبایە ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی پڕیبکردایەتەوە... لەو دەساڵەی پێشوودا بڕی گەورەی ڕۆڵی ئۆپۆزیسیۆن ڕۆشنبیران بینیویانە، چونکە ستراکتوری سیاسی ئێمە حیزبی چونییەک و یەکڕەفتاری دروستکردووە، کە هەردەم شەڕیان لەگەڵ یەکدا شەڕێکی سەرەتاییانە بووە بۆ دەسەڵات، نەوەک شەڕی هەڵوێستە جیاوازەکان بێت. لێرەوە ڕۆشنبیران تەنیا گروپێک بوون هەوڵبدەن لەدەرەوەی ئەو پێکهاتەیە هەڵوێستی دی دابڕێژن، بڕێکی زۆری ئەو هەڵوێستانە هەر هەڵقوڵیوی ئەو زمانە سیاسی و بەلاغەتە دێرینەیە کە کولتووری سیاسی ئێمە دروستیکردووە، بەشێکی کەمیشی ئیشکردن

بووه دژی ئەو بەلاغەتە. بەڵام بە هەردوو دیوەکەشدا وزەدزین بووه له کایه فیکری و بواره ئیبداعییەکان بۆ سیاسەت.

به سیاسیکردنی سەرتاسەری ژیان، پرۆسەیەکی بێگوناه نییه، بەڵکو کردارێکی بەربڵاوی ئامادەکردنی ڕایگشتییه بۆ دەستێوەردانه بەردەوامەکانی سیاسەت. به سیاسیبوونی بەربڵاوی زمان وادەکات کۆی چاوەڕوانییەکانمان چاوەڕوانی سیاسی بن. زمان وادەکات خەون و ئومێدەکانمان کورتببنەوە بۆ خەون و ئومێدی سیاسی، نائومێدیشمان دەبێت بەهانەی خۆی له ناو فەرهەنگی سیاسییەوە بهێنێت، لەدەرەوەی ئەو زمانه سیاسییەش گەر نائومێدی ویستی زمانی دیکه بدۆزێتەوە بۆ خۆوەسفکردن، دەبێت بێدەنگی هەڵبژێرێت. زمان له ناوەوەڕا ئەوەی بەسەردا سەپاندووین که خەون و بێخەونیمان دەبێت سیاسیانه بێت. لەجۆره ژینگەیەکی واشدا دۆخێک دەخولقێت، فیکر و داهێنان، ئەدەب و هونەر، یان دەبنه خزماتکاری سیاسەت یان دەبنه تێکستی مردو که پەیوەندیان به ژیان و کۆمەڵگاوه نییه. له کاتێکدا وا پێویستدەکات تێکستێک دروستبێت، لەدەرەوەی سیاسەت ژیان و کۆمەڵگا بۆ ڕەهەندی دی بکاتەوە.

بۆئەوەی ئەم مانا و نرخ و ستاتیکا سیاسییەی ئێستا جێبهێڵین، دەبێت سیستمێکی دیکەمان له ماناو نرخ و ستاتیکا هەبێت، که مەرجەعییەتیان نەچێتەوە سەر سیاسەت. ئەمڕۆ دروستبوونی جۆره مەرجەعییەتێکی دیکەی یان چەندین مەرجەعییەتی دیکەی جیاواز له سیاسەت که نرخه سیاسی و فیکری و ستاتیکییەکانی لێوه وەرگرین، له ڕۆشنبیریی کوردیدا مەسەلەی مان و نەمانه. ئێستا گرنگ تەنیا ڕزگارکردنی بوارەکانی تری ژیان نییه له سیاسەت، بەڵکو ڕزگارکردنی سیاسەتیشه له کۆته تەقلیدییەکانی سیاسەت خۆی.

گەر لەم ڕوانگەیەوه بڕوانینه سیاسەتی حیزبیانه بەرابەر زمان، تێدەگەین به سیاسیکردنی سەرتاسەریانەی زمان که به سیاسیکردنی

سەرتاسەریانەی ژیان کۆتاییدێت، دەشێت هەمووجارێک لەگەڵ قازانجی حیزبەکاندا تەبانەیەتەوە، دیارە دەسەڵاتداران لە قازانجیان نییە تیشکێکی سیاسیانە بخرێتە سەر هەموو کێشە و گرفت و پرسێکی کۆمەڵایەتی، دەیانەوێت بە کەمکردنەوە لە نرخی سیاسی هەندێک کێشە، خۆیان لە دەلالەتی سیاسی هەندێک دیاردە بپارێزن. بەڵام ئەم دۆخە بەو مانایە نییە کە حیزبی ئێمە خۆشحاڵ نییە بەو سیستمە ڕەمزییە باڵادەستەی لە زماندا سەوزیکردووە، بە پێچەوانەوە زمان کارئاسانییەکی گەورە بۆ سیاسی دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حیزب ئومێدی زیاتری هەیە، حیزب تەنیا خواستی ئەوە نییە زمان پڕبێت لە هێما و ئاماژە و ڕەمزی سیاسیانە، بەڵکو خواستی ئەوەیە هەموو ئەو بارگە سیاسییەی ناو زمان بە ڕەمزەکانی حیزب موتوربەبکات، واتە دەبێت هەموو دەلالەتە سیاسییەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان لە ڕێگای کەناڵێکەوە ببرێنەوە سەر مێژووی حیزب و گووتارە سیاسییەکەی.

لەوانەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان زمان دەرهەق بە ئایدۆلۆژیاکان بێلایەن بووبێت، بەڵام ئەمڕۆ زمان بەجۆرێک بۆتە قسەکەرێکی ئایدۆلۆژی، بەڕادەیەک لە هەموو ئاستەکاندا بە سیاسەت بارگاوی بووە، چیدی ناکرێت قسە لە بێلایەنی بکەین. بەڵام هێشتا ئەو زمانە سیاسییە کە دەشێت لە نێوان کەسانگەلێکی زۆردا هاوبەشبێت، سەرچاوەیەکی بەلاغی بێت بۆ ژمارەیەکی زۆر لە هێز و حیزب، دەشێت بۆ بەکارهێنانێکی نەتەوەیی گشتی ئامادەکرابێت، ڕەمز و ئاماژەکانی خەیاڵگەلی جیاواز جیاواز بدوێنن. ئەم زمانە کە تەواو سیاسییە، بەڵام حیزبی نییە، چاکتر و بێلایەنترە لەو زمانەی کە حیزب جارێکی دی سیفەتە گشتیی و نەتەوەییەکانی لێدەسێنێتەوە و دەیکات بە زمانی خۆی. دیارە حیزب مانایەکی دی لە وشەکان دروستناکات، بەڵام سیاقێکی تایبەتی دەبەخشێتە ماناکان، سیاقێک وادەکات بەلاغەتی حیزبی مانا و ڕاستگۆیی خۆی لە بەلاغەتی سیاسی ناو زمانەوە وەربگرێت. بە مانایەکی دی حیزب ناتوانێت زمان بۆ خۆی مۆنۆپۆڵبکات، ناتوانێت بیکاتە موڵکی تاکوتەنیای

خۆی، ناتوانێت ڕەمزییەتی سیاسی وشەکان لە حیزبەکان و نوسەرەکان و هێزە مەدەنییەکان داگیربکات، بەڵام دەیەوێت تا دوا ئەندازە سوود لەو بەلاغەتە ببینێت بۆ دروستکردنی تێکستێکی حیزبی.

تێکستی حیزبی وشەکان لە سیاقێکی تایبەتی مانادا بەکاردەهێنێت، تا دەلالەتی دیکە ببەخشن، جودا لەو دەلالەتەی لێیان چاوەڕواندەکرێت. وشەی خێڵ، کۆمەڵگا، ڕۆژنامە، دین، مەعریفەت، داهێنان، ئازادی، ڕەخنە، ستایش، ڕۆح، جەستە، جنس، ئازا، ترسنۆک، دڵسۆز ... سەدان وشەی گرنگی دیکەی ناو زمانیش جگە لە مانای سیاسی و هەندێک بەکارهێنانی ڕۆژانەی سادە، هیچ ڕەهەندێکی دیکەیان تیانەماوە، لە ڕۆشنبیری ئێمەدا کایەیەکی فیکری نییە تێکستی دیکە لە مانا و ئەگەرەکانی مانا لەو فەرهەنگەدا بتەقێنێتەوە، ڕەهەندی فەلسەفی و زانستی و ڕەخنەیی لە ڕۆشنبیرییەی ئێستاماندا مردوە، بە شێوەیەک وشە گرنگەکانی ناو فەرهەنگی ئێمە لاڵن لە گەیاندنی مانادا، ئەمەش زەحمەتێکی گەورەی خستۆتە بەردەم ڕۆشنبیری جیدی ئێمە، ئەو ڕۆشنبیرەی کە ناچارە زمان ناچاربکات شتێکی دی بڵێت جودا لەوەی سیاسەت و فەرهەنگی ڕۆژانەی زمان دەیڵێت. لێرەوە لە نێوان زماندا بە گشتی و زمانی فیکردا دیوارێکی گەورە دروستبووە، چونکە لە بنەڕەتدا نوسەری ئێمە ناچارە شتێک بە زمان بدرکێنێت، کە زمان ئامادەی درکاندنی نییە. نوسەری ئێمە جودا لە هەموو نوسەرانی دیکەی دونیا زمانێکی ئامادە و تەیاری تەعبیرکردنی لە بەردەستدا نییە، زمانێکی لەبەردەستدا نییە خۆی لە ناوەوەڕا کایە و وەزیفە و بوارە دەلالییەکانی خۆی جیاکردبێتەوە، بەڵکو زمانێکی لەبەردەستدایە کە کۆنترۆڵێکی درێژ وزەی تەعبیرکردنی خنکاندوە. زمانێکی لەبەردەستدایە کە نایەوێت قسەبکات.

پرسیارێک لێرەدا بیکەین ئەوەیە ئایا ئەم کۆنترۆڵەی سیاسەت لە قازانجی سیاسەتێکی ئینسانی و مرۆڤدۆست و مافپەروەردایە یاخود لە خزمەتی سیاسەتێکی دەسەڵاتخوازی دژ بە داد و هوشیاریدایە؟ ئایا کە دەڵێین

«هەموو شتێک سیاسەتە» خزمەتی هوشیاری سیاسی دەکەین، یان خزمەتی جەهلی سیاسی دەکەین؟. بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێت بپرسین ئایا چی لە خزمەتی هوشیاریماندایە؟ ئەوەی سیاسەت مەرجەعی هەموو ماناکان بێت، سیاسەت سیستمی دروستکردنی ماناو سیستمی ڕاڤەکردن و سیستمی شیکردنەوە بێت، سیاسەت هێزی دروستکردنی کایەکان و دیاریکەری سنوور و بایەخبەخشیان بێت. ئایا دەبێت فەلسەفەو زانست و ئەدەب، مەرجەعییەت و وەزیفەی خۆیان لە سیاسەتەوە وەربگرن، یان بە پێچەوانەوە؟ ئایا سیاسەتێکی دابڕاو لە هەموو کایە زانستییەکان، سیاسەتێک کە زمانیشی لە ناوەوەڕا وا بەستووە کە نەکرێت زانستەکانی دی لە دەسەڵاتی ئەو دەرچن، ئایا سیاسەتێکی ئاوەها »کە بۆئەوەی بژی پێویستی بە کوشتنی هەموو زمان و بیرکردنەوەیەکی دی هەیە« دەتوانێت لە دۆخی ڕاستەقینەی جیهان و کێشەکانمان نزیکبکاتەوە؟. بێگومان جۆرە دۆخێکی لەم چەشنە سیاسەتێکی گەمژە و دابڕاو لە هەموو مەعریفەتێک دروستدەکات. لەبری ئەوەی سیاسەت مەرجەعی کایەکانی دیکە بێت، دەبێت کایەکانی دی مەرجەعی سیاسەت بن.

ئەم هەڵوێستە دژ بە دەسەڵاتی کوێر و سەراتاپاگیری سیاسەت لە کۆمەڵگای ئێمەدا، بەرەنجامی دژایەتییەکی کوێرانەی سیاسەتسالاری نییە، بەڵکو دەرەنجامی ئەو بڕوایەیە کە سیاسەتسالاری بە داخرانی کۆمەڵگاو نەخوێندەواری سیاسی و مەعریفی دوایبدێت. سیاسەتسالاری تاعوونێکە لە ناوەوە ڕێگا لە هەموو گەشەیەکی کۆمەڵایەتی و فیکری دەگرێت. جۆرێک لە دیکتاتۆریەتی تایبەت دەخولقێنێت، لەم دیکتاتۆرییەتەدا لە بری زەوتکردنی مافی قسەکردنی تاکەکان ، کۆی زمان زەوتدەکرێت. لە بری ناچارکردنی مرۆڤەکان بە شێوە قسەیەکی تایبەت، خودی زمان بە گووتن و دووبارەکردنەوەی ئەو قسانە ناچاردەکرێت.

سیاسەتی کوردی کە هێشتا دوورنەکەوتۆتەوە لەو چەشنە سیاسەتەی سەرەک قەبیلەکانی سەدەی هەژدە و نۆزدە پراکتیکیاندەکرد، بۆتە

سیاسەتێکی دابڕاو لە هەموو زانستەکانی دونیا، سیاسەتێک خۆی مەرجەعی خۆیەتی و ئیلهام هەر لە ڕابوردووی خۆیەوە وەردەگرێت. خۆی پشتگیری خۆی و خۆی ئۆپۆزیسیۆنی خۆیەتی. ئەم سیاسەتە گەورەترین مەترسی لەسەر ژیان و کۆمەڵگای ئێمە هەیە، چونکە ناتوانێت جیهان ببینێت، بەڵکو تەنیا خۆی دەبینێت. دەبێت بزانین هەنگاوی یەکەم و گەورە بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی موتڵەقی دیکتاتۆر بەسەر خەڵکدا، لە سەپاندنی دەسەڵاتی موتڵەقی سیاسەتەوە بەسەر ژیاندا دەستپێدەکات.

ئایا مانای قسەکانی من ئەوەیە کە خەڵک کێشە سیاسی و ناسیاسییەکانی خۆیان لە بیربکەن؟ بێگومان نا، بەڵکو داوایەکە بۆئەوەی تێبگەین هیچ کێشەیەکی سیاسی و ناسیاسی ئێمە بە سیاسەتێک چارەسەر ناکرێت کە خۆی بە تاکە مەڵبەندی دروستکردنی مانا و بیرکردنەوە بزانێت. هاواری من بۆئەوە نییە ئێمە کێشە سیاسییەکانی خۆمان لەیادبکەین، بۆئەوەیە لە ڕێگای زمانی دیکەو پرسیاری دیکە و مەرجەعییەتی دیکەوە لە کێشەکانمان بڕوانین. دەبێت لەوە تێبگەین سیاسەت خۆی ناتوانێت بڕوانێتە ناو خۆی، چەندەها ڕوبەر هەن لە ناو سیاسەتدا کە خودی سیاسەت ناتوانێت بیانخوێنێتەوە، چەندەها کێشەی سیاسی هەن کە سیاسەت وەڵامی بۆیان نییە، بە ئەندازەیەک دەتوانین بڵێین سیاسەتی کوردی ئێمە بەو ژێرخانە لاوازەیەوە ناتوانێت لە خۆی تێبگات. شکاندنی سیاسەتسالاری ڕێگای یەکەم و سەرەکییە کە بتوانین لە ڕێگایەوە لە سیاسەت تێبگەین، پراکتیزەیبکەین و نەهێڵین ببێتە دێوەزمەیەک لە ناوەوە عەقڵ و سۆز و ویژدانەکان کۆنترۆڵبکات. سیاسەت لە دونیای ئێمەدا هێندەی جۆرێک لە گروپگیری کۆمەڵایەتییە، هێندەی جۆرە ڕەفتارێکە بۆ ڕێکخستن و کۆنترۆڵکردن، زانستێک نییە بۆ ڕاگرتن و بەڕیوەبردن و گەشەکردنی شوناسی کۆمەڵایەتی، لێرەوە سیاسەت کایەیەکە ناتوانێت لێکدانەوە و توێکاری بکات، بەڵکو پێویستی بە زانستەکانی دیکەیە بۆ ئەوەی ئەو توێکارییەی بۆبکەن. سیاسەت بۆئەوەی بتوانێت سیاسەتێکی عەقلانی بێت، دەبێت خۆی بۆ ڕاڤەکارییەکان

بکاتەوە، دەبێت بتوانێت دەرونی خۆی ببینێت، بەڵام سیاسەتی کوردی نایەوێت لە خۆی تێبگات. ئەمەشە ناکۆکی سەرەکی دونیای ئەمڕۆی ئێمە، سیاسەت کە لەهەموو بوارەکانی دی زیاتر پێویستی بەوە هەیە، ببێتە بابەت و زەمینێکی ئیش لەسەر کراو، پێویستی بەوەیە ببێتە «مفعول بە» و توێکاری تیابکرێت، لەدەرەوەی خۆی کۆی کایەکانی دیکەی ئیفلیجکردووە، شورایەکی لە نێوان خۆی و لکە زانستییەکانی دیدا دروستکردووە. لە دیکتاتۆرێک دەچێت بەبێ تەماشاکردنی ناخی خۆی، حوکمی دونیادەکات، ڕابەڕایە‌ی کـ ـەڵگا دەکات بێئەوەی سیمای خۆی ببینێت.

واتە سیاسەت کە ئەمڕۆ خۆی بە شاچالاکی دونیای ئێمە دەزانێت، هەموو چالاکییەکانی دیکەی خستۆتە پەراوێزەوە، ئامادە نییە سەر بۆ هیچ شیکردنەوەیەکی تیوری نەوییکات کە لە بوارە زانستییەکانی دیکەوە دەکەوێتەوە، ئامادەنییە واز لە بە سیاسیکردنی زمان و ژیانی ڕۆژانە بهێنێت. ئەم سیاسەتە ناتوانێت هیچ کۆمەڵگایەک ڕزگاربکات، هیچ حیزبێکی نوێ و هێزێکی کاریگەری جیدی بەرهەمبهێنێت، بەردەوام فۆرم و شێوە سەرەتاییەکانی خۆی دووبارەدەکاتەوە، دۆست و دوژمنەکان لە ناویدا لەیەکدەچن، دژەکان لە ناویدا هەمان گووتاری ئەوانەیان هەیە کە لەبەرابەریاندا دەوەستن. قوتبە پێچەوانەکانی هاوزمان و هاوخەیاڵی یەکن.

گەر دەمانەوێت سیاسەتێکی ڕزگارکەر و چالاکمان هەبێت، دەبێت پێشوەخت سیاسەت ڕزگاربکەین، ژیان ببەخشینەوە بەو ڕووبەرانەی کە کوشتوێتی، زمانێکی دی لە خۆڵەمێشی ئەو زمانە بسازێنین کە خەیاڵکوژ وبیرخنکێن بووە.

**هەندێک پێوستیان بە زمانە، بۆئەوەی خەڵک تێیانبگات**
**هەندێکی دیش بۆئەوەی لە خۆیان تێبگەن.**
**ئەلیازەر بنعۆس**

**زمان لە دەستکردی مرۆڤە، لەبەرئەوە ناتەواو و ناکامڵە**
**جان دیلۆڤ**

گومان نییە لەوەی کە تەواوی شۆڕشی زانستی و دەستکەوتە فیکری و فەلسەفییەکانی مرۆڤ هاورێی چەمکی ئازادی بیروڕان. گومانیش نییە لەوەی دوژمنانی ئازادی بیروڕا هەردەم ئایدۆلۆژیست و موتڵەقگەرا و دیکتاتۆر و مۆراڵیستە توندڕەوەکان بوون، ئەوانەبوون لە پشت بێدەنگکردنەوە ویستویانە ڕاستییەک بشارنەوە و وێنەیەک تەماویبکەن. ئازادی بیروڕا یەکێکە لە گرنگترین پێوەرەکانی جوڵە لە مێژوودا، لەهەر جێگایەکدا مێژوو کەوتە خۆدووبارەکردنەوە، لە ئاسۆکاندا هیچی نوێمان نەبینی ئەوا بە دڵنیاییەوە چەپاندنێکی فیکری و سنووردانانێکی بەرچاو بۆ بیروڕا هەیە. چونکە ئازادی بیروڕا ئەو فەزایەیە کە عەقڵ بۆ جوڵە پێویستی پێیەتی. ئازادی بیروڕا تاکە فەزایەکە تێیدا زمان دەتوانێت ببێتە لانکەی سەرهەڵدانی بیرکردنەوەی نوێ، کارل کراوس دەیگووت «زمان دایکی بیرکردنەوەیە، نەوەک کارەکەری». بەبێ ئازادکردنی زمان، شتێک نییە ناوی بیرکردنەوەی ئازاد یان ئازادی بیروڕا بێت. ئازادی بیروڕاش کاتێک مانای هەیە کە مرۆڤ بە قووڵی پابەندی ئازادی مۆراڵ و ئازادی عەقڵ بێت. لە جیهانێکدا کە عەقڵ هێشتا لە کۆتوپێوەندە تەقلیدی و دێرینەکانی خۆی ئازاد نەبووە، مۆراڵی کۆمەڵایەتی هێزێکی کۆتوانا و گەورەیە کە وەک تارماییەکی ڕەش پاسەوانی هەموو

ڕەفتارێکمانە، لە دونیایەکدا ڕای گشتی بەردەوام مردو و مێگەلئارا و کۆنترۆڵکراوە، بۆ شکاندنی ئەو سیستمی چاوەدێری و کۆنترۆڵکردنە، تاکە شانسی گۆڕان ئازادکردنی توانا و هیوای مرۆڤەکانێتی، جەوهەری هەر پرۆژەیەکی نوێگەریش دەبێت بەشداریکردن بێت لەو ئازادکردنەیەدا. ئێمە کۆمەڵگایەکین گەلێک دوور لەنوێبوونەوە دەژین، تازەگەریی ڕاستەقینە و ڕۆچوو و چالاک هێشتا خەونێکی دوور و ئەستەمە، بۆئەوەی بەرەو تازەگەریی هەنگاو بنێین پێویستیمان بە داڕشتنی «ژێرخانی تازەگەرییە». بۆئەوەی ژێرخانی تازەگەریش دروستبکەین دەبێت لەم سیستمەی ئەمڕۆی شتەکان بڕۆینەدەرێ، لەم سیستم و پۆلێنکاری و ڕیزبەندییەی ئێستا دەرچین، دەبێت کۆتەکانی سەر ئەستۆی زمان کەمبکەینەوە و سنووری حەرامەکان بچوکبکەینەوە. هەموو هەوڵێک بۆ گەورەکردنی حەرامەکان هەنگاوێکە دژ بە نوێبوونەوە، ئازادی سەرەتایەکی پێویست و جەوهەرییە بۆ تازەگەری، لەمپەرخستنە بەردەم ئازادی لە ژێر هەر ناوێکدا بێت، لەمپەردانانە لە پێشدەم پاشەڕۆژدا.

هەر شێواندنێک بۆ چەمکی ئازادی بیروڕا و بارکردنی بە کۆمەڵێک سەرەتاگەی نادروست، قورس لەسەر کۆی خەونی تازەگەریی تەواودەبێت، ئەمڕۆ هەوڵێکی ترسناک هەیە بۆ شێواندنی ڕووی ئەو کێشانەی کە ڕووبەڕووی ئازادی بیروڕا دەبنەوە. ئازادی بیروڕا شتێک نییە بۆ ڕۆشنبیران و سیاسییەکان و خاوەن حیزبەکان قۆرغ بێت، مرۆڤی کورد بە درێژایی مێژووی خۆی لەدەرەوەی بازنەی قسەکردن بووە. بەشێکی گەورەی گۆڕان لە دونیای ئێمەدا لەوەوە دەست پێدەکات ئەم مرۆڤە فێری قسەکردن بێت. لە دونیای ئێمەدا تا ئەمڕۆ گەلێک هێزی گەورە بۆ بەرتەسککردنەوەی تواناکانی قسەکردن ئیشدەکەن، تا ئەمڕۆ قوتابخانەکان و زانکۆکان مرۆڤ وا پرۆگرام دەکەن نەتوانێت بە دروستی باس لە خۆی بکات، تائێستا بەشی هەرە زۆری ڕاگەیاندنی ئێمە لە خزمەت گەمژەکردن و لاڵکردنی مرۆڤدان. دەزگاکانی حیزب و حکومەت ساڵانە ملیۆنەها دۆلار لە قایمکردنی کۆڵەکەکانی «کولتووری سەتحی و بازاڕیدا» سەرفدەکەن، شارەکانی ئێمە بێ شانۆن، بێ سینەمان، خەڵکی

ئێمە دوورین لە کتێبە جوانەکان، دوورین لە فلیمە جوانەکان، دوورین لە بیستنی هونەرە بەرزەکانی گۆرانی و مۆسیقار و شێوەکار، ئەوەشی دەگاتە ئەو وڵاتە خەڵک بە کەناڵەکانی خۆیدا دەیبات، تا ئێستا پۆلیسی فرۆکەخانەکان و سەر سنورەکان لەسەر کتێب یەخە بە خەڵک دەگرن، کەچی بەودیودا ملیۆنەها دۆلار لە پرۆژەی بێمانا و گۆرانیبێژی بێهونەر و فیستیڤاڵی بێسوودا سەرفدەکرێن، بەڵام هەموو ئەوانە بە ئەندازەی گوڵی ناو باغچەیەک کە بە خۆرسک دەڕوێت، جوانیان نەخستۆتە سەر دونیای ئێمە. ئیدی مرۆڤی ئێمە لەناو ئەم ماشێنە گەورەیەدا کە دەیهاڕێت و زەوقی لێدەستێنێتەوە، چۆن بتوانێت کاتێک دەست بۆ قەڵەم دەبات جوان و بەویقار بنوسێت. ڕێگای دەربازبوون لەم دۆخە ئەوە نییە نەهێڵین ئەم مرۆڤە چیتر بدوێت، ئەوە نییە بیر لە دانانی یاسا بکەینەوە بۆ خنکاندنی دەنگیان، دەبێت لێگەڕێین بدوێن و تورەببن و هەڵەبکەن، دەبێت نوسینی هاوڵاتییەک کە لە سایتێکی ئینتەرنێت یان ڕۆژنامەیەکدا تورەییەکانی خۆی دەنوسێتەوە، مەراق و پرسیارە سیاسییەکانی خۆی بەیاندەکات بەو پێوەرانە نەپێوین کە شیعری شاعیر و ڕۆمانی ڕۆماننوسەکانی پێدەپێوین. ئەوەی ئێمە لێرەدا قسەی لەسەر دەکەین دیاردەی ئەدەبی و تێکستی فیکری نین، بە پێوەرەکانی ڕەخنەی ئەدەبی و فەلسەفی ناخوێنرێنەوە، ئێمە لەبەردەم دیاردەیەکی سۆسیۆلۆژیداین و ڕۆڵی ئێمە وەک ڕۆشنبیر ئەوەیە هەوڵبدەین تێیبگەین، نەوەک ببین بە هاوکار و هاودەستی دەسەڵات و یاسایان بۆ دانێین ئازادییەکانی پێ سنووردارببکەن و سزای خەڵکی پێبدەن. ئەو ڕۆشنبیرانەی بەناوی ڕێز و حورمەت و مافەوە، بە ناوی پاراستنی زمان و ئەخلاقەوە دەیانەوێت ئەو ڕووبەرە بچوکەی ئازادییەکان بەرتەسکبکەنەوە، هەڵەیەکی مێژوویی گەورە بەرابەر بە داهاتوودەکەن.

ئەوەی دەیەوێت قسە لە ئازادی بیروڕابکات دەبێت لە چوار سەرەتاگەی زۆر سەرەتایی و سەرەکییەوە دەست پێبکات.

یەکەم: ڕەخنەگرتن لە دەستێوەردانی بەردەوامی دەسەڵات لە کایەی

ڕۆشنبیری و فیکریدا، خوێندنەوەی میکانیزمەکانی ئیشکردنی لەم بوارانەدا و تاوتوێکردنی جەوهەری ئەو سیاسەتە کولتوورییەی ئێستا پیادەدەکرێت. چونکە گەورەترین مەترسی لەبەردەم ئازادی بیروڕادا بریتییە لە دەستێوەردانی خراپی دەسەڵات لە ژیانی ڕۆژنامەگەری و ڕۆشنبیری ئێمەدا.

دووەم: ڕەخنەگرتن لە شێوازی کۆنترۆڵکردنی ڕای گشتی، ڕەخنە لە مۆنۆپۆڵکردنی کەناڵە گەورەکانی ڕاگەیاندن « ئیدی لە ڕۆژنامەوە بیگرە تادەگاتە کەناڵە ئاسمانییە کوردییەکان» و ئاراستەکردنیان بە شێوازێکی ئایدۆلۆژی موتڵەق. چونکە مەترسی هەرە گەورەی سەر ئازادی بیروڕا ئەوەیە کە پیاوانی دەسەڵات و سەرانی ئەرستۆکراتییەتی نوێی کورد بەشی هەرە زۆری مینبەرەکانی ڕاگەیاندنیان مۆنۆپۆڵکردوە.

سێهەم: ڕەخنە لە پرۆسەی دروستکردنی مرۆڤی بێباک و بێبیرکردنەوە لەم کەناڵانەدا، کە بەکۆ لە خزمەت دروستکردنی مرۆڤێکی تاک ڕەهەندان کە لە هەستی ڕەخنەیی خاڵیبێت.

سێهەم: بەدواداچوونی بەردەوام بۆ ئەو هەموو فشارە بێسنوورەی کە ڕۆژنامەگەری ئەهلی و ڕۆژنامەنوسانی ناڕازی لەسەریانە.

هەر کەسێک لەدەرەوەی ئەم پرەنسیپە سەرەتاییانە باس لە ئازادی بیروڕا بکات، بیەوێت لە یاسای بدات، خۆی دەخاتە ژێر نیشانەیەکی پرسیاری گەورەوە. کێشەی ئازادی بیروڕا لە کوردستاندا ئەو وتارانە نییە کە کۆمەڵێک خەڵکی بێمینبەر و بێدەروازە لە سایتەکانی ئینتەرنێتدا دەینوسن، کۆمەڵێک خەڵک هێند نائومێدن جگە لە زمانی زبری توڕەیی هیچ زمانێکی دی نادۆزنەوە قسەی پێبکەن، بەڵکو ئەو دەستێوەردانە زەبەلاح و بێسنوور و فرەسەر و ترسناکەی دەسەڵات و حیزبە لە ژیانی ڕۆشنبیریی و فیکریمان.

من لە ماوەی دواییدا چەند جارێک گوێم لەو برایانە بوو کە باس لە یاسای ڕۆژنامەگەریی دەکەن، باس لە دانانی سنوور و دیاریکردنی

سنووردەکەن، واهەستدەکەم هەندێک لەوان، قسەکان بەو ئاراستەیە دەجوڵێنن کە لە کوردستاندا ئازادی بیروڕا تەواو بەرقەرارە و تەنیا پێویستی بە ڕێکخستن هەیە. وشەی ڕێکخستن لە ناوکۆیی ئەم قسانەشدا زرینگەیەکی ئێجگار ترسناکی هەیە، واتە هێزێک هەیە دەیەوێت ئەو ڕووبەرە زۆر بچوکەی ئازادیش ڕێکبخات «واتە کەمیبکاتەوە»، بە مانایەکی دی خەڵکانێک هەن پێیان وایە لە فەزای ئازادی ئێمەدا ئانارشییەت و فەوزا و نارێکی بەرقەرارە و دەبێت ئەو ئانارشییەت و نارێکییە کۆتایی پێبهێنرێت و بخرێتە ناو چوارچێوەیەکەوە و هەموو نوسەران لە چوارچێوەی یاسایەک و سوێندێکی شەرەفدا کۆبکرێنەوە. بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە: بەڕاست لە دونیای نوسینی ئێمەدا ئانارشییەتێکی ئەوتۆ بەرقەرارە کە ئیدی دەبێت لە ئەخلاقیاتی نوسینی کوردی بترسین؟ ئاخۆ بە ڕاست ئەمە کێشە سەرەکییەکەی ناو ڕۆشنبیری کوردییە؟. ئایا بە ڕاست دەکرێت لە دونیادا یاسایەک بۆ نوسین و سنوورێک بۆ تەعبیر دابنرێت کە خەڵکانێک بەندەکانی بنوسن و پەرلەمان مۆری خۆی بخاتەسەر « پەرلەمانێک کە خۆی تا ڕادەیەکی بەرچاو خاڵییە لە ئەهلی نوسین». ئاخۆ هیچ پەرلەمانێک لەمسەر زەوییەدا مافی ئەوەی هەیە سنوورەکانی ئازادی نوسینی من دیاریبکات. ئاخۆ ئەدەب و ئەخلاقیاتی نوسین مەسەلەی پەیوەندی نوسەرە بە سنوورەکانی تەعبیر و شێوەکانییەوە یاخود بڕیاری پەرلەمانە؟ ئاخۆ نوسەر خۆی ئەوە دیاریدەکات دەبێت چۆن بنوسێت یان دەوڵەت و یاسادانەرەکانی؟. ئاخۆ لە ڕاستیدا هیچ سنوورێک هەیە نوسەر لەگەڵ ئەوانی تردا لەسەری ڕێکبکەوێت؟ یان لە جەوهەردا سەرەتای هەر تازەگەرییەک ڕزگارکردنی مۆراڵی نوسینە لە مۆراڵی سنووردانان و ڕێکخستن و لەقاڵبدان .

بەهانەی هەرە گەورەی ئەم برایانە ئەو نوسینە توندانەی ئینتەرنێت و هەندێک نوسین و هەواڵی ناو ڕۆژنامەکانی ناوخۆیە، من حەزدەکەم دووبارە کۆمەڵێک پرسیاری دیکە بخەمە سەر گومانەکانم و لەو هاوڕێیانە بپرسم: ئاخۆ ئەوانەی کە نوسەر نین، یان نوسەری باش نین بۆیان نییە بنوسن؟ ئاخۆ بۆیان نییە ڕاوبۆچوونیان هەبێت؟ بۆیان نییە تووڕەببن؟

ئاخۆ زۆربەی ئەوانەی لە ڕۆژنامەگەری حیزبیدا ئیشدەکەن نوسەرن؟ ئایا هەندێک لەوانەی دەزگا ڕۆشنبیرییە گەورەکان و دەزگا گرنگەکانی ڕاگەیاندن ئاڕاستەدەکەن، ڕۆشنبیرن؟ ئاخۆ ئەوانەی قسەی زبر دەنوسن ترسناکترن یان ئەوانەی تەنیا ستایش و پیاهەڵدان و ملکەچی دەزانن؟ کامیان ترسناکترن لەسەر عەقڵی خەڵک و پاشەڕۆژی ئازادی لەم وڵاتەدا، نوسەرانی پیاهەڵدەری ڕاگەیاندنە حیزبییەکان یان نوسەرانی بێسانسۆری ئینتەرنێت؟. ئایا ئەوانەی دەیانەوێت یاسا دانێن و بیبەن بۆ پەرلەمان نازانن پەرلەمانی کوردستان چۆن بەیەکەوە نراوە و کێی تێدایە؟. من دەپرسم: کامەیان بۆ ئازادی بیروڕا ترسناکە، سیاسەتی فڕاندن و لێدان و تۆقاندن و جنێودان بە ڕۆژنامەنوسان کە هەموو ڕۆژێک ڕووبەڕووی ڕۆژنامەنوسانی ئازادی کورد دەبێتەوە، یان ئەو نوسینانەی دەسەڵات و حیزب پێیانوایە بریندارکردون؟.

پێموایە خەڵکێک هەیە دەیانەوێت ئەوە لە بیربکەین کە درۆکردن و خەڵک خەڵەتاندن و ڕاستی شاردنەوە و هەواڵی درۆ دروستکردن و تەشهیرکردن لە ڕۆژنامەگەری حیزبییەوە سەریان هەڵدا، دەیانەوێت ئەوەمان لە بیربچێتەوە کە ئەو ئەخلاقانە بەشێکن لە مۆراڵی ڕۆژانەی دەسەڵاتی کوردی. ڕەخنەگرتن لەم کولتوورە لە ڕەخنەگرتن لە سایتەکانی ئینتەرنێتەوە دەست پێناکات، بەڵکو بە ڕەخنەگرتن لە تێگەیشتنی دەسەڵاتی کوردی لە چەمکی زمان و حەقیقەت و زەبروزەنگ دەست پێدەکات. بەر لەوەی مرۆڤ قسە لەسەر ئازادی بیروڕا بکات، دەبێت قسە لەو ئەخلاقە بکات کە ڕاگەیاندنی ڕەسمی پێدەچێت بەڕێوە. ئەو هێرشەی کە ئەمڕۆ دەکرێت سەر سایتەکانی ئینتەرنێت لەبەرئەوە نییە کە مەرجی بڵاوکردنەوەی زانستی یان ئەخلاقی مەعریفی لە نوسینی ئەم سایتانەدا نییە، چونکە ئەم مەرجە لە زۆربەی ژیانی ڕۆشنبیری ئێمەدا نائامادەیە، لەبەرئەوەش نییە کە ڕۆشنبیرانی کورد و سیاسەتمەدارانی کورد گەیشتونەتە ئاستێک کەس نایەوێت گوێی لە قسەی زبر بێت، چونکە کولتووری جنێو و تەشهیر و وێنەشێواندن، لە ڕۆحی سیاسەتی کوردییەوە هاتۆتەدەرێ. بۆیە بێدەنگبوون لەو هەموو پێشێلکاریانەی کە

ئازادی بیروڕا ڕووبەڕووی دەبێتەوە و پەلاماردانی چەند سایتێکی ئینتەرنێت کە کۆنترۆڵکردنیان لەدەرەوەی سنووری دەسەڵاتدایە، لای من شوێنی گومانێکی گەورەیە.

ئیشی نوسەران ئەوەنییە یاسا دابنێن، ئیشی نوسەران ئەوەیە بەرگرییەکی ڕەها و بێچەند و چون لە ئازادی نوسین و ئازادی بیروڕا بکەن، با ئەو ئازادییە هەندێکجار ئازاریشمان بدات، با ئەو ئازادییە بە هەڵەشدا بڕوات، با هەندێک کەسانی بێبەهرە و جنێوگۆ سوودی لێ ببینن، با هەندێک خەڵکی کەمتوانا بەو ئازادییە بریندارمانبکەن، لەگەڵ ئەوانەشدا نرخی ئەو ئازادییە هەزارانجار لە بەهای هەڵەکانی گەورەترە. من ڕوو دەکەمەوە ئەو برادەرانە و لێیاندەپرسم، لە چ قۆناغێکی مێژوو و لەچ کولتوورێکی دونیادا قسەی توند و زمانی هەڵچوون بەکارنەهێنراوە، تا ئێستا ئەمە بەهانەی ئەم هاوارە بەرزانە بێت بۆ زیاتر لە یاسادانی نوسین و یاسابەندکردنی. زمانی پاک لە چ برگەیەکی مێژوو و لەچ کولتوورێک و لە چ جێگایەکی سەرزەمیندا هەبووە تا ئەوە بەهانەی یاساڕێژکردنی سنوورەکانی نوسین بێت؟. بەکارهێنانی زمان وەک چەکێک، بەرهەمی ئێستا نییە، بەڵکو هاوڕێی لەدایکبوونی کولتوور خۆیەتی، لە ئەفسانە گریکییەکانەوە سەرهەڵدانی کولتوور و شارستانییەت هاوڕێی دەرد و ئازارە، پرۆمیسیۆس کە ئاگر «هێمای کولتوور» بۆ مرۆڤەکان دەهێنێت، دیارییەکەی دەبێتە مایەی هاتنی سندوقە تاریک و پڕ دەردەکەی باندۆرا کە ئازار و بیماری لەسەر زەوی بڵاودەکاتەوە. ئەو ترس و فۆبیا گەورەیەی ئێستا دەرهەق بە نوسینی زبر بڵاودەکرێتەوە، ترسێکی سیاسی و ئایدۆلۆژییە، پەیوەندی بە مەیلی دەسەڵاتی کوردییەوە هەیە بۆ بەشەرعیکردنی سانسۆر و دووبارە پەتکردنەوەی وشەکان و ڕستەکانمان. کاتێک گۆتە لە کۆتایی یەکێک لە شیعرەکانیدا دەنوسێت «ئەمە ڕەخنەگرە، بیکوژە، وەک سەگ بیتۆپێنە» کەس لە ئەڵمانیا داوای بەستنی کۆنگرەی ئەخلاقی و چاکسازی زمانی نوسینی نەکرد، کە شاعیری گەورەی ئەڵمان «هاینرش فۆن کلایست» دژ بە ناپلیۆن و سوپاکەی دەیگووت «بیانکوژن، هیچ عەدالەتێکی دونیا لێتان ناپرسێت بۆ

کوشتانن»، کەس ئەم زمانە بێڕەحم و نامرۆڤانەیەی وەک بەهانەی ڕێکخستن و قانونرێژکردنی فەزای نوسین بەکارنەهێنا. کاتێک «لەیدی ئاستۆرس» لە پەرلەمانی ئینگلیزیدا بە چەرچڵی گووت «بەڕێز، گەر تۆ مێردم بوویتایە، کوپی قاوەکەتم پڕدەکرد لە ژەهر»، چەرچەڵیش وەڵامیدایەوە «خانم گەر من مێردی تۆ بوومایە، دڵنیابە دەمخواردەوە»، هیچ ئینگلیزێک هەڵنەستا داوای گۆڕینی یاساکانی قسەکردن و دانانی دابونەریت بۆ قسەی سیاسییەکان بکات. کاتێک یۆشکا فیشەر «وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەڵمانیا» بە «ریتشارد شتۆکلن» سەرۆکی پەرلەمانی گووت «جەنابی سەرۆک، تۆ قووندەریت» کەس داوای دانانی قانونێکی نەکرد حورمەت و ویقارێکی زۆرەملێ بەسەر سیاسی و نوسەر و پەرلەمانتارەکانی ئەڵمانیادا بسەپێنێت. هەڵبەت من مەبەستم نییە بەرگری لەمجۆرە وشانەبکەم، مەبەستم نییە بڵێم با دونیای ئێمەش لەم نمونەیە بێت، بەڵام مەبەستمە بڵێم ئەمجۆرە قسە و نوسین و ئەخلاقانە بەهانە نین بۆ سنووردارکردنی ئازادی تەعبیر. ئەمجۆرە نوسین و هەڵوێستانە لەڕێگای یاساوە کۆنترۆڵ ناکرێن، هەر یاسایەک بە ناوی ڕێگرتن لەمجۆرە قسانەوە دابنرێت لە جەوهەریدا یاسایە بۆ ڕێگرتن لە شتی دیکە، کەس ناتوانێت نوسەر و ڕۆشنبیران و سیاسییەکان یەکجار و بۆ هەمیشە بکاتە پیاوی بە ویقار کە هەڵە ناکەن. زمانی زبر و توند هەمیشە بەشێک بووە لە کولتووری قسەکردن و نوسین خۆی. ئەم توندوتیژییە دیاردەیەک نییە تایبەت بێت بە دونیای کورد، دەشێت بڕێک لە تایبەتمەندی کوردیانە لە سەرهەڵدانی ئەو دیاردەیەدا هەبێت. بەڵام ئەو فۆبیا گەورەیە و ئەو پەرچەکردارە توندەی ئەمڕۆ دەیبینین پەیوەندی بە سیستمی کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتی کوردییەوە هەیە بۆ فەزای نوسین.

ئێمە پێویستیمان بە ئازادی بیروڕا هەیە نە بۆئەوەی بە تەنیا ئێمە بنوسین، بەڵکو بۆئەوەی ئەو مافە بۆ هەمووان کراوە بێت، هەمووش دەزانین هەموو نوسینەکان لە هەمان مینبەر و بەهەمان پێوەر ناپێورێن، ئیدی ئەم هاوار و گریانە بە دڵنیاییەوە بۆ شتێکی دییە. من ڕامواية

نوسینی جوان و ڕاستەقینە گەر هەزاران قەڵەمیش نیگاری بشێوێنن ناشێوێت، هەموو نوسەرە گەورەکان و کتێبە جوانەکانی دونیا دوژمنیان هەبووە، بەڵام هیچ دوژمنێک نەیتوانیوە ڕۆحی کتێبێکی گەورە بکوژێت و ناوی نوسەرێکی ڕاستەقینە بزڕێنێت. ئەدەبی گەورە و تێکستی مەزن هەرگیز لە نوسینی خراپ و تۆمەتی خەڵکانی کەم بەهرە ناترسن، چونکە ئەدەب و فیکرێک هێزی مانەوە و ژیانی پێبێت هیچ هێزێکی بچوک نایوەستێنێت. ئەو ترسەی ئەمڕۆ لە ئینتەرنێت دروستبووە، ترسی ئەدەبیات نییە لە شێوان، ترسی زمان نییە لە پیسبوون، بەڵکو ترسی دەسەڵاتە لەوەی ئازادانە باسبکرێت، ترسی دەسەڵاتە کە کۆمەڵێک ڕۆشنبیری کردۆتە قەڵغانی خۆی و بەناوی ئەوانەوە سنووری ئازادییەکان تەسک و سنووری حەرامەکان گەورەدەکات. ئازادی بیروڕا کاتێک بەرقەرار دەبێت کە حیزب دەست لە ژیانی ڕۆشنبیری بکێشێتەوە، سنوورەکانی ڕاگەیاندنی حیزبی بخرێتەوە شوێنە سروشتییەکەی خۆی، دەزگا ڕۆشنبیرییەکان لە دەست پیاوانی حیزب بسەنرێنەوە. هەڕەشەی گەورە لەسەر ئەدەبیاتی ئێمە و حورمەتی فیکر و ئازادی بیرکردنەوە نوسەرانی ناو سایتە کوردییەکان نین، کە دەوێرن بێپەردە ڕای خۆیان بنوسن، بەڵکو ئەو مامۆستایانەی زانکۆن کە دکتۆرا دەبەخشنە خەڵک و بیست ساڵە کتێبێکی نوێیان نەخوێندۆتەوە، هەڕەشەی گەورە لەسەر ئازادی تەعبیر ئەوە نییە گەنجێک لە سایتێکی ئینتەرنێتدا نەزانێت بەدروستی تەعبیر لە خۆی بکات، بەڵکو ئەوەیە پەرلەمانێک دروستبکەیت، ئەندامەکانی نەزانن سوێندەکەی «کە تاکە دێڕێکە» بە دروستی بخوێننەوە. ئێمە لە کولتوورێکدا دەژین هانی مرۆڤ نادات تەعبیر لە خۆی بکات، بەڵکو فێریدەکات لە هەموو وشەیەکی خۆی و لە هەموو دێڕێکی خۆی بترسێت، لە کولتوورێکی وەهاشدا پاسادانان و سانسۆرکردن و بەرتەسککردنەوەی ئازادی، بەر بەمجۆرە تێکستانە ناگرێت.

دەبێت خەڵک بنوسن، بۆئەوەی تێیانبگەین، دەبێت بنوسن بۆئەوەی بتوانن لە خۆیان تێبگەن، ئەو نوسینەی کەسێکی سادە دەینوسێت پێوەری جیاوازی هەیە کە لەو پێوەرە ناچێت کە نوسەرێکی چەند ساڵەی

پێهەڵدەسەنگێنین. نوسین تەنیا بۆئەوە نەکراوە ڕۆمانی گەورە و شاکاری پێبنوسین، بۆئەوە کراوە مرۆڤە سادەکانیش وەک کەرەستەیەکی پەیوەندیکردن بەکاریبهێنن، با ئەمڕۆ زەحمەت ببینن لە تێگەیاندنی ئێمەدا، با نوسینیان ئەو ویقارەی تیانەبێت، با لێرەو لەوێ خەڵکانێک سوودی خراپ ببینن، با ناخی پیسی خۆیانی پێ بەتاڵبکەنەوە، ئەمانە هیچیان مانای ئەوە نین کە نوسین و ئەدەبیاتی ئێمە لەبەردەم هەڕەشەدایە. نوسەری ڕاستەقینە خۆی زمانی خۆی دروستدەکات، نوسەری نەمساوی کارل کراوس دەیگووت :« زمانی من سۆزانییەکی بەربادە، من دەیکەمەوە بە کیژێکی پاکیز». ئەوە ئیشی نوسەرانە زمان لە سۆزانییەوە بکەنەوە پاکیزە. ئیشی نوسەران ئەوە نییە داوابکەن کەس هیچ بەم زمانە نەنوسێت تا پیس نەبێت. بەبۆچوونی من ئێجگار ناڕەوا و نامرۆڤانەیە بە ناوی پاراستنی زمانی ئەدەبی و ڕێزەوە ئەو پەلامارە ناهەقانە بکەینە سەر خەڵکانێک کە ڕەنگە بۆجارێک یان چەند جارێک هەندێک سکالای دڵ بنوسن، هەندێک توڕەیی خۆیان تۆماربکەن، لەوانەیە ڕستەکانیان هیچی ڕاست نەبێت، بەڵام قەدەغەکردنی دەرەنجامی ترسناکتری هەیە لە کردنی. ئازادی باجی هەیە کە دەبێت هەموومان بیدەین، ئازادی من باجێکی هەیە کە برێکی دەبێت تۆ بیدەیت، ئازادی تۆش باجێکی هەیە کە برێکی دەبێت من بیدەم، بەبێ ئەوە نە من ئازادم و نە تۆ. لێگەڕێن ئەوانەی دەدوێن ئەو زمانە بدۆزنەوە کە شەرحی حاڵی خۆیانی پێدەکەن ، لێگەڕێن ئەوانەی دەدوێن، نوسین کۆمەکیان پێبکات لە خۆیان تێبگەن. گەر کەسانێک هەن دەیانەوێت بە زمانێک بنوسن هەمیشە پاک بێت، هەمیشە کامڵ و بێگەرد و بێخەوش بێت، گەر نایانەوێت زمانی کوردی زمانی ئادەمییەکان بێت و نیازیانە بیگۆڕن بۆ زمانی فریشتەکانی بەهەشت، با ئەو زمانەی خۆیان بەرن بۆئەوێ، ئێمە لێرە لە ناو ئادەمیزادەکاندا دەژین، ئادەمیزادیشمان وەک فریشتە ناوێت، بەڵکو بە هەموو کەموکورتییەکانییەوە خۆشماندەوێت و بەرگری لێدەکەین.

ئیشکردنی «سیوەیلی» لەهەردوو کتێبی «چەمکی میتۆلۆژیا و جیهانبینی مەلا خدری نالی» و «مەستوورە لەڕوانگەیەکی ترەوە/ لێکۆڵینەوەیەک لەئیرۆتیکای شیعری نالی» ئیشکردنێکە جێگای سەرەنجە، جۆرێکە لە ڕۆچوون، ڕۆچوونێکە کە نهێنی خۆی دەپارێزێت... کەرەستەی کار لەو دوو بەرهەمەدا نایانەوێت نیازی خۆیان ئاشکرابکەن، خۆیان وندەکەن بۆئەوەی بابەتی مەبەستیان لەتاریکییەوە بهێننە دەرەوێ، لەهەردوو ئەم کارەدا «ڕێبوار» لەپشت ئاشکراکردنی نالییەوە نیەتێکی دیکە دەشارێتەوە، لەپشت نالییەوە خودێکی دیکە دەشارێتەوە، خودێک نایەوێت ڕاستەوخۆ بێتەسەر شانۆ، نایەوێت ڕاستەوخۆ خۆی ئاشکرا بکات. بوونەوەرێکە تەنها لەپشت دەمامکەکانەوە دەتوانێت حەقیقەتی ببینین، دەمامکەکانی نوسین کاتێک دەردەکەوێت کە ئەودیوی دێڕەکان ببینین، نەوتراوەکان بکەینە وتە، نەخوێندراوەکان بخوێنینەوە. زۆرجار زۆر لەڕاستییەکان بەبێ بوونی دەمامکێک ئاشکرایان بکات نادۆزرێنەوە، زۆرجار دەمامکەکان بوونی نهێنییەک ڕادەگەیەنن، زۆرجاریش لەپشت دەمامکەکانەوە هیچ ئامادە نییە... سپێتییەکی ڕووتە... بێ مانایییەکە و لە ژێر دەمامکدا هەڵگیراوە. لەڕاستیدا هەموو نوسینێکیش جۆرێکە لە دەمامک، چونکە «هەموو وتراوێک، نەوتراوێک دەشارێتەوە» «بارت». نەوتراوێک کە هەندێ جار ئاشکرابوونی یاخود ئاشکراکردنی کاریگەر و جوانی و ئەکتڤییەتی کەمتر نییە لەکاریگەری وتراوەکان. هونەر خۆشی گەمەیەکی ئاڵۆزە لەناو دەرکەوتن و ونبوونی ئاست و شێوە جیاوازەکانی ڕاستیدا.

گەمەی ڕێبوار لەنێوان هەردوو ئەم تێکستەدا ونکردنی خودە بۆ دەرخستنەوەی لەڕێگای کەناڵێکی دیکەوە. ڕێبوار خۆی وندەکات دەچێتە ئەودیو دیوارەکان، دەچێتە ئەودیو پەردەکانەوە کەناڵێکی دیکە دەدۆزێتەوە، بەجۆرێکی دیکە هەوڵدەدات بگەڕێتەوە، گەڕانەوەیەک کە

گەڕانەوەی خۆی بێت و گەڕانەوەی خۆی نەبێت... ئەو بێت و ئەو نەبێت... لێرەبێت و لێرەنەبێت... دەرکەوێت و نادیار بێت... بخوێنرێتەوە و فەرامۆشکراو بێت. بۆئەوەی لەپشت نالییەوە خۆی وەکو سێبەرێکی ڕاگوزەر دەرکەوێت و بڵێت ئەمە من نیم، ئەمە نالییە. ئەمە مەنفای من نییە مەنفای نالییە. ئەم شاری سلێمانییە «مەندەلای» نالییە و «مەندەلای» من نییە. لەپشت ئەو نەریکردنەی خودیشەوە، لەپشت ئەو تواندنەوە سیمۆلۆجیانەیەی کەسێتی خۆیەوە لەناو کۆی ئاماژەکانی دیکەدا، لەپشت ونبوونییەوە لەناو گەمەی تێکستەکاندا دەیەوێت تەنها وەکو خوێنەرێک ئامادبێت، «خوێنەرێکی تێکست». لەمەدا ڕێبوار گەمەیەکی دژوار دەستپێدەکات، گەمەی شاردنەوەی تەواوەتی خود، گەمەی بەژێرەوەکردنی خۆی لەناو بابەتەکەیدا، گەمەی هەوڵدان بۆ داپۆشینی کاراکتەری تایبەتی لەپێناوی وردبوونەوە لەبابەتی مەبەست. بەڵام چ دەمامکێک هەیە کاریگەرتر لەدەمامکی «لێکۆڵینەوە»؟ کەسی ڕاڤەکار ئەو کەسەیە کە قسە لەخۆی ناکات، توێژەرەوە یەکێکە بیر لە شتەکان دەکاتەوە، کەرەستەیەکە بۆ دەرخستن، عەقڵێکە بۆ تێڕامان، ڕۆحێکە شوناسی شتەکان دیاریدەکات، بەڵام شوناسی خۆی نادیار و ونە، یان مەبەستی سەرەکی لە نوسین دەرخستنی خۆی نییە، مەبەستێتی لە نێوان خود و بابەتدا دیوارێک بسازێنێت. ئەگەر لێکۆڵینەوە «بابەتی - مەوزوعی - ئۆبێکتیڤ» بێت بەرامبەر جیهان. دەشێت ئەو «بابەتیبوون - مەوزوعییەت»ـە لەهەمان کاتدا پەردەیەک بێت بەسەر وتنێکدا کە لە دونیای توێژەردا دەیەوێت خۆی ئاشکرابکات، واتەپەردەیەک بێت بەسەر «خود»دا. لەلای «ڕێبوار» ئەم پەردەیە دەمامکە زانستییەکەی خۆی ون نەکردووە. بەڵکو خودی ئەو دەمامکە، خودی ئەو ڕۆحە زانستگەرایە، خودی ئەو بابەتیبوونە بۆتە شوێنی خۆشاردنەوەی کەسی ڕێبوار، بەڵام ئاخۆ ئەو جێگا زانستییەی، ئەو دەقەی کەسێک خۆی تێدا بشارێتەوە تایبەتمەندی خۆی وەکو شوێنێکی تایبەتمەند وندەکات؟. بێگومان نەخێر، مەرج نییە کایەی خۆشاردنەوە و تێکستی خۆونکردن، ڕەسەنایەتی خۆی ونباکات، دەشێت بڕێک لەحەقیقەت ونبکات، دەشێت بچێتە ژێر زەبری

وەزیفەیەکەوە کە لە بنەڕەتدا وەزیفەی ئەو نییە، یان تێکست بە ئاڕاستەیەکدا بەرێت کە خواستێکی دەرونی ویستویێتی، بەڵام بڵێین تێکستی دەمامکدار تێکستێکی زانستی نییە، ئەوە بۆچوونێکی هەڵەیە. لێرەدا بڕێک لە حەقیقەت وندەبێت، بەڵام ئەو برە لەحەقیقەت لەهەموو پرۆسەیەکی فیکریدا وندەبێت، زانینی ئەو برە ونبووەش، مەسەلەیەکی سەرەکییە بۆ زانینی تایبەتمەندێتی حەقیقەت یاخود تایبەتمەندی زانست لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا، لەجێگایەکی تایبەتدا، لە لای کەسێکی دیاریکراو. نوسین پانتاییەکە زۆرجار لە پشت گووتارە زانستییەکانییەوە، لەودیو مانا و دۆزینەوەکانییەوە، دەمامکێک هەیە، کەسێک هەیە شتێک دەدۆزێتەوە. ئەم کەسە یان ئەم باسکارە هەمیشە دەستێکی خۆی لە نێو گەمەکەدا هەیە، بە مەبەستێکی تایبەتی و بە هەناسەیەکی سایکۆلۆژی یارییەکە دەباتەڕێوە و شتەکان ئاڕاستەدەکات، واتە کەسێک نییە بێلایەن کە بێلایەنانە شتێکی زانستی دەدۆزێتەوە، بەڵکو زۆرجار «نەوەک هەمیشە» لەو کاتەدا کە شتێکی ناو تێکست ئاشکرادەکات، شتێکی قووڵی ناو ناخی خۆشی ئاشکرادەکات، واتە ئەوەی لە تێکستدا دەیدۆزێتەوە، تەنیا لەبەرئەوە دەیدۆزێتەوە چونکە هاوشان و هاوونەی شتێکی دیکەی ناو ناخی خۆیەتی.

بەمجۆرە هەردوو تێکستەکەی ڕێبوار وەکو دوو شوێنی زانستی دوو تێکستن کە دەیانەوێت *«بابەتی»* و *«زانستی»* بن. ئاشکراکردنی دەمامکی پشت ئەم تێکستانە، بونیادە نەستییەکەیان مانای ئەوە نییە کە لێرەدا کەشفی زانستی نەکراوە، یان ڕاستی نەبینراوە، یان ڕەهەندێکی نالی نەدۆزراوەتەوە. بەڵام لەپشت ئەو ڕاستییەوە یاخود لە تەنیشت ئەو ڕاستییەوە یان لەناو ئەو ڕاستییەدا ڕاستیەکی تر هەیە، بریتییە لەو یاری خۆشاردنەوەیەی لەودیو دەقەکانەوە دەردەکەوێت. گەمەیەک هەیە کە یاساکانی ئەم گەمەیە تێکەڵاوکردنێکە یاخود ڕاستتر وایە تێکەڵاوبوونێکە یان دۆزینەوەی جۆرە تێکەڵاوبوونێکی نهێنییە لەنێوان ئەوەی لای نوسەر ڕوودەدات لەگەڵ ئەوەی لەبابەتدا ڕوودەدات. لێرەدا نوسەر ـ مەنفا ـ

هەڵدەبژێرێت و بابەت تەنیا دیوی دیار و دەرکەوتووی گەمەکە ئاشکرادەکات. «مەنفا» یاخود «تاراوگە» ئەوەیە نوسەر ڕاستەوخۆ خواستی خۆی ئاشکراناکات، خواستی خۆی نەوەک بە ناوی خۆیەوە، بەڵکو بە ناوی کەسێکی دی و لە جێگایەکی دییەوە ئاشکرادەکات. بەناوی خۆیەوە نادوێت، بەڵکو بەناوی یەکێکی دیکەوە قسەدەکات، یەکێک دەکات بە دەمامک، بۆئەوەی لە ڕێگای بینینی قووڵی ئەوەوە بینینی قووڵی خۆی مەیسەریکات. زمانی حاڵی خۆی دەڵێت «لای نالی وا ڕوودەدات»، بەڵام نەستی نوسەر دەڵێت «لای منیش هەمان پرۆسێس لە کاردایە». بەمجۆرە پشکنین لە نالیدا دەبێتە شوێنی تاراوگەبوونی خود. لێرەدا خود دەربارەی خۆی قسەناکات، یاساکانی خۆی ئاشکرا ناکات، میکانیزمی خۆی دەرناخات، خەونی خۆی نادرکێنێ، نەست و ناخودئاگای خۆی بەیان و بەرمەلا ناکات، بەڵکو وا لەتەکماندا دەجووڵێتەوە و دەماندوێنێت وەکو ئەوەی کە دەرکەوتووە یاسا ناوەکییەکانی دەقی نالییە و بەتەنها خەونی ئەوە و جیهانی ئەوە و ڕەخنەگر خۆی هیچی نییە لە پشتییەوە بیڵێت و جگە لە دۆزکارێکی بێلایەن و ڕاڤیارێکی مەوزوعی هیچی دی نییە. بەم شێوەیە «خود» خۆی دەکوژێت و «نالی»یەکی تایبەتی لەدایکدەبێت و «نوسەر»یش دەبێتە توێژەرەوە. «نوسین» لێرەدا دەبێتە وڵاتی دووەمی خود، مەنفایەک کە زەویەک دەخولقێنێت یاخود پێکولڵدەکات بۆئەوەی ببێتە شوێنی نیشتەجێبوونی وێنە و خواستە کوژراو و چەپێنراوەکانی نوسەر. بەمانایەکی دی «بابەتێک» دێت و جەوهەری ئەو بابەتە لە بری خود و بەخستنەبری لەو قسەدەکات. جەوهەرێکە دوای ئاشکرابوونی پێویست ناکات چیدی خود خۆی ئاشکرابکات. بەمشێوەیەش نالی و غوربەتی ئەو، وەهمەکانی، شەهوەت و ئارەزووەکانی دەبنە «خودی ئەلتەرناتیڤ»، «جەستەی ئەلتەرناتیڤ»، «خەیالی ئەلتەرناتیڤ»، «شەهوەتی ئەلتەرناتیڤ».

لەسەر ئەم ڕیتمە و بەرچاوکردنی ئەم چەمکە یاری لەگەڵ دەقدا دەبێتە یارییەکی ترسناک. نالی ئەو کەسەیە کە جێگری نوسەرە لە زەمانێکی

بەسەرچوودا. شیکردنەوەی نالیش شوێنی خۆشاردنەوەی خودی نوسەرە لەئێستادا.
گرنگی ئاشکرابوونی جەوهەری نالی و جەوهەری ئەو دیاردانەی نالی لێیاندەدوێت، لەوەدایە کە هاوشێوەی ئەو دیاردانەن کە نوسەر لە ناو خۆیدا هەڵیگرتوون و چەپاندونی و ئێستاش لەڕێگای ئەزموونی نالییەوە دووبارە بەرهەمیاندەهێنێتەوە. لێرەدا نوسەر لەبری ئەوەی خۆی بخاتە سەر کاغەز هاوشێوەکەی خۆی دەخاتە سەر کاغەز. لەبری ئەوەی خۆی بێتەزمان یەکێکی هاوشێوەی خۆی دەهێنێتە زمان و ناچاریدەکات ئەوە بڵێت کە ئەم خواستویێتی. بەمجۆرە ئاشکرابوونی نالی وەکو بابەتێکی زانستی ئاشکرابوونێکی گرنگە، بەڵام لەڕاستیدا ئاشکرابوونە لەڕێگای ئاشکرابوونی خودێکی دیکەوە لەبەردەمی خۆیدا، خودێک لەیەک کاتدا خۆی ئاشکرادەکات و لە خۆشی هەڵدێت.
بەمجۆرە حەقیقەتی شاردراوەی پشت نوسینەکانی ڕێبوار لەسەر نالی، ئاشکرابوونی نهێنی نوسەرە لەبەردەم خۆیدا. کەوتنێتی بەسەر هەندێک لە خۆیدا، کە بۆئەوەی بەرمەلا نەبێت و لە بەرچاوی گشت دەرنەکەوێت، دەئاخنرێتە ناو بابەتێکی دیکەوە. ڕێبوار «نالی» هەڵنابژێرێت لەبەر خودی «نالی»، بەڵکو نالی هەڵدەبژێرێت لە بەر خۆی، لە بەر ئەوەی کەناڵێکی باشە بۆ شاردنەوە و ناشتنی ئارەزووەکانی خود، بۆ تەعبیر لە خواستە شاردراوەکانی خود، بێئەوەی بە شەخسی لە سەر شانۆکە دەربکەویت. لێرەوە کاتی ئەوە هاتووە، بڵێین هەڵبژاردنی دەق کردەوەیەکی مەبەستدارە لەپشتییەوە زۆرجار لەبری حەقیقەتی دەق، حەقیقەتی ڕەخنە خۆی ئاشکرا دەبێت. «مەندالای نالی» مەندالای ڕێبوار خۆشیەتی، بەڵام مەندالای نالی شوێنی تواندنەوە و ونبوون و شاردنەوەی مەندالای ڕێبوارە. بەم پێیەش زەبری مەندالای ڕێبوار کە مەندالای نالی ئاشکرادەکات زەبری ناخودئاگای «نەست ـ لاشعور» ڕێبواریشە کاتێک کارێکدەکات ناخودئاگای نالی ئاشکرابێت. بەم جۆرە نەست یان ناخودئاگای ڕێبوار لەڕێگای کردنەوەی ناخودئاگایەکی دیکەوە دێتەزمان. ناخودئاگایەکی هاوشێوەی خۆی دەدۆزێتەوە و لەبری خۆی ئەو

نیشانده‌داته‌وه. به‌مجۆره ئه‌و ده‌بێته ده‌مامکێکی ئه‌ستوور بۆ شاردنه‌وه‌ی خود، به‌هه‌مان ڕێگاشدا ناخودئاگا ده‌بێته بابه‌تی که‌شف و شوێنی دۆزینه‌وه‌ی خۆی، نه‌وه‌کو حه‌قیقه‌تی خود. ده‌بێته بابه‌ت نه‌وه‌کو بکه‌ر، ده‌بێته کراو نه‌وه‌کو کردار.

ڕێبوار له‌نالیدا ئه‌و شتانه ده‌دۆزێته‌وه و ئه‌و خاڵانه ئاشکراده‌کات که ده‌بایه له خۆیدا ئاشکرایانبکات، ئاشکراکردنی ئه‌و بنه‌مایانه‌ش لای نالی هه‌وڵدانی دوورخستنه‌وه‌یه‌تی له‌خود. به‌مجۆره میتۆلۆژیای نالی له‌بنه‌ڕه‌تدا دێت بۆ ونکردنی هه‌مان میتۆلۆژیا له‌لای خود. خه‌ونی نالی دێت بۆ کپکردنی هه‌مان خه‌ون له خوددا. ناخودئاگای نالی دێت و ئاماده‌ده‌کرێت به‌زه‌بری ئه‌و ویسته قووڵه‌ی ئاگایی و هوشیاریی ڕێبوار بۆ سه‌ره‌ونگوونکردن و شاردنه‌وه‌ی هه‌ر ئاماژه‌یه‌ک که له‌خۆیه‌وه ده‌ربچێت، واته له ناخودئاگاییه‌وه ده‌ربچێت. لێره‌دا گوناه گوناهی ناخودئاگایه. به‌ڵام ئه‌و ده‌ستێکی تر ده‌دۆزێته‌وه، زمانێکی تر ده‌دۆزێته‌وه، تاوانبارێکی تر ده‌دۆزێته‌وه گوناهه‌که‌ی بۆبکات.

به‌مجۆره‌ش گووتاوی ناخودئاگا که‌به‌ناوی ئاگایی نوسه‌ر یاخود ڕه‌خنه‌گره‌وه ده‌که‌وێته قسه، قسه‌ی خۆی ده‌کات به قسه‌ی ناخودئاگایه‌کی تر، هه‌ر لێره‌شه‌وه شه‌رعیه‌تی وتن ده‌دۆزێته‌وه و مافی ئه‌وه‌ده‌دات به‌خۆی زانست بکاته په‌رده‌ی خۆ ده‌ربازکردن له چه‌پاندن و هه‌ڵهاتن و خه‌فاندنی ده‌روونی.

گووتاری ناخودئاگا که به‌ناوی خۆیه‌وه بدوێت، که جه‌وهه‌ری خۆی نیشانبداته‌وه، شه‌رعیه‌تی ده‌رکه‌وتنی نییه، ناخودئاگا تا ئه‌و ساته‌ی که خۆیه‌تی ناتوانێت ده‌رکه‌وێت هه‌قی بوونه تێکستی نییه به‌ڵکو کاتێک له‌گه‌ڵ گه‌مه‌که‌یدا تێکه‌ڵاو ده‌بێت کاتێک خۆی ده‌خاته بری «ئاگایی» و زمانی خۆی ده‌کات به‌زمانی زانستییانه‌ی لێدوان له «ناخودئاگای» یه‌کێکی دیکه، له‌م حاڵه‌ته‌دا له تاریکستانی خۆی دێته‌ده‌ریَ، حه‌قیقه‌تی خۆی له‌حه‌قیقه‌تی یه‌کێکی دیکه‌دا ده‌توێنێته‌وه، وێنه‌ی خۆی ده‌ئاخنێته ناو وێنه‌ی یه‌کێکی دییه‌وه.

لەڕێگای ئەو تواندنەوە و سڕینەوە و ونکردنەشەوە، شەرعیەت بە دەستدەهێنێت. بەمجۆرە نوسین دەبێتە کردەی خۆ ونکردنێکی بەردەوام تا لەڕێگایەوە خود شەرعییەتی گەڕانەوە بەشێوەیەکی قاچاخ بەدەستبهێنێ. بەمجۆرە مەنفای نالی کەناڵە بۆ وێناکردنەوەی ڕێبوار بۆ مەنفاکانی خۆی. هەڵوێستەکانی نالی هەمانشێوە هەڵوێستی یاخود دادگاییکردنی هەڵوێستە ناخودئاگاییەکانی ڕێبوارە. خویندنەوەی بەرامبەریش دەبێتە باشترین ڕێگای دادگاییکردنی خود یاخود درکاندن و دەرخستنی بە جۆرێکی ناڕاستەوخۆ. لێرەدا بەرامبەر دەبێتە خودێکی حاشالێکراو یاخود خودێکی خوێنراوە و دادگاییکراو و ئابڵوقەدراو. ئەگەر ڕێبوار بەوە دادگایی نالی بکات کە نالی پرۆسەی خەون دەکاتە پەردەیەک لەودیوەیەوە چەند شتێکمان لێ بشارێتەوە«مەستوورە. ل. 55». ئەوا پرۆسەی ڕەخنەش بەهەمان ڕێگادا تێدەپەڕێتەوە، هەڵبژاردنی مەنفا و سێکس لای نالی خۆی هەڵبژاردنێکی ڕەخنەیی ناخودئاگایە کە پابەندی هەر دوو ئەزمونی مەنفا و سێکسە لای خودی ڕەخنەگر.

ڕامان لەنێوان لەزەتی تەماشادا، ڕامان لەنێوان وێناکردنی وشەکان و وشەسازی بۆ وێنەدا، ڕامان لەنێوان خەیالی بینین و عەقڵی خوێندنەوەدا. هیچیان ڕامانی بێ نیاز نیین، لێرەدا ڕەخنە کەرەستەیەکی بێلایەن نییە کە تەنیا بیەوێت نهێنی ئەویتر داماڵێت، بەڵکو خۆشی نهێنی شاردراوەی خۆی هەیە. لەو کاتەدا کە نهێنی ئەوی دی دادەماڵێت، درزێک دروستدەکات و لەوێوە دەتوانین نهێنی خۆشی ببینین.

بەمجۆرە کارکردن لەناو نەستی تێکستدا بە جۆرێک لە جۆرەکان شاردنەوەی نەستی ڕەخنەیە. یاخود دەکرێت بڵێین کە لە ڕێگای ئاشکراکردنی یەکێکی ترەوە لەئاستی هەستدا، نەستی ڕەخنەگر ئارەزووەکانی خۆی تێردەکات و چەپێنراوەکانی خۆی دەهێنێتەوە. بەم پێیە عەورەتی مەستوورە کە دەبێت بە دەروازەی ناخودئاگای نالی دەشبێت بەدەروازەی ناخودئاگای ڕەخنەگر.

لەسەرەتایترین ڕوانیندا، تێکستەکەی نالی لەسەر مەستوورە تێکستی ئامادەکردنی عەورەتی مەستوورەیە بەخەیاڵ، بەڵام لەئاستی ڕەخنەدا

ئامادەکردنەوەی خەیاڵی ئامادەکراوە، ڕەخنەگر بەوە خۆی دەپارێزێت، بەوەی لەبری نوسینەوەی خەیاڵی خۆی لەسەر عەورەتی مێینەیەک، دەبێتە ئامادەکەرەوە و دروستکەرەوەی خەیاڵی تێکستێکی گرنگی پێش خۆی. نوسینەکەی ڕێبوار لێرەدا گەڕانەوەیە بۆ ناو چرکەی نوسین و تەماهیکردنە لەگەڵ نالیدا و ئەنجامدانەوەی ئەو سێکساندنە خەیاڵییەی نالییە، بە ڕەخنە. ئەگەر مەستوورە بۆ نالی تەلیسمێک و دیمەنێکی وەهمی بێت کە زەبر و کاریگەرییەکی واقیعیانەی لەسەر خەیاڵی نالی هەیە، ئەوا بۆ ڕێبوار دەقەکەی نالی جێگای مەستوورە دەگرێتەوە، نالی بە خەیاڵ لە لەشی مەستوورە تێردەبێت، ڕێبوار بە خەیاڵ لە خەیاڵی نالی.

لێرەدا دەبێت بڵێم خوێندنەوەی ڕێبوار بۆ نالی لە دوو جوغزدا کۆدەبێتەوە: یەکەم: یاخیبوونی نالی. دووەم: وەهمی نالی.

گەڕانی ڕێبوار لەدوای «نالی شۆڕشگێر» دەروازەیەکی ناخودئاگایانە و بەهانەیەکی ناخودئاگایانەیە، بۆ چوونە ناو دەقەکەوە. بەهانەی ئامادەکردنی مەستوورە لەڕێگای دەقەوە، بەهانەی تێکەڵاوبوونی لەزەتی مانا و لەزەتی تەماشایە، بایەخی شۆڕشگێرانەی دەق کەرەستەی نەستی ڕەخنەیە بۆ گواستنەوە لە لەزەتی ماناوە بەرەو لەزەتی تەماشا. ڕەخنەگر لێرەدا بۆ مانا دەگەڕێت، تا جێگایەکی باشتری بۆ تەماشا دەستبکەوێت. لەزەتی مانا ئەو بەهانەیەیە کە دەیەوێت بمانباتە ناو دەقەکەوە واتە بمانخاتە ئەو ئاستەوە کە وشەکان ببنە «دیمەن» واتە لە «مانا»وە ببنە «تەماشا»، لەخوێندنەوەوە ببنە هێزێکی خرۆشێنەر بۆ ئارەزوو، لە چەمکەوە ببن بە شەهوەت.

بەمجۆرە دەقی سەرەکی لێرەدا دەقی تەماشایە و دەقی لاوەکی و دووەمیش دەقی مانایە. مانا لێرەیە و پێویستە بۆ داپۆشینی نیازی تەماشا. ڕێبوار دەیەوێت تەماشای مەستوورە بکات، ئەوەی توانای ئەم تەماشایەی پێدەبەخشێت و کەرەستەی بینینی بۆ فەراهەمدەکات، مانا و خوێندنەوەی ڕەخنەگرانەی نالییە. بەمجۆرە ئەو تێزەی ڕێبوار لەسەرەتادا

دەیهێنێتە مەیدان بەهانەی نەستە بۆ لە خەیاڵدانەوەی مەستوورە. تەقدیسی شۆڕشگێرییەتی نالیش بەهانەی نەستە بۆ شەرعییەت دان بە سەفەری خۆی.

نالی خواناس و تەبا لەگەڵ دیندا تەنها لەبەردەم هێرش و گەڕانەوە کتوپڕەکانی ناو نەستدا لەو تەباییە دووردەکەوێتەوە. نالی لەبەردەم خواستی هەست و نەستدایە نە وەکو کۆدیتای فیکر. نالی بیری لای لەشی مەستوورەیە نەوەک بیری لای شۆڕشی جنسی بێت. لەپرۆسەی ڕەخنەشدا، شوبهاندنی ئەو خرۆشە بە کۆدیتای فیکر پەنجەرەی نەستی ڕێبوارە بۆ بینینەوەی مەستوورە «لەڕوانگەیەکی ترەوە». گرفتی سەرەکی لێرەدا جیاکردنەوەی ئاستی خەون و ئاستی واقیعە. ڕێبوار ئەم گەمەیەی نالی دووباردەکاتەوە. ڕێبوار دەڵێت «ئایا ئەگەر شاعیر ئەم تەکنیکەی بەکارنەهێنابا...» «ل 36». بەمجۆرە گەمەی نەستی نالی، لای ڕێبوار گەمەیەکی هونەرییە. خەونی نالی لای ڕێبوار دەبێت لەخەون بکەوێت و ببێتە تەکنیک. ڕێبوار خەون لای نالی دەکوژێت بۆئەوەی خەسڵەتی شۆڕشگێریەتی پێببەخشێت. بەمجۆرە ڕێبوار یاخود هەستی ڕەخنەگر بەدوو ئاست کاردەکات، یەکێکیان داپۆشینی نەستی نالییە لە ژێر ناونیشانی تەکنیکدا، دوومیان داپۆشینی نەستی خۆیەتی لە ژێر ناونیشانی ڕەخنەدا. بێگومان ئەوە مانای ئەوە نییە کە بەموتڵەقی خەون لای نالی تەکنیک نییە و لای ڕێبوار ڕەخنە لەگۆڕێ نییە، بەڵکو هەریەک لە تەکنیک و ڕەخنە بە چڕی ئامادەن، بەڵام لەڕەخنە و تەکنیک گرنگتر ئیشکردنی نەستە لەودیو هەر یەکەیانەوە، واتە ئەگەر زەمەن زەمەنی خەون بێت، فەرامۆشکردنی چەمکی سایکۆلۆژی خەون و ماناکانی خەون و جیانەکردنەوەی ئەم زەمەنە لەزەمەنی واقیعی لای یەکێکی لێهاتوو و شارەزای وەکو ڕێبوار تەنها یەک مانای هەیە ئەویش مانای کارکردن و بەرگری نەست لەخۆی.

وێنەکانی نالی بۆ ئەندامی مێی مەستوورە، هەمان وێنە گۆڕدراو و دەستکاری کراوەکانی ناو نەستن، هەمان پرۆسەی چڕکردنەوە و گواستنەوەی فرۆیدییان بەسەردا هاتووە. واتە مێدانی مەستوورە بە

هەمان پرۆسەی چڕکردنەوەی ـ تکثیف ـ و گواستنەوەی ـ نقل ـ دا ڕۆیشتوون و ئەوسا هاتوونەتە ناو تێکستەکەوە .وێنەکان وێنە ئەزەلییەکانی نەستە، وێنە دووبارە و هەزاربارە بووەوەکانی نەستن. بەڵام چی وادەکات ڕێبوار ئەو هەموو مانایە بداتە ئەو وێنە ئەزەلی و هەمیشەییانەی ناو نەست؟ چی وادەکات ڕێبوار ئەو هەموو دەلالەتە، لەو وێنانەدا بدۆزێتەوە. بێگومان نەست یەکێکە لەو هێزە گەورانەی دەتوانێت دەلالەتی نوێ بخولقێنێت، تەفسیری نوێ و مانای نوێ بداتە ئارەزوو و خواستەکانی خۆی. نالی لەم قەسیدەیەدا جەستە لەناو وێنەکانیدا دەشارێتەوە. ئەندامی مێی ئافرەت لەسێبەرەکانیدا وندەکات، ئەم ئەندامە لای نالی دەبێتە کۆمەڵێک وێنەی سروشتی جیاجیا... سەفەری ڕەخنە سەفەرێکی پێچەوانەیە و نەستی ڕەخنە نەستێکی هوشیارتر و بێشەرمتر و پشت ئەستوورترە. نالی مێدانی مەستوورە دەشوبهێنێت بە شتی تر و لە وێنەی دیکەدا نوقمیدەکات، ڕێبوار بە پێچەوانەوە، شوبهاندنەکان لادەبات و دەگەڕێتەوە بۆ لەشی مەستوورە، لەشە مێینە واقیعییەکەی. نالی لێرەدا ڕەمزسازە و ڕێبوار ڕەمزشکێن... نالی لەشی مەستوورە لە سروشتە گۆشتنەکەی دووردەخاتەوە بۆئەوەی باسیبکات، ڕێبوار دەیگێڕێتەوە سەر جەوهەرە جەستەییەکەی بۆئەوەی بیبینێت. لێرەدا نەستی ڕەخنە لەوێنەکانەوە بەرەو ئەندامە جنسییەکان دەگەڕێتەوە، لە تەشبیهەوە دەگەڕێتەوە سەر ئامادەکردنی عەورەتی مەستوورە.

لای ڕێبوار ئامادەگی «عەورەتی مەستوورە» و «زەکەری نالی» هەر لە سەرەتاوە سیفەتێکی شۆڕشگێڕانەیان وەرگرتووە. بەمجۆرە ڕەخنە دەبێتە سیستمی بینین و تەماشاکردنی جوڵاندنەوە و مێژووی ئەو دوو ئەندامە شۆڕشگێڕە. ڕەخنەگر بەدرێژیی لەسەر مەسەلەی «شانۆی خەیاڵی» لە سێکسدا دەوەستێت و قسەدەکات، چونکە لەڕاستیدا ڕەخنەگر لەئاستی خوێندنەوەی دەقەکەیدا لەناو ئەو شانۆ خەیاڵییەدا دەسوڕێتەوە، بەڵکو خودی پرۆسەی خوێندنەوەی دەقەکە دامەزراندنی ئەو شانۆ خەیاڵییە و ئاشکراکردن و هێنانەوەیەتی بۆسەر سەحنە.

سەحنەیەک تەنها کاری گەورەکردن و بەرجەستەکردنی ئەندامی مێی ئافرەتە. لێرەشدا جارێکی تر نەستی ڕەخنە خۆی ئاشکرادەکاتەوە، کاتێک هەوڵدەدات مەستوورە لە دەقەکە بکاتەدەرێ.

نەستی ڕەخنە بەپێچەوانەی نەستی تێکستەوە لەزەتی خۆی هەیە. ئەگەر لەزەتی نالی لەئامادەکردنی عەورەتی مەستوورەدا بوو‌بێت لای ڕەخنەگر بۆئەوەی سەفەری تەماشا سەفەرێکی لەزەتاوی بێت ناچارە پرۆسەکە بگۆڕێت لەپرۆسەی لە خەیاڵدانەوەی لەشی مەستوورەوە بۆ پرۆسەی لە خەیاڵکردنەوە لە ئافرەت بە گشتی. ڕەخنەگر ناتوانێت مەستوورە ئامادەبکاتەوە، مەستوورەی نەبینیوە، مەستوورە ژنی سەردەمێکی دیکەیە، بۆیە خۆبەستنەوە بە لەشی مەستوورەوە شتێکی کۆنکرێتی بۆ تێرناکات، لێرەوە ئەلتەرناتیڤە ڕاستەقینە و جەوهەرییەکەی ئامادەدەکات کە «ئافرەتە». مەستوورە لای ڕێبوار لەوە دەردەچێت ئاماژەبێت بۆ مەستوورە خۆی، دەبێت ببێت بە ناو و ئاماژە بۆ تەواوی ڕەگەزی مێ. واتە بۆ کامڵبوونی لەزەتی تەماشا پێویستە مەستوورە کە بەڕەخنەگر لە خەیاڵ نادرێتەوە، قاڵبی ڕووتی ئافرەت بگرێتە خۆی، عەورەتیشی لەوە دەرچێت تەنیا عەورەتی خۆی بێت و لەناو دیمەنی گشتی و وێنەی زەینی ئافرەتدا بتوێتەوە، تا ئاسانتر تەماشابکرێت و ئامادەبکرێتەوە.

مانا سێکسییەکانی وێنەی عەورەت کاتێک بەکاملی بەرجەستە دەبن کە بەتەواوی دەبەسترێنەوە بە ناوێکی دیاریکراو و بە کەسێکی دیاریکراوەوە، عەورەتی بێخاوەن، بێدەموچاو، کە نەبەسترێتەوە بە خاوەنەکەیەوە، زۆر لە هێزی جنسی خۆی لەدەستدەدات. بۆیە نالی لەبری ئەوەی باسی «عەورەت» بە گشتی بکات «بێ ناونانی خاوەنی عەورەتەکە» بۆ زیادبوون و ئاشکرابوون و ڕوونکردنەوەی پتری خەیاڵی سێکسی ناو قەسیدەکە، باس لەعەورەتێکی دیاریکراو دەکات، باسی مەستوورە دەکات و ئەو عەورەتە بەناوێکی تایبەتییەوە گرێدەدات کە ناوی مەستوورەیە.

بەڵام ڕەخنەگر مەستوورەی نەبینیوە، هەر لەڕێگای قەسیدەکەشەوە بە تەنیا ئەوی بۆ وێنا ناکرێتەوە. دەموچاوی ونی مەستوورە ڕێگرێکی سەرەکییە لە بەردەم ئەوەدا کە ڕێبوار لەزەتی تەواو لە تەماشای

عەورەتی مەستوورە بەرێت. بەمجۆرە ئەگەر مەستوورەی خەیالی لای نالی زۆر گرنگ بێت بۆ گەیشتن بە «لەزەتی تەماشا» ئەوا لابردنی مەستوورە بۆ ڕێبوار زۆر گرنگە بۆ گەیشتن بەهەمان لەزەت. واتە گەر بۆ نالی گرنگ بێت ئەم لەش و عەورەتە لەش و عەورەتی مەستوورە بێت تا چێژی لێ بەرێت، بۆ ڕێبوار گرنگە، ئەم لەش و عەورەتە لەش و عەورەتی مەستوورە نەبێت تا چێژی لێ بەرێت.

شیکردنەوەی ڕێبوار بۆ ئامادەگی زەکەری نالیش لەقەسیدەکەدا هەر لەسەر دوو جوغز وەستاوە:
یەکەمیان: دەیەوێت لە هێزی جنسی خۆی دڵنیابێتەوە «ل. 62» یاخود بۆئەوەی لەقودرەت و ـ هەرەت و بڕشتی ـ پیاوانەی خۆی دڵنیاببێتەوە «ل. 60 »، واتە تواناکانی خۆی دەجەربێنێت.
دووەمیشیان: درێژکراوەی ئەو بۆچوونەی یەکەمە و دەڵێت:
«ڕێگە بەخۆمان دەدەین کە بڵێین ڕێی تێدەچێت ئەم قەسیدەیە لەدایکبووی سەردەمێکی تەواو کامڵبووی تەمەنی شاعیرە و لەوانەیشە هی پیری ژیان بێت چونکە مەسەلەی ڕاڕایی و دوودڵی پیاو لەئاست مان و نەمانی وزەی شەهوەترانیدا هی سەردەمێکە پیاو تیایدا چوبێتە تەمەنەوە و گومان لەئاست توانای جنسی خۆی پەیداکردبێ... ل. 76».
واتە ڕێبوار لای وایە زەکەری نالی، زەکەری پیاوێکی کەمێک بەتەمەنە کە جارێکی دی خۆی تاقیدەکاتەوە. بەڵام بێگومان لەپشت پەردە مەنهەجی و زانستییەکەی ڕێبوارەوە جارێکی تر نەستی ڕەخنەگر خۆی شاردۆتەوە. بەڵام نەستێکی فێڵاوی کە نیازی خۆی بەجۆرێکی سەیر لە تاریکیدا هەڵگرتووە. لای ڕەخنەگر ستراتیژیکی نادیار و شاردراوە و ناخودئاگا کاردەکات، ئەویش ستراتیژی لەخەیاڵدانەوەی کامڵی شانۆی سێکساندنەکەیە... تەواوکردن و ڕزگارکردنی ئەو شانۆ خەیاڵییە ستراتیژی ڕەخنەیە. کاتێک ڕێبوار ڕووبەڕوومان دەکاتەوە لەگەڵ مەسەلەی تەمەنی نالیدا، سەرەتا وەکو پرسیارێکی هونەری و کێشەیەکی ڕەخنەیی سەیر دێتە بەرچاوان. بە بۆچوونی من ئەم قەسیدەیە دەشێت لەهەر

تەمەنێکدا بنوسرێت مندالّی نەبێت، دیارە پرسیار لەتەمەن پیلانێکی دیکەی نەستی ڕەخنەیە، نەخشەیەکی تری ئەهریمەنانەی ئەوە. پیلانێکە ڕەخنە و تێکست یەکدی دەگرنەوە و یەکدی دووبارەدەکەنەوە و دەست دەخەنە نێو دەستی یەک.

ڕەخنە لێرەدا بەڕێگایەکی دیکەدا دەمانبات، ڕەخنە تێکست لەگرفتە سەرەکییەکەی ئازاد دەکات، بەڕای من لەسەرەتاوە کێشەی تێکستەکەی نالی و ئەو تاقیکردنەوانەی بەردەمی، پابەندییەکی ئاشکرایان هەیە بەگریمانەی خەسانەوە... سیمیائییەتی قەسیدەکە پڕە لەئاماژەی نەستییانەی کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەرەو فۆبیا و ترسی خەسانمان دەبەن. ڕێبوار سەبارەت بە «لێکچواندنی دوور» بۆ فەرجی مەستوورە خالّێکی زۆر گرنگ دەستنیشاندەکات، بەڵام من لەتەفسیردا تەواو لێی جیادەبمەوە، «لێکچواندنی دوور» ترسێکی ڕاستەوخۆیە لە خەسان. عەورەتی مەستوورە دەبێتە پانتاییەکی دوور، پانتایی دووریش واتە دەستی بەسەرا ناگیرێت و نێر ناتوانێت بیپێکێت و بیکوتێت. وێنەکانی ناو نەستی نالی سەبارەت بەفەرجی مەستوورە، لە نەزانین و نەشارەزایی نالییەوە نیین لە لەشی ئافرەت بەڵکو هەڵقوڵاوی ترسێکی قووڵن لە خەسان.

سیمائییەت و ئاماژەگەرایی مێدانی مەستوورە، هەڵگری دەلالەتی ئەو ترسەن، دەلالەتەکانیش لەدەوری «دووری و بچوکی و نادیاری و بەخیلی و نەشکان و توندی و لێ نەدران و لەقالّبدان و بێدرز و قلّیشی» فەرجی مەستوورە دەسوورێنەوە .ئەمانەش سیفەتگەلێکن قایمی قەلای مەستوورە بەهێزتر دەکەن، ئەگەر سەرنجبدەین، چاوی نالی زیاتر لەسەر پچووکی درزی فەرجی مەستوورەیە وەکو بەئاشکرا لەدوو بەیتەکانی «8، 10، 11، 14، 17، 20، 23، 26، 28، 29» دا دەبینین تا دواجار لە دێڕی «28»دا نالی وا دەبینێت کە «بێدرز و قلّیشە» یان وەکو «دیدەی دەرزی» قلّەشاوە.

ئاشکرایە ئەو پێداگرتنە لەسەر بچوکی درزی مەستوورە یاخود هەر نەبوونی درز، وە دواتریش شوبهاندنی بە چەندەها وەسفی دیکە کە

نیشانەی دووری و قایمی و مەحکەمییە وەکو لە دێڕی «10، 11»دا دەبینین. تەنها ئاماژەی خۆ تاودان نییە بۆ ڕەحەتبوون لەڕێگای وێنەی مەستوورەوە، بەڵکو لەهەمان کاتدا ئاوێنەی ترسێکە لەنەستدا کە نایەوێت بە ئاشکرا خۆی دەربخات. فەرجی مەستوورە لەئاستی نەستی نالیدا «بچوک و تەسک و ئەستوور و لەخەڵوەتخزاو و بە ئەستەم قڵەشاو» کە کاری دەست بەسەراگرتنی ئاسان نییە، بۆیە لە ڕاستیدا من لەتەک ئەو سەیرکردنەی سیوەیلیدا نیم کە وادەبینێت سیمائییەتی فەرجی مەستوورە تەنها سیمائییەتی «سازگاری و زوڵالی و شیرینی و بەتامیی»ـە، وەکو لەو خشتەیەی «لاپەڕە 40» دا دەستماندەکەوێت، بەڵکو لەڕاستیدا سیمائییەتی ئەم فەرجە پابەندی ترسێکە لەو وێنەیەی فەرج کە «قایم» و «بێدرز» و «بەئاستەم قڵەشاو». هەر لێرەوە نمایشی زەکەری نالی نمایشێکە بۆ ونکردن و وەڵامدانەوە و خەفەکردنی و بێدەنگکردنی وەسوەسەکانی ئەو گریمانەیە.

تێکستەکە خولْقاندنی شانۆیەکی خەیاڵییە کە لەپشت لەزەتەوە سەرکەوتنێکی دیکەشی بۆ نالی تیایە، ئەویش هەڵهاتنە لەخەسان لە سەرەتای نمایشەکەدا «عەورەتی مەستوورە» عەورەتێکی عاسییە... وێنەکانی وێنەی قەلایەکی مەحکەم و ئەستێرەیەکی دووردەست و گەنجێکی موغلەقە... هتد. کە درزێکی پچووکی تێدایە، درزی بچوکیش هەڵگری دوو دەلالەتی ئاشکرایە: یەکەم: درزێکە بچوکترە لەوەی زەکەری پیابچێت. دووەم: درزێکە ئەگەر زەکەری پیابچێت ئەشێت عاسی بێت و ئەزموونی خەسانی ڕاستەقینە بقەومێت.

بەڵام تێکستەکە یاخود لەنەستی تێکستەکەدا هەوڵدانێکی بێوێنە هەیە بۆ سڕینەوە و لابردن و قەرەبووکردنەوەی ئەو بارە سایکۆلۆژییە ڕەمزییە، لە تێکستەکەدا سیمائییەتی خەسان شاردراوەتەوە وەک پاڵنەری ناخوئاگا لە کاردایە، بەڵام شکاندنی ترسی خەسان شێوەیەکی ئاشکرای بەخۆیەوە گرتووە، ئەویش لە ئامادەکردنی زەکەری بەتین و تاوی نالیدا بەرجەستە بووە.

بەڵام گەمەی «خەسان / نەخەسان» لەدەقەکەدا بەشێوەیەکی

ناڕاستەوخۆش وێنادەکرێتەوە و لەڕێگای گەمەی «زانین / نەزانین»ـەوە ئاشکرادەکرێت.
بەرلەوەی باس لە تێکەڵاوبوونی هەردوو ئاستی ئەو گەمەیە بکەین پێویستە ئاوڕێک لە فێڵی ڕەخنە و هاریکاری پڕ لە پلانی ڕەخنە بدەینەوە، لەگەڵ تێکستەکەدا بۆ تێپەڕاندنی نهێنی شاردراوەی ئەودیو هەردوو شانۆگەرییە خەیاڵییەکەی دەق و ڕەخنەوە... پرسیاری سەرەکی لێرەدا ئەوەیە بۆ ڕەخنە لە ترسی خەسان بێدەنگدەبێت و نایەوێت ئەو ترسە ئاشکرابکات و دەیگوێزێتەوە بۆ ترسێکی تر کە زۆر جیاوازە لە ترسی یەکەم ئەویش ترسە لە پیری. بۆ لەبری دەروونی نالی دەفتەری «تەمەنی نالی» دەکاتەوە؟ لە ڕاستیدا ڕەخنە لێرەدا بەهەمان پرۆسەی تێکستدا دەڕواتەوە. ترس لە خەسان لە تێکست دەردەکات بۆئەوەی بەتەواوەتی سێکساندنە ڕاستەقینەکە بەڕێگای سروشتی خۆیدا بڕوات. وەکو چۆن لای ڕەخنە خوێندنەوەی زانستییانەی دەقەکە ڕێگای نەستە بۆ ئامادەکردنەوەی دیمەنە جنسی و نمایشییە شەهوەتکارەکە، هەر بەم شێوەیەش لە دەقەکەدا ترس لەخەسان بزوێنەری یەکەمی ئامادەگی نێرایەتی نالییە. بەڵام تاقیکردنەوەکە دیوێکی تری هەیە کە «دیوی مەعریفی ئەزموونی سێکسە». هێنانە مەیدانی زانایی نالی پابەندی وەسواسی خەسانە لە نەستی نالیدا، زانابوون جۆرە پارسەنگێکی دەروونییە، چونکە ئاشکرایە لێرەدا وە لە سیمائییەتی نەستیشدا بەگشتی مەعریفەی زۆر پابەندی خولقاندنی ئەلتەرناتیڤێکە بۆ «خەسان». چونکە مەعریفەی زۆر لە دەقەکەدا گرێدراوە بەسێکسەوە، مەعریفەی زۆر مانای توانای سێکسی و بەدەستهێنانی ئافەرینی سێکسی و سەلماندنی نێرتوانایی باشتر. مەعریفە لەدەقەکەی نالیدا بەرهەمی عەقڵ نییە، بەڵکو بەرهەمی زەکەرە، تەنها ئەویش دەتوانێت بەرزی ئەو مەعریفە سێکسییە بسەلمێنێت، زەکەری نالی وەکو «عەلیمیک» ئامادەدەبێت، عەلیمیک کە زانستی خۆی دەدرکێنێ، هاوکێشەکە لای نالی لە«شەرحی بیکر ـ کونکردنی بیکر»دایە. واتە نالی وادەبینێت زەکەرێک شەرحی بیکر بکات دەتوانێت بیبڕێت و کونیشیبکات.

بەمجۆرە لەدەقەکەدا مەعریفە دەبێتە داپۆشەر و پەردەپۆشکەری «ترس لەخەسان»، گەمەی دەق گۆڕینی «ترس لە خەسانە» بۆ «ترس لە نە زانین»، وەهەڵگێڕانەوەی زانینە بۆ ئەلتەرناتیڤی خەسان و سەلماندنی نەخەسان. لەڕاستیدا گۆڕینی «تاقیکردنەوەی سێکسی» بۆ «تاقیکردنەوەی مەعریفی» جەوهەری ئەم قەسیدەیەی نالییە. لای «سیوەیلی» ڕەخنە بەجۆرێکی دی لەشوێنێکی دییەوە هەوڵدەدات دەرگا بۆ هەڵگرتن و هێورکردنەوەی خەسان و ترس لەخەسان بکاتەوە... ڕەخنە لەڕێگای ترس لەپیرییەوە دەروازەکانی بینین و دۆزینەوەی ترسی ئاشکرای نالی لە کرداری خەسان دادەخات... ئاخر ڕەخنە لە دواجاردا خولیای دامەزراندنەوەی شانۆگەرییەکی سێکسییە، دەیەوێت نالی سەحنەیەکی جنسی گەرم و دیمەنێکی بە زەوقی ئیرۆتیکی پیشانبدات، لەبەرئەوە لەژێر فشاری زەبر و هێزی نەستدا، ترس لەخەسان و ئەگەری خەسان لەکۆی خوێندنەوەکە دەکرێنە دەرێ. پیری نالی لە ئاستی پرۆسەی «سایکۆ - مەعریفی» ڕەخنەدا هەوڵدانێکی گرنگە بۆ داپۆشنی وەسوەسەی خەسان بەکۆنسێتی تاقیکردنەوەی پیاوەتی، ئاشکرایە ڕێبوار لەنێوان دەرەنجامە زانستییەکان و ویستەکانی نەستی خۆیدا کەوتوتە دووڕیانێکەوە، بەڕوونی لەپشت خەونەکەی نالییەوە ترسێک دەبینێت، ترسێک ئەگەرچی قەسیدەکە لە هیچ دێرێک و وشەیەکدا ڕاستەوخۆ ئاشکرای ناکات، بەڵام لەودیو سەرجەمی قەسیدەکەوە دەبینرێت، دەستنیشانکردنی ڕێبوار بۆ ئەم ترسە دەستپێشکەرێکی زانستی گرنگە، بەڵام نەست دەیەوێت نمایشێکی سێکسی ببینێت لەبەرئەوە لە وێنەی «نالی خەسیو»ـەوە دەگوازێتەوە بۆ نالییەک کە «توانای سێکساندنی» خۆی ئەزموندەکات.

دواتریش دوای ئەوەی بەقەرار دەبێت لەسەر وێنەی «نالی پیر» وشەی «دێوانە» دەکات بەدەروازەیەک بۆ جیاکردنەوەی «نالی پیر» لە «زەکەری خۆی». زەکەر لێرەدا سەربەخۆیی خۆی لە نالی وەردەگرێت، بەمجۆرە بەوردی دەتوانین لای ڕێبوار ئەو جیاوازییە ببینین:

لای ڕێبوار نالی پیرە، بەڵام لەسەرەنجدانیدا لە زەکەری نالی دەبینین کە

زەکەرێکی «شەرانگێز و تورەیە. ل. 39»... بەمجۆرە ڕەخنە یەکێک لە و دەروازانەمان دەداتێ کە جارێکی دی بچینەوە بۆ ناو نەست و بگەڕێین. ئاشکرایە ڕەخنە دەیەوێت «زەکەر» ڕزگاربکات، دەیەوێت ڕەقی و توندی بسەلمێنێت، بۆیەجیاکردنەوەی «زەکەر» لە« خودی نالی» لە ئاستی ناخودئاگایی خوێندنەوەکەدا دواهەمین هەوڵدانە بۆ جیاکردنەوەی «زەکەر» لەبەشەکانی تری قەسیدەکە و لەکۆی ئەو وێنە و ڕەمز و ئەگەرانەی دیکە کە دەرەنجامی پێچەوانەمان دەدەنێ... لەو ڕێگایەشەوە ڕێبوار پیرێتی دەدا بە نالی و زەکەری لێ دووردەخاتەوە، لەشی پیر لێرەدا مانای زەکەری پیر ناگەێنێت. واتە بەسەرێک کۆی ترسی خەسان لە ناو ترسی پیرێتیدا دەتوێنێتەوە و بەسەرێکی دیش مەودای نێوان «زەکەر» و پیری گەورەتر دەکات و «زەکەر» لەو پیرییە جیادەکاتەوە و دەیپارێزێت. دوا ئەنجامی ئەم هەوڵەش بونیادنانەوەی دیمەنی سێکسە لەنێوان «فەرجی بەتام و شیرینی» مەستوورە و زەکەری «تورە و شەڕانگێزی» نالی. واتە ستراتیژی ڕێبوار ئەوەیە بەهەر نرخێک بووە «لەزەتی تەماشا» لەکیس نەدات. با بڕوانین و بخوێنینەوە و ببینین ڕەخنە چۆن بە ڕوونی نیازی خۆی ئاشکرادەکات: «مەستوورە و نالی دوو کەسایەتین بەکردەوە«فعل» لەحاڵەتی ڕووداودان... بۆیە ئەرکی ئێمە لەوەدا - دوای بەیتی یەکەم -، خوێندنەوە نییە، بەڵکو «بینین»ـە، بینینی ئەو ڕووداوانەی لەدوای وشەکانەوە ڕوودەدەن. چونکە، چ مەستوورە و چ نالی زیاتر لەوەی بئاخڤن، سەرگەرمی نواندن و پیشاندانن، نەک گێڕانەوە و ڕیوایەتکردن... لەبەر ئەم هۆیەشە پێویستە خوێنەر خەیاڵ و ڕوئیا بخاتەکار بۆ بینینی دیمەن و ڕووداوەکان نەک لێکدانەوەی عەقڵی بۆ گەیشتن بە مانای وشەکان و ڕستەکان... ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەلەم قەسیدەیەدا «لەززەتی بینین و تەماشاکردن» زاڵە بەسەر چێژوەرگرتنی لۆژیکی لەڕەهەندی زمان و مانای زمانەوانی وشەکان... بەڵام سەیر لەوەدایە، کامیرای هەڵگرەوەی فیلمی ڕووداوەکان یاخود دیمەنە شیعرییەکان لە هەردوو حاڵەتەکەیا «چ ئەو کاتەی لەدیدی مەستوورە دەبینێ، و چ ئەو دەمەش لەهی نالییەوە» تەنها شێکی بچوک

دەبینێ کە ئەویش ئەندامی جنسی مەستوورە و نالییە، نەک سەرجەم لە شی مەستوورە...» «ل. 43».

ئەگەر سەرەنج بدەینە ئەو پارچەیە بە ئاسانی ستراتیژی ئیشکردنی رەخنەمان بۆ ئاشکرا دەبێت... رەخنەدان بەنیازی خۆیدا دەنێت «لەدوای بەیتی یەکەمەوە ئەرکی ئێمە خوێندنەوە نییە» بەڵکو تەماشاکردنە. لێرەوە رەخنە شۆڕدەبێتەوە بۆ ناو کار و سەرکێشی تایبەتی خۆی. شۆڕدەبێتەوە ناو نیازمەندی خۆی. رەخنە لەدوای خولیای خۆی دەگەڕێت کە لەبری ئەوەی ببێتە کردەی دواکەوتنی تێکست «رۆلان بارت» واتەنی دەبێت «کردەی خولقاندنی تێکست»... بەم جۆرە رەخنە لای سیوەیلی دەبێتە کردار... کرداری بینین.

رەخنە لە هەڵبژاردنیدا بۆ کردەی خۆی، بینین هەڵدەبژێرێت و سەحنەسازی دەکات و شانۆی ئیرۆتیکی دادەمەزرێنێت. بەڵام هەڵەی گەورە لەوەدایە گەر هەستبکەین «بانگەواز بۆ بینین» بونیادی قەسیدەکە خۆی سەپاندوێتی. لە ڕاستیدا ئەوەش یەکێکی دیکەیە لە فێڵەکانی رەخنەگر بۆ پەڕاندنەوەی سکێچ و خولیاکانی ناو نەستی خۆی. بەپێچەوانەوە قەسیدەکە پەرتکردنی بینینە، دوورخستنەوەی ڕوانینە و خەڵەتاندنێتی لەڕێگای لێکچواندنێکی ئاڵۆزەوە، قەسیدەکە داپۆشین و بەژێرەوەکردنی ئەندامەکانە بە«لێکچوواندن». چ مێنامێری مەستوورە و چ نێرئامێری نالی تەنیا لە ڕێگای «تەشبیهـکردن و موشەبەهاتەوە» دەردەکەون. لەڕووی شیکردنەوەی دەرونیشەوە «لێکچوواندن» کردەی دوورخستنەوەیە نەوەکو ئاشکراکردن، بونیادی شیعرەکەی نالی لەسەر شوبهاندنی ئیرۆتیکی بەندە، نە وەکو لەسەر ئاشکراکردنی ئیرۆتیکی. لێرەدا رەخنە لەبری ئەوەی پرۆسەی «لێکچواندن» بدوێنێ، دەگەڕێتەوە سەر کردە ڕاستەقینەکان. قەسیدەکە قەسیدەی شاردنەوەیە، بەڵام لە ڕوانگەی سیوەیلییەوە بووە بە قەسیدەی نمایش و ڕووتبوونەوە و خۆدەرخستن. رەخنە لەئاستی ڕوانیندا قەسیدەکە ڕووتدەکاتەوە، بەڵام خوێندنەوەی قەسیدەکە فەرامۆشدەکات. ستراتیژی رەخنە لێرەدا لەتەک خواستی هوشیاری نالیدا جیادەبێتەوە، هەوڵی نالی کوشتنی لەزەتی

تەماشای ئەندامە سێکسییەکانە و گۆڕینی ئەو لەزەتەیە بۆ تەماشای لێکچووەکان، جێگرەکان، دوورخستنەوەکان. لای نالی ڕەمزی ئەندامەکان ئامادەیە و تەماشاش تەماشای لێکچوونەکانە، بەڵام کاتێک کە ڕەخنە دەنوسێت لای نالی « لەزەتی تەماشا زاڵە بەسەر چێژ وەرگرتنی لۆژیکی» دا ئەوەمان لا ئاشکرادەبێت کە ڕەخنەگر خواستی ناخودئاگای خۆی بەسەر تێکستەکەدا دەسەپێنێت. ڕەخنەگر تێکستەکە دەکات بە تێکستی خۆی و لەدەسەڵاتی «نالی و نەستی نالی» کەمدەکاتەوە بۆئەوەی یارییەکە بگۆڕێتەوە سەر یارییەکی سینەمایی، بەمجۆرە ڕەخنەگر دەبێتە فیلم لێدەرەوەی خەیاڵێک کە خەیاڵی خۆیەتی لەسەر تێکستەکە، نەوەک جەریانی ناوەکی دەقی شیعریی خۆی بێت.

کامیرای ئەم فلیمە ڕەخنە خۆی داناوە و هەر چاوی ڕەخنە خۆیەتی، وەستانی ڕەخنە خۆیەتی لەناو نەستی خۆی و یاساکانی خۆیدا. لێرەدا ستراتیژی «نالی» لەستراتیژی ڕەخنە جیادەبێتەوە... ڕاستە هەردووکیان بۆ جۆرە تێربوونێک دەگەڕێن، بەڵام لێرەوە ڕێگاکانی تێربوون لەیەکدی دەترازێت. ستراتیژی نالی، هەوڵدانە بۆ پەرتکردنی ڕوانین لەسەر ئەندامەکان و دوورخستنەوەی چاوە لەسەر هەردوو ئەندامەکە و ستراتیژی ڕەخنە دەبێتە چەقبەستن لەسەر هەردوو ئەو ئەندامە و جووڵەیان، بەڵام کاریگەری نەست لەو دانپیانەنانەدا دەردەکەوێت کە ڕەخنە دەیەوێت لە پشتییەوە نیازی خۆی ونبکات، کەنیازی تەماشایە نەوەکو نیازی خوێندنەوە، بەڵام پرۆسەی ڕەخنە ئەو واقعەش باش دەزانێت کە زمانی نالی زمانێکی ئیرۆتیکی نییە، زمانێکە خۆی بەوردی سەرچاوەکانی دەستنیشانکردووە. نالی پەنادەباتە بەر هەموو ئەزموونی خۆی بۆ شوبهاندنی «مێدان»ـی مەستوورە بەشتی دی، هەموو زەخیرەی زانست و مەعریفی خۆی کۆدەکاتەوە، بۆئەوەی نە وتراوێک هەیەکە «فەرجی مەستوورە»یە بە نەوتراوی بمێنێتەوە.

هەوڵی نالی لێرەدا هەوڵێکی داستان ئامێزە بۆ ونکردنی ئەو ئەندامە و ناونەهێنان و تواندنەوەشی لەشتەکانی دیدا، کە گەمەیەکە گەلێک هێزی گەورە بەشدارن لەخولّقاندنیدا. لە«مەستوورە»ـی قسەکەرەوە کە لە

هەمان کاتدا نوێنەری چەمکی مێینەی کاراکتەری نالییشە، تا «منی» ڕاپەڕیوی نالی لەبەردەم هورووژمی وێنە یەک بەدوای یەکەکانی نەستدا.
نالی لێرەدا ڕووبەڕووی موفارەقەیەکی دیکەش دەبێتەوە لەکاتێکدا دەیەوێت مێدانی ئافرەت لە ڕوانین دووربخاتەوە، کەچی لەبری دوورخستنەوەی هەموو دونیای لێدەبێتە وێنەی جیاجیای ئەو ئەندامە و دیاردە سروشتییەکان لە بەرچاوی لە قاڵبی فەرجی مەستوورەدا لەقاڵب دەدرێنەوە، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە نالی لەسەر ئاستی هۆش و لەسەر ئاستی وتن ئەو نهێنییە نادرکێنێت، ئەو وشەیە نایەت بەزاریدا گوناهباری بکات، مێئامێری مەستوورە وەک ڕەمزێکی خیفی ناونەنراو و نادیار دەمێنێتەوە بەمجۆرە ئەم قەسیدەیەی «نالی» «موتەکەیەکە لە مۆتەکەکانی نەست»، نەوەکو خەوێک بێت لە خەوە سادەکان، هورووژم و پەلامارێکی ئایرۆسیانەیە کە هەستی نالی بەهەموو هێزی خۆیەوە بەرامبەری ڕادەوەستێت و بەربەستی لەبەردەمدا دادەنێت و جار لەدوای جار هەڵیدەگێڕێتەوە بۆ دیمەنێکی تر. «نەست» حەقیقەتی ئەندامی مێینەی مەستوورە دەنێرێت وێنەی ڕاستەقینەی ئەندامەکە ئاراستەدەکات و هەست وێنەکە ئاوەژودەکاتەوە و خۆی لێ دەربازدەکات. خۆتێرکردن لە تێکستەکەدا ڕەنگدانەوەی کارکردنە لەگەڵ ڕەمزدا نەوەک لەگەڵ ئەندامی مێینەدا. هەست لەم قەسیدەیەدا بۆ چرکەیەکیش لەبەرگری خۆی دژ بە خواستی زەق و زۆپی نەست ناوەستێت، تەنها چاریش کە جێیدەهێڵێت، ڕێگای «خۆتێرکردنی ڕەمزییە» .
کارێکی دیکە کە نەست دەیکات و کەم تا زۆر هەستیش تیا بەشدارە و لە هەندێ ڕووەوە سوودی لێ دەبینێت و دواجار بە هاریکاری و لە دەرەنجامی ململانێی هەردووکیانەوە وێنەکان دێنەبەرهەم. کاری «بەمێکردنی ـ انثنە ـ جیهانە»» کارێک لەبەرئەوەی لە سنووری ڕوانین و پلانی ڕەخنەدا نییە، دەخرێتە لاوە. لای نالی سەرجەمی گەردون دەبێتە فەرجێکی گەورە، لێرەدا ئەندامی مێینە هەموو جیهانە، هەموو گەردونە، کشانێکی گەورەیە هەموو شتەکان لێکچووی ئەون و ئەو لێکچووی هەموو شتەکانە. بەڕای من بە «مێینە کردنی گەردون» و یاخود بە « گەردونی

کردنی مێدان» بەشێکی گرنگە لە قەسیدەکە، بەڵام ئەوەی کە لێرەدا پێویستەئاماژەی بۆ بکەم، ئەوەی کە بایەخدارە و پێویستە تێکەڵاوی نەکەین ئەوەیە کە «بەمێکردنی جیهان» پێچەوانەی «ترس لە خەسان» نییە. گەورەبوونی فەرج مانای کرانەوەی فەرج نییە، زۆربوونی هاوێنەکان و هاوشێوەکانی فەرج هاوشانی ئاوەڵابوونی دەرگاکانی نییە، لەکاتێکدا هەموو وێنەکان، وێنەی داخراون کە بەئەستەم «قڵیشیان» تێدایە، بە مێدانبوونی گەردون لەسەر ئاستی نەست و لەسەر ئاستی تەکنیکی شیعریش ـ فەرمانی دیکەی هەیە.

ئاشکرایە «نالی» لەناو خودی مێیەتیدا ناگەڕێت، بەڵکو لەجیهانێکی گەورەتردا دەجوڵێتەوە. لای نالی «ئەندامی مێ» ئامادەگییەکی یۆنڤێرسال وەردەگرێت، لەبەرامبەر ئەوەیشدا «نێرایەتی» سەردەردەهێنێ، ململانێکە لە دیوێکدا بەئاشکرا ململانێی نێوان «ئەنیما» و «ئەنیمۆس»ـە. بەڵام لە دەقەکەدا «یۆنڤێرسالی بوونی فەرج» یاریدەی هەست دەدات «فەرج» خۆی نەیەتە زمان و نەیەتە سەر شانۆ و ناوی نەهێنرێت... بە گەردونی بوونی فەرج وادەکات ڕووبەری ڕەمزاندنی فەرج گەورەبێت و لەڕێگای ئەو دەرگایەوە بەردەوام «من و بەرزەمن» چالاکانە«فەرج» بگێڕنەوە بۆ هاوشێوەکانی و بواری «ڕەمزاندن» ببێتە بوارێکی کراوە. ئەمە جگە لەوەی کە بەئاشکرا گرێی سەرەکی قەسیدەکە لەبەرەنجامی ئەو ململانێیەوە پەیدابووە.

ئەوەی لەسەرەتاوە قەسیدەکەی خەملاندووە، ئەوەیە فەرج لە قەسیدەکەدا مەتەڵێکی شاردراوەیە «مەتەڵیش لە دەروونناسیدا مانای دانپیانەنانی هەست»، فەرجێکە ڕاستەوخۆ خۆی دەرناخات و وەکو نهێنییەک خۆی دەخاتەڕوو.

ئەم پلانە لە قەسیدەکەدا وەکو پلانی مەستوورە ڕوایەتدەکرێت، ئەمەش وا دەکات مەستوورە بوونێکی واقعیتر وەربگرێت، چونکە ئاشکرایە «مەستوورە» وەکو ئافرەتێک پلانی هەرگیز لەسەر ئاشکراکردنی ڕاستەوخۆی فەرجی خۆی بونیاد نانێت... لێرەوە مەستوورە بە ئاشکرا بەرجەستەکەرەوەی بنەماکانی لەزەتی دیسپلین کراوە، مەستوورە لەزەتە

بەڵام چەمکی واقع لێی نزیککەوتۆتەوە و بڕێک لەڕەفتارە مێژوویی و فەرهەنگییەکەی خۆی سەپاندووە بەسەریدا، بەوەش مەستوورە بوونێکی واقعی وەرگرتووە... واتە مێیەکە کە فەرجی خۆی بەبێ هیچ مەرجێک نابەخشێت، بەڵکو لەسەرەتادا دەیکاتە مەتەڵ چونکە لەو ساتەوە کە فەرج دەبێتە پارچەیەکی ئاشکرا، ئیدی ئەکتیڤییەتی خۆی وندەکات و نێر وەکو بکەرێک دێتە مەیدان و هەموو ئەکتیڤییەتی ئەو و ئامادەگی و سیحری دەدزێت، ئەکتیڤییەتی مێ ئەکتیڤییەتێکی ڕەمزییە، بەڵام ڕەمزییەتێک جار دوای جار زیاتر خۆی ئاشکرادەکات، جەوهەریی مێیەتی خۆی نادرکێنێت بەڵکو هەمیشە تا سەر لێواری درکاندن نێر لەگەڵ خۆی دەبات و لەویادا دەوەستێت، تا ئەوەی کە دەمێنێتەوە نێر خۆی بیدرکێنێت. مێ خۆی ئاشکرا ناکات، بەڵکو تا سەر لێواری ئاشکراکردن دێت، سەرەتا وەکو مەتەڵێکی قورس دەستپێدەکات، دواتر جار لە دوای جار مەتەڵەکە سادەتر و ڕوونتر و ئاسانتر دەکاتەوە، بەڵام دوا حەرف بۆ نێرەکان جێدەهێڵێت، بەڵام کە وێنەی ڕاستەقینەی پشت ڕەمزەکانی مێدان ئاشکرابوو کە«فەرجی تەلیسماوی» ڕێگای بۆ ئاشکرابوونی تەلیسمی خۆی خۆشکرد و ئەو تەلیسمە شکا ئیدی لەپشتییەوە نێری چاوەڕوان دەردەکەوێت و لە حەشارگا دێتەدەرێ.

فەرج لەم قەسیدەیەدا دیمەنی خۆی وەکو دیمەنێکی «موغلەق» نیشاندەدات. ئەم دیمەنە ئەگەر لەڕوانگەی مەستوورەوە سەیریبکەین دەبینین کە «هەست لە دژی نەست» مەستوورەی لە فەرەجێکی ڕووتەوە گۆڕیوە بۆ ئافرەتێک کە تەنیا بە دەستوورێکی تایبەت «فەرەجی خۆی نیشاندەدات». نایبەخشێت بەڵکو دەبێت یەکێک بێت و پەردەی لەسەر لابات و کونیبکات. واتە میکانیزمی خەونەکە پێویستی بەوەیە کە مەستوورە سەرەتا فەرجی خۆی بڕەمزێنێ. بەڵام مەستوورە جار لە دوای جار، وێنە دوای وێنە، لێکچواندن بەدوای لێکچوواندندا زیاتر چەمکە ڕەمزییەکانی تەلیسمەکەی دەکاتە قابیلی شکان و تێگەیشتن. ئەگەر بەشی یەکەمی خەونەکە لەسەر ڕەمزاندن بەندبێت، ئەوا بەشی دووەم لە سەر زانین بەندە: «دێوانە کە زانی دەبێ ...» لەوساتەی کە ڕەمزەکانی

فەرج ئاشکرادەبن، کە تەلیسمەکە دەشکێت و مەتەڵەکە هەڵدەهێنرێت ئیدی رۆڵی ڕەگەزی من وەک قسەکەرێک کۆتاییدێت.
زاڵبوونی دەنگی مەستوورە لە بەشی یەکەمدا بەبۆچوونی من ناگەرێتەوە بۆ «باخی بوونی نالی و شکاندنی ترادیسۆن» (ل. 36). هێندەی دەگەرێتەوە بۆ خودی میکانیزمی خەونەکە و رۆڵی نەست و فشارەکانی هەست لەسەری. مەستوورە مەتەڵێک دادەهێنێت بەڵام تا بەشی دووهەم وەرگر و ئەو کەسەی کە مەتەڵەکەی ئاراستە دەکرێت توانای هەڵهێنانی نییە. لەبەرئەوە تا ئەو ساتەی کە «دێوانە دەزانێت» مەستوورە تاقانە بکەرە. بەڵام کە نەزانراوەکە زانرا، کە نهێنییەکە درکێنرا، کە خوفییە ئاشکرابوو، کە موغلەق کرایەوە، ئیدی بکەرێتی لەمەستوورە دەسێنرێتەوە. بەمجۆرە خودی قەسیدەکە لەسەر لۆژیکی دیالۆگ و ئاخاوتن بونیادنراوە.
بەرای من لەم قەسیدەیەدا هیچ کردارێک لەگۆرێ نییە، وە تەماشا تەماشایەکی وەهمییە یاخود دوو تەماشای وەهمیین، تەماشایەکی وەهمی یەکەم لای خودی نالییە کاتێک راوییە و لەرێگای گێرانەوەی ئاخافتنەکانی مەستوورەوە خەونێکی خۆی تەماشادەکاتەوە، یاخود لە راستیدا گوێی لێدەگرێتەوە و سەرلەنوێ رەمزەکانی لە شێوەیەکی ناراستەوخۆدا شیدەکاتەوە. تەماشای دووەمیان تەماشای رەخنەیە کە دەقەکە دەگۆرێت بۆ دیمەن و دەیەوێت بە خەیاڵ سێکساندنێک ئامادەبکات و دەرەنجامی بهێنێت.
لەراستیدا ئەمە قەسیدەی ئاخاوتنە هیچ جۆرە کردارێکی سێکسی تیا روونادات. مەستوورە لە بەشی یەکەمدا دەڵێت «هاتووم، وتی، عوقدەم هەیە». نالیش لەبەشی دووەمەدا «هەستاو و وتی: ئەشکی رەوانم بە فیدا بێ». قەسیدەکە لەنێوان ئەم «وتی» و «وتی»یەدا دەسورێتەوە و هیچ کردارێک لەگۆرێ نییە. وتنی یەکەم رەمزاندنی مەستوورەیە بۆ خۆی. وتنی دووەمیش دیاریکردنی سیفەت و ئەرکە پێویستەکانی زەکەرە بۆ خۆی. زەکەری نالی «دەزانێت» و «دەڵێت» و «دەبێت»

*دیوانە کە زانی کە دەبێ عوقدەگوشا بێ*
*هەستاو و گوتی: ئەشکی ڕەوانم بەفیدا بێ*

هیچ یەکێک لە «زانی» و «دەبێ» و «گوتی» بەمانای «کردی» نییە و نایەت. بۆیە جارێکی دی دەڵێم زەکەری نالی زەکەرێکی زانایە بەڵام زەکەرێکی کارا نییە. زەکەرێکە پێویستییەکانی سەرشانی خۆی دەزانێت دەبێت چی بکات، بەڵام کەی لە زانی و دەبێ وە دەگوازرێتەوە بۆ «دەکات» و «کردی»؟. ئەوە لە دەرەوەی سنووری زمانی قەسیدەکەوەیە و تەنها خوێندنەوەی خەیاڵامێز دەیخولقێنێت. «دەبێ» کانی نالی لەژێریاندا ئەو سیفەتانە پۆلینکراوە کە دەبێت زەکەر لەخۆیدا بەرجەستەییکات تا ببێتە «عوقدەگوشا» «دەبێ هەیئەتی چابێ... مەتنی مەتینی حوکەما بێ... وەکو بەستی ئودەبا بێ... وەکو دەستی دۆعا بێ... عەلەمی بابی ڕەزا بێ ... هتد».

لێرەدا مەستوورە چۆن ئەو هەموو چەمک و وێنە یۆنفرسالیانەی فەرجی خۆی دەزانێت، نالیش هەموو ئەو کردار و سیفەتانە دەزانێت کە دەیکات بە «عوقدەگوشا». ئاشکراشدەبێت کە«فەرج» تا ئەو ساتە یۆنیفرسال و گەردوونییە کە نەزانراوە، کە ڕەمزە، کە تەلیسمە و مەتەڵە، بەڵام کە زانرا و دۆزرایەوە ئەوسا سروشتە زەمینی و سێکسییەکەی خۆی وەردەگرێتەوە و دەبێتەوە بە«میحرابی رەجا». بەڵام زەکەر ناتوانێت لە خۆشوبهاندنەکانیدا وەک مێدان دوور بڕوات و وەکو فەرجی مەستوورە ئازاد تەشبیهات بهۆنێتەوە. چونکە لەڕاستیدا زەکەر مەحکومە بەفرمانێکی تایبەتی و دەبێت تەشبیهاتی لە خزمەت وەزیفەکەیدا بێت، بەڵام کاتێک فەرج خۆی دەشوبهێنێ ئەرکێکی تایبەتی نایبەستێتەوە بەڵکو ئاسۆیەکی فراوانی خۆشوبهاندنی لەگەڵدایە کەوا دەکات فەرج ڕوخسارێکی گەردونی وەربگرێت.

فەرج خۆی دەکاتە هێماو ڕەمز، زەکەریش خۆی ئامادەدەکات. لەبەرئەوە فەرج لێرەدا فەرجێکی خەیاڵییە، وەک چەند نیگارێکی زیهنیی پەستێنراوە لەژێر کارتێکەری و گۆڕانی هەستدا لە شێوە و وێنەی تردا

دەگەڕێتەوە. لەکاتێکدا زەکەر لەژێر زەبری سیفەت و کردارەکانیدا ناچارە واقعیتر بێت و کەمتر خۆی بداتە دەست خەیاڵ و ڕەمزاندن. ئەمە جگە لە وەی لەقەسیدەکەدا فەرج «چییە؟»یەکی لەپشتە، واتە پرسیارێک ئامادەیدەکات، کە بواری زیاد لەوەڵامێک و شوبهاندنێکی بۆ سازدەکات. بەڵام زەکەر «دەبێت»ێکی لە پشتە کە بواری خۆوێناکردنی زۆری بۆ ناهێڵێتەوە. زەکەر مەحکومە بەوەی کاراکتەری بکەری هەبێت، فەرجیش کاتێک کاراکتەری بکەر دەرکەوت دەبێت بێدەنگ بێت، لەنێوان ئەم «دەنگ/ بێدەنگی»یەدا، لۆژیکی گفتوگۆ و پیاهەڵدان هەیە، نەوەکو لۆژیکی «تێکخستن/ دەرهێنان» کە پرۆسەی کاری سێکسییە.

بێگومان ئەو کێشانەی بەخێرایی لەم خوێندنەوە و بەدوداهاتنەدا خستمنە ڕوو لەزۆربەی خاڵەکاندا پێویستیمان بەڕوونکردنەوە و قسە لەسەرکردنی زیاتر هەیە، بەڵام بەئومێدی ئەوەی کە قسەکردن لەسەر ئەم قەسیدەیە، بەردەوام بێت، ئەو مەسەلەیە دەنێمە ئەستۆی هاوڕێیانی دیکە، چونکە پێموایە ئەم قەسیدەیە بایەخێکی فەرهەنگی و سایکۆلۆژی گرنگی هەیە ... ڕێبواریش بەم لێکۆڵینەوەیەی وەکو لێکۆڵینەوەکانی دیکەی زەویەکی نەدۆزراوەی بۆ دۆزینەوە.

هەردوو ئەم کتێبەی ڕێبوار دەستپێکردنێکی گرنگی بۆ خوێندنەوەی نادیار و خوێندنەوەی جیا لە کە لەپووری ئێمەدا کە دڵنیام پاشەڕۆژ بایەخیان زیاتر ئاشکرا دەبێت.

ڕێبوار بەم سەفەرەی خۆی جارێکی دی بابەت و جەنگەڵەکانی تێکست و ڕۆحی نوسین و ڕۆحی ڕەخنەی لا زیندووکردینەوە، وای لێکردین بەلایەکی دیکەدا بڕوانین. بێگومان ڕەخنەگری ڕاستەقینەش کەسێکە وادەکات بە لایەکی دیکەدا بڕوانین.

*تێبینی/ بۆ تێگەیشتنی باشتر لەم وتارە خوێندنەوەی قەسیدەکەی نالی و وتارەکانی کاک ڕێبوار کار ئاسانییەکی زۆر پێشکەش بە خوێنەر دەکات..*

# فەهرەست

دروشمی تازەگەریی ئەوەیە، نە ماناکانی کۆن، نە ماناکانی ئێستا، نەماناکانی داهاتوو، بەڵکو گەڕانی هەتاهەتایی بۆ مانای دیکە، زمانی دیکە، پەیوەندی دیکە. بەرەو وێنەی نوێ، عەقڵانییەتی نوێ، خەیاڵی نوێ، ئەفسانەی نوێ... نوێ بەمانای نوقمبوونی نوسەر لە ئەزموونی داهێنەرانەی گەڕان و پشکنینی خۆیدا وە گواستنەوەی ئەو هەست و نیگا تازانە کە ئەو چرکەیە دەیبەخشێت، بەبێ گۆڕینی ئەو ئەزموونە بۆ ئەزموونێکی موتڵەق... لە ستراتیژی تازەگەرییدا ڕاستی موتڵەق بوونی نییە. بۆیە هەر ئەزموونێک کە ڕاستییەک، لەزەتێک، مانایەک دەبەخشێت، دواجار دەبێت دەستبەرداری ببین بۆ ڕاستی و لەزەت و مانای دی.

تازەگەریی یاخود بوونی نابێت یاخود کە بوو ئەوا کۆی ئەو گوناهانە دەبێت کە دەدرێنە پاڵی. تازەگەرییەک نییە بێ گوناهی گەورە و گەورەییەکیش نییە بۆ تازەگەریی لە دەرەوەی گەورەیی گوناهەکانی. تازەگەریی تەنیا ئەو ساتە لە قەفەز دەچێتە دەرەوە کە هەموو گوناهەکانی خۆی بسەلمێنێت. تازەگەریی خاوێن و بێگوناه بوونی نییە، بەڵکو تازەگەریی دەبێت هەمیشە جۆرێک بێت لە تاوان دەرهەق بەو مانا سست و ڕزیوانەی عەقڵییەتی سەلەفی ڕۆژانە بەرهەمیاندەهێنێت.

لە وتاری «دیار / نادیار»ـەوە.